گـــەرچی دوژمـن وا ئەزانێ مـن بەدیلـی لاڵ ئەبم
باش بزانـێ کـونجی زیندانم (قـوتابـی خـانە)یە!!
بیــــری ئازادیم لەزیـندانا فـــراوانـتـــر ئەبێ
قوڕ بەسـەر ئەو دوژمنە، هیوای بە بەندیـخانەیە!
قانع

ناوی کتێب: **3660**

چاپی یەکەم ـ کوردستان ـ ٢٠٠١

تووسەر: **بەرهەم عەلی**

فەرزی بەرگ و نەخشەسازی: **شکار نەقشبەندی**

پیت چنین: **ئەردەلان سلێمان ئاژگەیی**

مۆتیڤی بەرگ: **هەمۆ**

سەرپەرشتیاری چاپ: **کوردۆ ئەنوەر**

ژمارە سپاردن: **٣٢٤**

تیراژ: **١٠٠٠ دانە**

چاپ: **چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە**

لەناخی دڵەوە سوپاس و ڕێزو خۆشەویستیمان
**بۆ بەڕێز (س. شەمزینانی)**
کە ئەرکی چاپکردنی ئەم کتێبەی گرتە ئەستۆ

# ناوەڕۆک

## پێشەکی

لەوانەیە زۆر بە ئاسانی رۆماننووسێکی بە سەلیقە، بتوانێ پێشەکیەک بۆ ئەو رووداوو خەیاڵ و فانتازیایانە بنووسێت کە دەستکردو بەرهەمی ئەندێشەو خەیاڵی ئەدەبی خۆین، بەڵام پێم وا نییە نووسینی پێشەکی بۆ رووداوو یادەوەری (١٠)ساڵ تەمەنی گەنجێک لە زیندانەکانی عێراقدا، بەسانایی بنووسرێ و هەقی خۆیشی بدرێتێ، ئاخر مرۆڤ چۆن لەنووسینی چەند دێرێکیشدا دەستەوەستان نەبێ کەباس لە سەربردەی مێرد منداڵێکی کوردستانی دەکەن کەتەمەنی گەنجێتی لەزیندانەکانی رژێمێکدا بەسەر بردووە، سی و سێ ساڵە وڵاتێکی کردۆتە زیندانێکی گەورە. بەخوێندنەوەی بەسەرهاتەکانی نێو زیندانی شێرزادی خۆڕاگر لەبەندیخانەکانی ئەم شارو ئەو شاری عێراقدا، رەنگە وێنەیەکی بچووککراوەمان لەتابلۆی تراژیدیایەکی گەورەی کوردستانیان و عێراقیەکانیش دەستکەوێ، کە پتر لە سی ساڵە بەردەوامە، ئەوەی دڵخۆشکەرە پاش ئەم هەموو ساڵە ئەژنۆی جەلادەکان وا دەنوشتێنەوەو نوچ دەدەن، قوربانییەکانیشیان وەکو شێرە هەر بەپێوە وەستاون و باڵا دەکەن، یان لەزیندانە بچووکەکان وگەورەکەشدا لەدرزی پەنجەرە تاریکەکانەوە خۆری ئازادی دەبینن،هەر بۆیە لێدەگەرێم شێرە خۆی پێتان بڵێ چۆن گیراوەو تەمەنی گەنجێتی چۆن بەسەر برد، جەلادەکان کێن وچیان بەم گەل و وڵاتە کردووە.. ئاخر کێ هەیە لەگەنجێکی ئاسک، بەڵام خۆڕاگر، بەئەدەب، بەڵام زیتەڵەو چستو چالاک، دەست و پێ بەستراوە، بەڵام جەربەزەو مەردی وەکو شێرزاد ئەحواڵی نێو زیندانەکانی بەعسستان چاکترو واقیعیترو جوانتر بگێڕێتەوە.

ئەوەی من دەمەوێ باسی بکەم کۆکردنەوەو چاپکردنی ئەم بەسەرهاتە تاڵ و سوێرانە بۆ؟ یادەوەری شێرە لەبەندیخانەکاندا بەشێکی زیندووی مێژوو و سەروەری رۆڵەکانی ئەم وڵاتەیە، دەبێ بەزیندوویی بمێننەوە تانەوەکانی

ئێستا و داهاتووی کوردستان قەدری ئەم ئازادییەی ئەمڕۆ بزانن و بۆ ڕزگاری هەمیشەیی کوردستانیش تێ بکۆشن.

ڕووداوەکان، شێرزادی هاوڕێ وهەڤاڵ و کوڕی گەڕەکەکەم چۆنی گێڕاونەتەوە، ئاوها بەبێ هیچ دەستکارییەک نووسراونەتەوە، ئەوانەی لەبەندیخانەکانی ڕژێمی عێراقدا هاوڕێ و هاومالی شێرە بوون، بەدەستپاکییەوە ناویان هاتووە، مەگەر تاریکی وچەرمە سەرییەکانی زیندان لەبیر شێرەیان بردبێتەوە یان ئەوانەی کە تا ئێستاش لەبەردەستی جەلادەکاندان.

بەهەر حاڵ ئەم هەوڵە بچووکەی من بۆ ڕێزگرتنی مێژووی کوردستان وبەرز ڕاگرتنی ناوی تێکۆشەران و خەباتکەرانی ئەم وڵاتەیە، بۆ ئەوەی ڕۆژانی ژێر دەستەییمان لەبیر نەچێتەوە، نەک بۆ دروستکردنی ڕق وکینەو گیانی تۆڵە سەندنەوە.

ئاخر کاتێ کۆسۆڤۆییەکان بەهاوکاری کۆمەڵی نێودەوڵەتی ڕزگاریان بوو ،کوفی ئەنانی سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان زۆر جوانی بۆ هات کە پێی گوتن: کەس نەیگوتووە ئەو زوڵم و زۆرەی لێتان کراوە بیرتان بچێتەوە، کەسیش ناتوانێ داوایەکی واتان لێ بکات،بەڵام ئەگەر بیرتان هەر لای تۆڵە سەندنەوە بوو ،ئەوە دەبێ هەتا ماون چاوتان لەشەڕو کوشتار بێ، ئەوەی هەر خەریکی ئاوڕدانەوەیە بۆ دواوە سبەینێی لەدەست دەچێت، لەخۆڕا نییە خوای گەورە چاوی مرۆڤی لە پێشەوە دروست کردووە.

مەزنی ماندێلا لەوەدابوو کە پاش (٢٧) ساڵ زیندانی زوڵمی نەکرد، نەیهێشت قوربانیەکانی ئەپارتای لاسایی جەلادەکانیان بکەنەوە ،ئێمەی کوردیش هەردەبێ وابکەین، بیر لەتۆڵە نەکەینەوە، بەڵام مێژوو و خەبات و قوربانیاغان لەبیرنەچێ، پێویستە چاومان لەسبەینێ بێ، سبەینێی ڕزگاری و پێکەوە ژیان وبونیاتنانەوەی کوردستان، بێ ئەوەی بۆ چرکەیەکیش خوێنی شەهیدەکاغان، خەبات و ڕەنجی (شێرە)کانی ئەم وڵاتە، قوربانیە بێ سەرو شوێنەکاغان لەیاد بچێ.

**بەرهەم عەلی**
**بەهاری ٢٠٠١**

# لەشەمزینانەوە بۆ سەرچنار

ناوم (شێرزاد فەرمان یاقۆ)یە وەک باوکم چەند جارێک بۆی گێراومەتەوە، باو، باپیرانم سەردەمانێکی زۆر پێش ئێستا، لەمەسیحیەکانی ناوچەی شەمزینانی کوردستانی تورکیابوون، پاشان بەتێپەڕینی ساڵ و زەمەن ماڵی باپیرم بەهۆی چەند بارودۆخێکی ئەو کاتەوە هاتوونە شاری ئاکرێ لەکوردستانی عێراق، دوای ئەوەش گواستویانەتەوە شاری سلێمانی ئەو دەمە تەنیا (٨٠-٩٠) ماڵی مەسیحی لەسلێمانی هەبوون، لەساڵی ١٩٥٢ باوکم پەیوەندی کردووە بەڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە، لەو ساڵانەدا لەهێڵی ڕێکخستنە نهێنیەکاندا کاری کردووە، ساڵی ١٩٥٧-١٩٥٩ خزمەتی سەربازی بەجێ هێناوە، بەڵام پەیوەندی بەڕێکخستنەکانی پارتیەوە بەردەوام بووە، ساڵی ١٩٦٤ لەهەولێر ژنی هێناوە، هاوسەرەکەشی کە دەکاتە دایکم ناوی (مریەم ڕۆکسی مامۆ)یە. باوک و دایکم لە دوو هۆزی جیای مەسیحی بوون، باوکم لە عەشیرەتی (ناوچیایی) سەربەماڵی قەشەیەو ئاشووریە، بەڵام دایکم کچی (ڕۆکسی مامۆ)یەو کلدانیە. لەساڵانی چلەکانەوە دانیشتووی شاری سلێمانی بوون بەرلەوەش ماوەیەک باوکی دایکم لەناوچەی بلێ بەکاری بازرگانییەوە خەریک بووەو خاڵیشم بەرگدروو بووە هەر لەو ناوچەیە، پێم وا بێ هەردووکیشیان لە کەسایەتیە ناسراوەکانی ئەو ناوچەیەن. لەساڵی ١٩٦١ەوە باوکم و دایکم چوونەتەوە سلێمانی لەو ساڵانەدا باوکم لەگەڵ نامیق قەزازی خوالێخۆشبوو کاری پارتایەتی کردووە ئەو کات (نەجیب ڕۆکسی)ی خاڵم پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول بووە، بۆیە دایکم و باوکم لەبەر بارودۆخی سیاسی ئەو سەردەمە

سـالّی ١٩٦٦ سلێـمـانیـان بەجێ هێـشـتـوەو هـاتوونەتەوە هەولێـرو مـاوەی سـالێک لەهەولێـر مـاونەتەوە، بەلام پاش ئەوەی (قـەیس)ی برا گـەورەم لەدایک بووە، مـالّمـان گـەڕاوەتەوە بۆ سلێـمـانی و لەگـەڕەکی چوارباخ نیشتەجێ بووین. پێشتـر باوکم لە دوکان و دەربەندیخان کـاری کردبوو، بەلام ئەو سالّە لەکارگەی چیمەنتۆی سەرچنار لەسلێمانی دامەزرا. لەبەرە بەیانی ڕۆژی ١/٧/١٩٦٨ لەگەڕەکی چوارباخ لەسلێمانی لەدایک بووم و چاوم بەژیانێک هەلّهێنا، کە دواتر پتر لە (١٠)سالّی ئەو تەمەنەم لەنێو ژووره تاریک و نوتەکـەکـانی بەندیخـانەکـاندا بەسـەر برد، لەو سـالانەدا نزیکەی (١٥٠)مالّی مەسیحی لەنێو شاری سلێمانیدا هەبوون، ئیدی لەو ڕۆژەوە هەر لەسلێـمـانی مـاینەوە و چەند جارێک مـالّمـان لەگـەڕەکێکەوە بۆ گـەڕەکێکی دیکەی ئەو شـارە گـواستەوە تاوەکـو سـالّی ١٩٧١ بەیەکجاری لەگـەڕەکی سـەرچنار گـیـرسـاینەوە. لەمـالّەوە یانزە سـەرخێـزانین، دایکم و باوکم لەگەلّ چوار خوشک و پێنج برا ناوو تەمەنی خوشک و براکانیشم بەم شـێـوەیەیە(قـەیس ١٩٦٧،نەهلە ١٩٦٩، دلّدار ١٩٧١، دلّشـاد ١٩٧٣،نەوال ١٩٧٥، نەدا ١٩٨١،لیندا ١٩٨٢، نزار ١٩٩١).

## ڕۆژانی مندالّیم

وەک دایک و باوکم بۆیان دەگـێـڕامـەوە هەر لەتەمـەنی یەکـسـالّـیـەوە مندالّێکی بزێوو وریاو نەسرەوتبووم، دەستم بۆ هەمـوو شـتـێک دەبرد زوو فێری کـاگـۆلکێ و دارەدارەو قسەکردن بووم، زیانێکی زۆرم لەکەلوپەلی نێو مـالّ دەداو حەزم دەکـرد لەهەمـوو شـتـێک بگـەم و لەنهێنییەکـانی حالّی بم، خـۆم لەگـفـتوگـۆ و مـەجلیـسی گـەورەکـان هەلّ دەقـورتاند، پرسـیـارم لەبارەی هەمـوو شـتـێکەوە دەکـرد، هەر ڕێبوارێک بەگەڕەکەکەمـاندا بڕۆیشـتـایە دەم پرسی: ئەوە کێیە؟ کوڕی کێیە؟ ئیشی چیە؟ بۆ چی بەم گوزەرەدا دەڕوات؟ ئیـدی پرسیـارەکـانم زۆر بوون و هەندێ جار دەبوومـە مـایەی وەڕس کـردنی دەوروبەرو لێـتـان نـاشـارمـەوە لەسـەر ئەوفـزولیـەتەی مندالّیم زۆرجـار جەزرەبەی باشیـان پێ دەگەیاندم، دایکم ئافـرەتێکی هەتا بلّـێی دلّسـاف و مـیـهـرەبان و هێـمن و لەسـەرخـۆ و پڕسـۆزە، یەکـێکە لەو ئافـرەتانەی کـە بەبچـــووکـــترین شت گــریانی دێ و بۆ مــــاوەیەکی زۆر چاوە پڕ

خۆشەویستیەکانی وشک نابنەوە، خەم لەهەموو شتێک دەخوات، بەڵام لەهەمووی زیاتر خەمی لەمن و لەرەفتارو ژیانی من خواردووە، هەرچی باوکمە لەگەڵ ئەوەی پیاوێکی زۆر بەرەحم و بەسۆزە کەچی زۆر زوو هەڵدەچێت و پیاوێکی تورەو هەڵەشەیە وەلێ تورەبوونەکەی لەچەند چرکەیەک زیتر ناخایانێ هەرزوو هێور دەبێتەوەو بەئاسانی خەندە لەدەرگای رووخساری دەداتەوە. ئەو دەمەی منداڵ بووم زۆربەی خزم و کەس و کارەکانم دانیشتووی سلێمانی بوون، مامم (مراد یاقۆ) خاوەنی کۆگای (باتا) بوو، بەڵام مامێکی ترم بەناوی (بەدر یاقۆ)وە هەر لەساڵی ۱۹٦۳ وە تاوەکو ساڵی ۱۹۷۵ پێشمەرگەی شۆرشی ئەیلولی مەزن بوو، بەشێوەیەکی گشتی بنەماڵەکەمان خاوەن بیرێکی شۆرشگێری و نیشتمان پەروەربوون و رۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە بزافی رزگاری خوازی کوردستاندا. مە . ەفا بارزانیش وەک سەرکردەی مێژوویی ئەو بزوتنەوەیە لەنێو بنەماڵەی ئیمەدا ئەستێرەیەکی درەوشاوەو ناوێکی پر سەروەری و رێزو خۆشەویستی بوو.

## لەقوتابخانەوە

ئێستاش لەبیرمە بەیانیەک زوو لە هاوینی ساڵی ۱۹۷۵ دایکم جلوبەرگێکی جوانی لەبەرکردم و بردمیە قوتابخانەی (سەرەتایی بۆتانی کوران) لەگەرەکی سەرچنار داخڵی خوێندنی کردم. پێش ئەوەی من بچمە ئەو قوتابخانەیە (قەیس)ی برام لەوێ دەیخوێند ئەگەرچی من بەهۆی رووداوەکانی ئەو کاتی کوردستانەوە کەمێک لەخوێندن دواکەوتم، بەهەر حاڵ ئەوانەی لەقۆناغەکانی سەرەتایی خوێندندا لەگەڵم بوون هەندێکیان ماون و گەواهی ئەوەم بۆ دەدەن کە من لەپۆلی یەکەمی سەرەتایی خوێندنمەوە قوتابیەکی زیرەک و وریاو چاوکراوە بووم، وا باوبوو هەمیشە ئەو قوتابیانەی کەلەوانەکاندا زیرەک بوون منداڵێکی هێمن و لەسەرخۆبوون، کەچی من بەپێچەوانەوە قوتابیەکی زیرەک بووم، بەڵام هەتا بلێ ، بزێوو نەسرەوت بووم، هەندێ جار لەخۆرا شەرم بەقوتابیانی هاورێم دە ۆشت، مامۆستایان پێیان دەگوتم هارو هاج. بەهەر حاڵ ئەمەش خویەکی شیری بوو تەرکم نەدابوو، بەڵام سەرەرای هەموو ئەو رەفتارو

هەڵسوکەوتانە مامۆستایان هەر خۆشیان دەویستم، چونکە خوێندن و وانەکانم فەرامۆش نەکردبوو هاوکات منداڵێکی نوکتەچی و قسە خۆشبووم، زۆر حەزم بەتێکەڵبوونی خەڵک دەکرد لەزۆربەی چالاکییە هونەریی و گەشت و سەیرانەکانی قوتابخانەدا بەشداریم دەکردو رۆڵێکی بەرچاوم هەبوو، دەنگم بۆ گۆرانی خۆشبوو تاوەکو ئێستاش دەنگم کەمێک لەو خۆشییەی پێوەماوە لەزۆربەی بۆنەو ئاهەنگەکانی قوتابخانەدا مامۆستایان بەتایبەتی مامۆستا عەلی کەبە (عەلی چەپلەر) ناوی دەرکردبوو، حەیرانەکانی هونەرمەند رەسول گەردیان پێ دەگوتمەوە دەنگم بۆ حەیران زۆر خۆشبوو، چونکە کاتی خۆی بەمنداڵی چەند جارێک سەردانی دوورودرێژمان دەکرد بۆ هەولێر و لەماڵی خزمانم دەمامەوە، لەوێ چڕینی حەیران فێربووم. هەرگیز لە قوتابخانەدا هەستم نەدەکرد کەمن مەسیحیم و لەگەڵ قوتابیانی هاوڕێما ئاینمان جیاوازە، تەنیا ئەو کاتانە کە وانەی پەروەردەی ئیسلامیمان دەبوو، مامۆستا مۆڵەتی دەدامێ و دەیگوت دەتوانی بچیتە دەرەوە یاخود جار ناجارێ دەچووینە کەنیسە لەگەڵ دایک و باوکم و خۆشک وبراکانما.

## خۆشەویستی بارزانی و بیری شۆڕشگێڕی

وەک پێشتر باسم کرد من لەخێزانێکی مەسیحیی کوردستان پەروەرو بارزانی پەروەربووم، خالوان و مامەکانم تەمەنێکی زۆریان بە پێشمەرگایەتی لەنێو ریزەکانی پارتی و بزوتنەوەی ئازدیخوازی کوردستاندا بەسەربرد، زۆرجار چەند پیاوێک دەهاتنە ماڵمان کەبەڕاستی نەمدەناسین، لەگەڵ باوکمدا دەچوونە ژوورێکەوەو بەنهێنی دادەنیشتن کاتێ ئێمە دەچووینە لایان باوکم چاوی لێ سوور دەکردینەوەولێمان توورەدەبوو دەری دەکردین، ئیدی منیش کێچ دەکەوتە کەوڵم ئەو دایکە میهرەبانەم پرسیار باران دەکرد (ئەوانە کێن؟ ئیشیان چیە؟ بۆچی دێنە لای باوکم؟.. باسی چی دەکەن؟ بۆچی نایەڵن بچمە ژورەوە دەپێم بڵێ، دەی دڵم تەقی).. دایکیشم تەنیا ئەوەندەی لەدەست دەهات کە چاوێکم لێ بز بکاتەوە و بەترسەوە لێوی خۆی بگەزێ و بەهێواشی پێم بڵێ «بێ دەنگبە کوڕی خۆم چیت داوە لە ئیشی پیاوان؟» باوکم پیاوێکی زۆر نهێنی پارێزبوو، بە

شێوەیەک لە پاش ئەم هەموو ساڵەی تەمەن و زیندانی ئێستا پێم دەڵێ ئەو کات لە ڕێکخستنە نهێنیەکانی پارتی کارمان دەکرد و لەگەڵ ئەو پیاوانەدا کۆبوونەوەی حزبیمان دەکرد.. بەهەرحاڵ هەر لەمنداڵییەوە ناوی (پێشمەرگە)م لا شیرین بوو، پێشمەرگەم وەکو پاڵەوانی فلیمە ئەفسانییەکان دەهاتە بەرچاو، دەشمزانی «پێشمەرگە» ناوێکی قەدەغەیە و نابێ لە هەموو کۆڕو مەجلیسێکدا باسی بکەین، لەنێو منداڵانی گەڕەکدا زۆر جار لەگەڵ یەک یاریمان دەکردو خۆمان دەکردە دوو گروپ، بەشێکمان دەبوینە پێشمەرگە و ئەوانی تر دەبوون بەسوپا ئینجا بە تەختە چەک و کلاشینکۆفمان دروست دەکرد تەقەمان لەیەکتر دەکرد، شەوانی زستان دایکم زۆر جار باسی بارزانیی بۆ دەکردین هەمیشە باسی ئازایەتی و مەردایەتی وخۆشەویستی ئەو سەرکردەیە وێردی سەر زوبانی بوو، باوکم دەیگوت بارزانی مرۆڤێکی زۆر مەزنەو لە ئاست دوژمنەکانیدا نەبەردو کۆڵنەدەرە ... خۆشەویستی هەموو خەڵکی کوردستانە موسڵمانەکان و مەسیحییەکانی کوردستان بارزانیان زۆر خۆش دەوێ بەسەرکردەیەکی دڵسۆزی خۆیانی دەزانن..ئیدی لەنێو ماڵی خۆماندا ئەم قسانەم زۆر دەهاتە بەرگوێ، بۆیە هەمیشە خەونم بەوەوە دەدیت ڕۆژێ لە ڕۆژان گەورە بم و ببمە پێشمەرگە لە نزیکەوە بە دیداری ئەو سەرکردە مەزنە شاد بم.

جارێکیان لە گۆڤارێکی عەرەبیدا وێنەیەکی بارزانیم هاتە بەرچاو خێرا بەدزی دایکم وباوکمەوە ئەو لاپەڕەیەم لە گۆڤارەکە کردەوە و قەدم کردو خستمە گیرفانمەوە ئینجا چوومە سەربانی ماڵی خۆمان بەوردی تەماشام کرد، زۆر حەزم دەکرد پیشانی هاوڕێکانمی بدەم بەڵام نەمدەوێرا چونکە بارو دۆخی ئەو کاتە وابوو پیاوانی حکومەتی عێراقی هێندە خەڵکیان دەگرت و دەپێچایەوە و وهێندە زوڵم و زۆرداریبیان لە خەڵکی ستەمدیدە دەکرد، کەس متمانەی بەکەس نەمابوو، ئەوەیان بەمنداڵی، بەڵام پاشان کە گەورە بووم زۆربەی شەوانی هاوین لەژێر ڕووناکی گڵۆپی عەمودەکانی سەر جادەکانی سەرچناردا لەگەڵ برادەرەکانم دادەنیشتین و باس باسی شۆڕشی گوڵان و چالاکیەکانی پێشمەرگە بوو.

ورده ورده ئەو هەستەم لا دروست دەبوو کە خەڵکی کوردستان خەڵکێکی چەوساوەو ژێر دەستێ و خاکمان داگیر کراوە، دەمزانی پیاوانی پۆلیس و

ئەمن و ئەو دائیرانەی کە بەعەرەبی قسە دەکەن، ئەمانە بۆ پاراستنی هێمنی وئاسایش و سەروماڵی خەڵکی کوردستان کار ناکەن، بەڵکو ئەمانە کۆمەڵێ دام و دەزگای سەرکوتکەرن و دژی ئازادی خەڵکی کوردستانن، دەمزانی ئەو قسەو باس و هەواڵانەی لە شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە دەبیستین هەمووی بۆ چەواشەکردنی ئێمەیەو لەبەرژەوەندی ئەم خەڵکە دانیە.. ئیدی زۆر و زۆر بوون ئەو هۆکارانەی بیری شۆڕشگێریان لا دروست کردم و وایان لێ کردم کە هەست بە چەوساندونەوەی میللەتەم بکەم..ساڵی ١٩٧٧ بوو ئەو کاتە قوتابی قۆناغە سەرەتاییەکانی خوێندن بووم، ڕۆژێکیان دامودەزگاکانی حکومەت بڕیاری قەدەغەکردنی هاتوچۆیان دا (منع التجول)ئیدی بۆ سبەی شار کش و مات بوو، بەیانی زوو لە سەربانی ماڵی خۆمانەوە تەماشای شەقام و بازاڕەکانی سەرچنارم کرد . جگە لە هەندێ ئۆتۆمبێلی نەجدەو سەربازی هیچی دیکە بەرچاونەدەکەوت هیچ کەسێک لەماڵی خۆی نەهاتە دەرەوە، لەنێو سلێمانیدا کۆمەڵێک مامۆستایان دیاری کردبوو کە سەرژمێری دانیشتوانی شار بکەن، ئەوە بوو هەر چەند مامۆستایەک و چەند کۆلان و گەرەکێکیان پێ سپێردرابوو یەکێک لەو مامۆستایانە لەدەرگای ماڵی ئێمەی داو باوکم چوو دەرگاکەی لێ کردەوە، منیش وەک ڕەفتاری هەمیشەییم بەراکردن بەدووی باوکم کەوتم وچوومە بەر دەرگا لەگەڵیا، ئیدی مامۆستاکە چەند فۆڕمێکی بەدەستەوە بوو کەوتە پرسیارکردن لەباوکم لەیەکێک لەپرسیارەکاندا مامۆستاکە گوتی: سەربە چ نەتەوەیەکن؟ باوکم لەوەڵامدا گوتی: (ئێمە ئاشوورین) مامۆستاکە زەردەخەنەیەک گرتی و بەباوکمی گوت: ئاشوری و ماشوری نییە ئێوە بەعەرەب دەنووسین، هەستم کرد باوکم زۆر توڕەبوو ناوچەوانی ئاگری لێ دەباری بەتوڕەییەوە بەمامۆستاکەی گوت: (کاکە گیان ئێمە ئاشورین بۆچی نەتەوەکەمان دەگۆڕن، ئەگەر هەر سوورن لەسەر ئەوەی بیگۆڕن بنووسن کورد بۆچی دەمانکەن بەعەرەب) ، مامۆستاکە بەهێواشی بەباوکمی گوت: (ئەو قسانە مەکەن، ئەگینا خراپتان لێ بەسەر دێت، فەرمانەکان لەسەرەوە واهاتوون، ئەوەی مەسیحی بێت بەعەرەب دەنووسرێت حەزیش ناکەم لەوە زیاتر موناقەشەم لەگەڵ بکەیت و ئەوەی لای منیش گوتت لای کەس نەیدرکێنی)

ئەگەرچی منداڵیش بووم، بەڵام بەراستی ئەو گفتوگۆیە کۆمەڵێ شتی گەوردی لا بەجێ هێشتم.

## ئەو شەوەی باوکم گریا!

سەرەتای مانگی ئاداری ساڵی ١٩٧٩ بوو ڕۆژێکیان لەماڵی مامە نەجیبم لەگەڕەکی دارۆغای سلێمانی بەخاوو خێزانەوە دەعوەتی خوانی ئێوارەبووین. ئەو شەوە مامم زۆر تورەبوو بەهەناسە بڕکێیەکی قوڵەوە رادیۆیەکی نابوو بەگوێیەوە، باوکیشم لەتەنیشتیەوە دانیشتبوو منیش نەمدەزانی مەسەلە چییە! بە پێکەنینەوە هاوارم کرد مامە ئەوە بۆ وا تورەی؟! لەپڕ باوکم یەک زللەی لەپەنا گوێم سرەواندو وتی: (بێ دەنگبە رۆڵە باگوێمان لەرادیۆکە بێت) هێشتا لەئازارو دەنگی زللەکەی باوکم گوێچکەم دەزرگایەوە، کاتێکم زانی باوکم و دایکم و مام و مامۆژنم و زۆربەی ئەندامانی خێزان، تێکڕاو پێکڕا دەستیان کرد بەگریان، بەڵام چۆن گریانێک هەموو باوەشیان دەکرد بەیەکداو فرمێسکەکانیان بەهیچ شتێک رانەدەگیرا، گریانێک بەکوڵ بەبێ ژیربوونەوە ئەو شەوە یەکەمین جارم بوو لەژیانمدا گریانی باوکم ببینم، نەمدەزانی مەسەلە چییەو ئەم لێشاوی گریانە چۆن ئاوا لەناکاو خۆی کرد بەم ماڵەدا، ئەوەندەم لەمامم گوێ لێ بوو کە بەگریانەوە دەیگوت: (تەواو تازە تەواو... ئیتر هەتا ماوین خۆشی نابینین).

لەم قسە و گریانە بەکوڵە واقم وڕمابوو، وەختێکم زانی گریان و قاوو قریشک لەماڵەکانی دیکەی ئەو گەڕەکە بەرز بۆوە، خەڵکی هەموو دەهاتنە بەردەرگاو دەگریان هێشتا بواری ئەوەم بۆنەرەخسابوو کە بپرسم چی بووەو چی روویداوە؟! بۆچی دەگرین؟ دایکم و باوکم پەلی ئێمەیان گرت وبەوشەوە هەموو بەگریانەوە سواری تەکسیەک بووین وگەڕاینەوە بۆ ماڵی خۆمان لەسەرچنار. کە گەیشتینەوە گەڕەکی خۆمان تەماشا دەکەم لەوێش هەمان حەشروگریان هەیەو خەڵکێکی زۆر لەبەردەرگا وەستاون هەندێکیان دەگرین، چووینەوە ماڵی خۆمان هێشتا لەحەوشەبووین، وەختێکم زانی (حەمەد ئاغای دۆڵەمەڕی) کە ئەوکات دراوسێمان بوو بەماڵ و منداڵەوە بەگریانەوە خۆیان کرد بەماڵی ئێمەداو بەباوکەڕۆ و براڕۆ باوەشی کرد

بەباوکمدا بەگریانەوە هاواری کرد: (فەرمان بابێمەچوو... بابێ مە تەواو) ئیدی پاش ئەوە هێدی هێدی بۆم دەرکەوت کە بەڕاستی ئەوانە ناحەقیان نییە دەگرین، تومەس ئەمە هەواڵی پڕ ناسۆرو کۆست کەوتنی تێکڕای خەڵکی کوردستانە بەهەموو رەگەزو ئایین و چین و توێژەکانیەوە ئەوە هەواڵی مەرگی بارزانیی باوک و سەرکردەبوو، پاش ئەوەی هەموو شتێکم بۆ ڕوون بۆوە ئینجا منیش لەگەڵ باوکم و دایکم و خوشک و براکانما دەستم کرد بەگریان .وێنەکەی بارزانیم هەر لەلامابوو کەتەماشام دەکرد دڵخۆشی خۆمم دەدایەوە لەدڵی خۆمدا دەمگوت: (دەی بەشکو ئەو هەواڵە درۆبێت) بەهەرحاڵ زۆربوون ئەو ڕووداوانەی کەوایان لێ کردم خۆم لەبیر بکەم و ڕۆژ بەڕۆژ بارزانی و پێشمەرگەو ڕێبازی رزگاری کوردستانم لا خۆشەویسترو پیرۆزتر بێت زوو زوو لەخۆمم دەپرسی: (تۆ بڵێی ڕۆژێک دا بێ و من ببمە پێشمەرگە؟) لەراستیشدا ئەو کەشو هەوا شۆڕشگێڕییەی شاری سلێمانی و ئەو مێژووە خوێناوییە کە زۆرجار باوکم و دایکم بەتایبەتی دایکم بۆی باس دەکردم. سروودەکانی ئەو کاتەی قوتابخانەی سەرەتایی بۆتان کە ماموستا (رەوف بێگەرد) فێری دەکردین جۆش و خرۆشێکی لەرادەبەدەری لا درورست دەکردم. زۆربەی بەیانییەکان لەحەوشەی قوتابخانەو هەندێ جار لەوانەی (سرودو مۆسیقا)دا ،مامۆستا رەوف خۆی بەدەنگێکی خۆش چەند سرودێکی شۆڕشگێڕی و کوردستانی و کورد پەروەرانەو نیشتمانپەروەرانەی بۆ دەگوتینەوە، ئێستاش زۆر لەو سرودانەم لەبیرماوە (برأینە لەخەوهەستن بەیانە، ئەی رەقیب، کوردم ئەمن، ئەمڕۆژی پیرەمێرد، خوایە وەتەن ئاواکەی، سەدەی بیستەمە کوردە هیمەتێ) ئا بەو شێوەیە وەک قوتابییەکی زیرەک قۆناخی سەرەتایی خوێندنم بەجێ هێشت و بۆدواجار ماڵئاواییم لە قوتابخانەی بۆتانی سەرەتایی کرد، ئەو قوتابخانەیەی کەلە ناخمدا بیری شۆڕشگێری دروستکردو یەکەمین وانەی خۆشەویستی گەل و ولاتی فێرکردم، ئێستاش بیروەرییەکانی ئەو ڕۆژانەی تەمەنم لەهەموو شتێک لاشیرینترە.

# قۆناغی خوێندنی ناوەندی و دەسپێکی هەنگاوەکان

ئەو دەمە لەنێو سەرچناردا تەنیا یەک قوتابخانەی ناوەندی کوڕان هەبوو، ئەویش ناوەندی سەرچناری کوڕان بوو لەگردەکەی سەرچنار.. ساڵی ۱۹۸۱ هەر لە یەکەمین ڕۆژانی خوێندنمەوە هەندێ دیمەنی سەیرم دەهاتە بەرچاو کە ڕۆژبەڕۆژ شتی نوێیان لا دروست دەکردم، زۆربەی هەرە زۆری قوتابیانی ئەو قوتابخانەیە خەڵکێکی سەرکێش و ئازابوون، بەهیچ شێوەیەک ئەو بارودۆخەی ئەو کاتەیان پێ قبوڵ نەدەکرا گیانی کوردایەتی و شۆڕشگێڕی بەشێوەیەک لەناویاندا چەکەرەی کردبوو کەسات لەدوای سات پەرەی دەسەندو بەهیچ فشارێک کپ نەدەبۆوەو دانەدەمرکایەوە، قوتابیان بەئاشکرا باسی پێشمەرگەو شۆڕشیان دەکردو هێرشیان دەکردە سەر حکومەت و دەستەودایەرە داپڵۆسێنەرەکانی، کە سەرنجم دەدا ئەو کەشو هەوا شۆڕشگێڕییە لەو قوتابخانەیەدا هەبوو، ئەوەبوو کەمن چاوەڕوانی بووم ناوەندی سەرچناری کوڕان وەک دائیرەی ئەمنی لێ هاتبوو هەر ڕۆژەی دەستەو تاقمێک لەپیاوانی ئەمن دەهاتن و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ چەند قوتابی و مامۆستایەک دەکرد، منیش تەنیا برادەرایەتی ئەو قوتابیانەم دەکرد کە ئەو سەرەڕۆیی و بێ باکیەیان تێدابوو.. ترسان و جاڕس بوونی دامودەزگا ئەمنیەکانی حکومەت لەگەڕەکی سەرچنار بەرامبەر بەو قوتابخانەیە بەتەواوەتی لەسیماو روخساری پیاوانی لێکۆڵەرەوەدا دیاربوو، بۆیە هەمیشە هەوڵیان دەدا ئەو بارودۆخە هەڵچووەی نێو ئەو قوتابخانەیە بگۆڕن بەهەر نرخێک بێت، بۆ نموونە ڕۆژ بەڕۆژ مامۆستای بەعسی و هەوادارانی حزبی بەعسیان لەو قوتابخانەیەدا دادەمەزراند،،

بەڵام بە پێچەوانەوە گیانی شۆڕشگێری و ڕەتکردنەوەی ئەو بارودۆخە بەهەموو شێوەیەک زیاتر پەرەی دەسەندو قوتابیان دەهاتنە سەر ئەو بروایەی کە پتر متمانەیان بەخۆیان و بەو ڕێبازەی گرتوویانە زیاد ببێت، ئەو بیروباوەڕە نیشتمانپەروەرییەی لەهزرو مێشکی ئەو قوتابییە هەرزەکارانەدا دروست بوو بوو، بەهیچ شتێک نەدەسڕایەوە، زۆر لەوانە براو خاڵ و مام و کەسوکاریان پێشمەرگەبوو، ئیدی ئەو بارودۆخە زیاتر پەرەی سەندو گەیشتە ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیانی ئەو قوتابخانەیە گیران، کەس چارەنووسی نەدەزانین، تەنانەت چەند مامۆستایەکی ئەو قوتابخانەیە وازیان لەخوێندن هێناو ڕوویان کردە چیاو بوون بە پێشمەرگە.

بۆ ماوەی مانگێک شیرازەی خوێندن لەو قوتابخانەیە بەتەواوی تێک چوو، من یەکێک بووم لەو قوتابیانەی کە مامۆستا بەعسیەکان وەک گێرە شوێنێک سەیریان دەکردم، بەهەر حاڵ ئەو ساڵە بەسەرهات و ڕووداوی زۆر ناخۆش ڕوویدا، بەڵام کۆمەڵێ برادەری زۆ خۆشەویست و چاونەترس و دڵسۆزم ناسی. بارودۆخی قوتابخانە تادەهات ترسناکتر دەبوو هەر ڕۆژەی قوتابیەکی هاوڕێمان دەگیراو کەس نەیدەزانی بۆ کوێی دەبەن! زۆربەی ڕۆژانی پێنج شەممان مامۆستایەکی بەعسی، یان پیاوێکی بەعسی لەدەرەوەی قوتابخانە دەهات و قسەی بۆ دەکردین وبەحسابی خۆی ئامۆژگاریمان دەکات و فێری نیشتمان پەروەریمان دەکات!! تەنانەت هەندێ جار بەزمانی هەڕەشەوە بۆمان دەئاخاوتن. بەهەر حاڵ ئەو ساڵە لەبەر ئەو بارودۆخە مەترسیدارە نەمتوانی خوێندن تەواو بکەم.

## چۆن بە شەهید نزار ئاشنا بووم؟

شەهید (نزار نوری) کە لەنێو سەرچناردا بە (نزاری نوری فاتە کوڕانی) ناسرا بوو، یەکێک بوو لە گەنجە هەرە ڕوح شیرین و قسە خۆش و نوکتەبازەکانی سەرچنار، کەم کەس هەبوو لەو گەڕەکە نزار نەناسێ، بەڵام لەهەمان کاتدا کوڕێکی هەتا بڵێی ئازاو بەجەرگ و چاونەترس بوو، لەهیچ شتێک سڵی نەدەکردەوە، یەکێک لەهۆکارە هەرەسەرەکیەکانی ئەو بارودۆخەی کەلەناوەندی سەرچناردا دروست بوو بوو، بوونی (نزار) بوولەو قوتابخانەیەدا... ساڵی دووەم چوومەوە هەمان پۆل بۆ خوێندن،

خوشبەختانە نزار لەو پۆلەدا دەیخوێند، هەندێ لەقوتابیەکان لەنێو خۆیاندا بە چپە چپ باسی نزاریان دەکردو دەیانگوت لەڕیزی ڕێکخستنە نهێنیەکانی پارتی دیوکراتی کوردستاندا کاردەکات، ئیدی وردەوردە زیاتر لەنزار نزیک بوومەوەو ئولفەتم پێوەگرت، بەراستی زۆر بە ئازایەتی و چاونەترسیەکەی سەرسام بووم، نزار باکی بەکەس نەبوو، بەئاشکرا باسی کوردایەتی و پارتایەتی بۆ دەکردم، لەو ماوەیەدا کەشوهەوای سلێمانی پتر ئالۆز بوو، گەنجێکی زۆر دەگیران و خەلکێک لەسێدارە دەدران و زۆریش هەبوون پەیوەندیان بەهێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە دەکرد. لەو ساڵەدا لەگەڵ نزاردا بووینە هاوڕێی گیانی بەگیانی و هەستم دەکرد ئاگاداری هەموو چالاکییەکانی پێشمەرگەیە، لا بەلا هەندێ نهێنیشی لا دەدرکاندم. ئیدی من و نزارو کۆمەڵێ قوتابی تر بوو بووینە سەرچاوەی بێزار کردنی مامۆستا بەعسیەکان و دەستەو دایەرەکانیان، بەڵام من هێشتا بەشێوەیەکی رەسمی سەر بە ڕێکخستنەکانی پارتی نەبووم ، چەند جارێک داوام لەنزار دەکرد کە ناوم لەنێو شانەکەی خۆیدا تۆمار بکات، کەچی هەر پێی دەگوتم: (تۆ بەردەوام بە خەمت نەبێ جەماعەتمان باشت دەناسن و لێت ڕازین) ڕۆژبەڕۆژ زیاتر لەناخەوە ئاسوودەتر دەبووم پتر هەستم بەبوونی خۆم دەکرد، ڕۆژێکیان (جلوبەرگی تەلائیعی)یان هێناو مامۆستا بەعسیەکان بەسەر قوتابیاندا دابەشیان کرد، رەنگە زۆربەی ئەو کەسانەی کەلەو ساڵانەدا قوتابی بوون باش بزانن (جل و بەرگی تەلائیعی)چۆن بوو و بۆ چ مەبەستێک دابەش دەکرا! ئەو جلانە دوو شێوە بوون هەندێکیان شین و هەندێکیان خاکی، وێنەی نیشتمانی عەرەبی و دارخورمای تێدا بوو، هەر لەقۆناغی ناوەندیەوە حکومەتی عێراقی بەسەر قوتابیاندا دابەشی دەکردو ئەو قوتابیانەی ئەوبەرگەیان دەپۆشی لای خۆیان بە (پێشرەوان یاخود بەچکە شێران!!) ناوزەد دەکران، زۆرجار نزار کەباسی لەخراپی ئەو جل و بەرگانە دەکرد پێی دەگوتین: (کوڕینە ئێوە ئەو جل و بەرگە مەپۆشن چونکە وێنەی نیشتمانی عەرەبی تێدایەو ئێمەش بەشێک نین لە نیشتمانی عەرەب) بۆیە ئەو ڕۆژەی کە جل و بەرگی تەلائیعی لەناوەندی سەرچناری کوڕان دابەشکرا، من و نزارو شەهیدان (عوسمان و عیرفان) کە هەردووکیان برابوون و دوایی دەستگیرکران و لە سێدارەدران،

نەک هەر خۆمان جل و بەرگی تەلائیعیمان وەرنەگرت، بەڵکو نەمانهێشت زۆر لە قوتابییەکانی دیکەش ئەو جل و بەرگە وەربگرن، نزار بە ئاشکرا هاواری دەکرد(کورینە زۆر عەیبە برادەرەکانمان لەزینداندا بن و کەس چارەنووسیان نەزانێ و ئێمەش ئەم جل وبەرگەی بەعس بپۆشین). ئیدی ئەو ڕۆژە کێشەیەکمان نایەوە ئەو سەری دیار نەبوو، بەهەر حاڵ ئەو ڕۆژە قوتابخانە داخراو ڕۆیشتینەوە، یەکێک بوو لە ڕۆژە خۆشەکانی تەمەنم، هەستم دەکرد شتێکی زۆر گەورەم کردووە. ئیدی هێشتا تەواو کامڵ نەبووم نەمدەزانی ئایا ئەوەی من کردوومە ئەرکێکی نیشتمانییە یاخود حەزو هەوەسێکی هەرزەکارانەیەو بۆم هاتۆتەدی، بۆ سبەی بارودۆخی قوتابخانە تەواو ئاڵۆز بوو بوو، لەحەوشە ریزیان کردین و پیاوێکی بەعسی هات بەعەرەبی قسەی بۆ کردین و هەڕەشەی دەکرد، مامۆستا بەعسیەکانی تریش چاویان لێ سووردەکردینەوەو دەیانگوت هەرچی ئەو گێرە شێوێنییە بکات خۆی و باوکی دەگرین و ئیعدام دەکرێن. مامۆستا کوردپەرو نیشتمانپەروەرەکانیش نەیان دەوێرا زۆر سەرهەڵبرن چونکە لەهەموو لایەکەوە لێکۆڵینەوەو هەڕەشە کاری بوو، بەڵام هەموو ئەمانە ڕقیان ئەستووتر دەکردین بەرامبەر دەسەڵاتداران و زیاتر هانی دەدایین لەسەرکاری خۆمان بەردەوام بین شێوازی خوێندن لەو قوتابخانەیەدا تەواو تێک چوو بوو ئەو کۆمەڵە قوتابییەی هەمیشە پێکە بووین هەموومان جلی ڕەشمان لەبەر دەکرد، نەشمان دەزانی مەبەست لەوجلی ڕەشە چیە!! تەنیا ئەوەندە حاڵی بووین کە پیاوانی ڕژێم بەجلی ڕەش قەڵس دەبن ودەورووژێن،ڕۆژبەڕۆژ هەڕەشەکانی مامۆستا بەعسیەکان بۆ سەر ئێمە زیادی دەکرد، بەتایبەتی لەدژی نزار، بەڵام لەهەمان کاتدا کۆمەڵێ قوتابی زیرەک بووین لەوانەکاندا.

## نمرەی وانەی عەرەبی

بەو پێیەی کە من مەسیحی بووم و کۆمەڵێ خزم و کەس و کاری زۆرم هەبوو لەشاری بەغدای پایتەختی عێراق و هاتوچۆم زۆر دەکردن، لەوانەی عەرەبیدا زۆر زیرەک بووم، ئەو ساڵە مامۆستا (سەمیر) وانەی عەرەبی پێ دەگوتینەوە مامۆستا سەمیر عەرەب بوو، خەڵکی وڵاتی میسر بوو، بەڵام

بەعسیەکی تۆخ بوو! جارێکیان تاقی کردنەوەی وانەی عەرەبیمان ئەنجام داو وەڵامی هەموو پرسیارەکانم بەراستی دایەوەو دڵنیابووم نمرەکەم لەسەروو ( ٩٠ ٪ ) دەبێت،بەڵام کاتێ مامۆستا سەمیر وەرەقەی تاقی کردنەوەکەی بۆ هێنباینەوە، بینیم هەموو وەڵامەکانم راستە کەچی ( ٥٥ ٪ )ی بۆ داناوم، منیش زۆر ڕقم هەستاو دەستبەجێ لەمامۆستام پرسی: (من هەموو وەڵامەکانم راستە بۆچی ( ٥٥ )ت داومەتێ؟) مامۆستا سەمیریش زۆر بە توورەییەوە وەڵامی دامەوەو گوتی: (خۆت باش دەزانی بۆ چی نمرەی باشت نادەمێ!)، بەراستی کەمێک ترسم لێ نیشت گوتم: (مامۆستا مەبەستت چییە لەو قسەیە؟ چیم کردووە؟!) ئیدی رۆیشتە دەرەوەی پۆل، ناچار بووم دوای کەوم دیسان لێم پرسیەوە.. ئاوڕێکی لێ دامەوەو بەهەڕەشەوە بە شێوە زاری میسری گوتی: (شێرزاد خذ بالک من نفسک).. گوتم بۆچی؟.... ئیدی بەدەم پیاسەوە کەوتە قسەکردن و پێی گوتم: (شێرزاد تۆ کوڕێکی زیرەک و عاقڵی حەز ناکەم تووشی گرفت و کێشە بیت، واز لەهاوڕێیەتی ئەو قوتابیە گێرە شێوێنانە بێنە!!) بەراستی ئەو قسەیە کەمێک ترساندمی و تووشی هەڵوەستەی کردم، کە دەشترسام زۆر لەگیانی خۆم نەبوو، بەڵکو ترسی ئەوەم هەبوو باوک و دایک و کەسوکارم تووشی تەنگ و چەڵەمەبن بەدەست منەوە، هەر چۆنێ بوو ئەو شەوە خۆم گەیاندە ماڵی نزار، نزار جیا لە هەموو شتێک کوڕی تەنگانەو هاوڕێیەکی دڵسۆزو خۆشەویست بوو بۆ من، بۆیە هەر کاتێ دڵم تەنگ بوایە هانام بۆ دەبرد، شەو لەگەڵ نزار دا بەنێو کۆڵانەکانی سەرچناردا کورتە پیاسەیەکمان کردو گفتوگۆکەی نێوان خۆم و مامۆستا سەمیرم بۆ گێڕایەوە، نزاریش وەک هەمیشە بەورەیەکی بەرزەوە گوتی: (یەک تۆزقاڵ گوێی مەدەرێ، ئیهمالی کە ئەو میسریە چوزانێ لێرە چی هەیەو چ زوڵمێک لەئێمە کراوە) ئەو شەوە نزار تەواو وورەی بەرزکردمەوە، بۆیە کە گەڕامەوە ماڵەوە کەمێک ترسم مابوو، بەڵام زۆر هەستم بەخۆشی دەکرد، ئیدی بۆم دەرکەوت من منداڵە بزێوەکەی جاران نیم، من شتێکم و دوژمن حسابێکی تایبەتم بۆ دەکات.. ئیدی لەوە بەدواوە لەدژی قسەکانی مامۆستا سەمیر زیاتر لەنزارو هەڤاڵەکانی نزیک بوومەوە، هاوکات قوتابخانەشم لەبەرچاو کەوتبوو بەشوێنێکی ترسناکم دەزانی، زۆربەی هەرە زۆری ئەو قوتابیانەی

که حەزبان بەگێچەڵ نەدەکرد، نەیان دەوێرا توخنمان کەون و برادەرایەتیمان بکەن، وەک باسم کرد کەمێک قوتابخانەم لەبەرچاو کەوتبوو، بەڵام لەهەمان کاتدا نەمدەویست وازی لێ بهێنم، زۆرجار لەبەر خۆمەوە لەگەڵ خۆم دەدوام..( تازە من ناوم چووە ناو ناوانەوە، دەبێ زیاتر خۆم بسەلمێنم و دەبێ هەر شتێک بەشتێک بکەم نابێ دەستەوەستان بم) نزار فێری ئەوەی کردبووین کە شەوانە گوێ لە رادیۆی (دەنگی کوردستانی عێراق) بگرین و درەنگانێ لەنێو شەقامەکاندا پێکەوە بۆ یەکترمان دەگێڕایەوە، ئەو کات هەندێ جار لەبەر تەشویش باش وەرنەدەگیرا، ناچار ئالێری تەلەفزیۆنمان لەرادیۆ کەدەبەست، بەهەر حاڵ ئەو ساڵەی خوێندنمان بڕی و دەرچووین بۆ پۆلی دووی ناوەندی، بەڵام هێشتا من بەرەسمی پەیوەندیم بەرێکخستنەکانی پارتیەوە نەکردبوو.

## شەوە ترسناکەکانی سەرچنار

بەدرێژایی شەوانی ئەو پشووی هاوینە پێکەوە لەگەڵ نزارو برادەراندا بووین و رۆژە بەرۆژ ژمارەی هەڤاڵانمان زیاتر دەبوو، ئەوانەی کەس و کاریان پێشمەرگە بوایە یاخود لەسێدارە بدرایە هەموو کەس رێزی لێ دەگرتن، بە پێچەوانەوە پیاوانی رژێم و بەعسیەکان لەناو خەڵکدا زۆر بودەڵە بوون و بەچاوێکی کەم و نزم سەیریان دەکرا، بەتایبەتی ئەوانەی لەسەر رەغبەت و ئارەزووی خۆیان کرابوونە (جیش الشعبی) واتە سوپای میللی. جەیشی شەعبی لەکوردستان بەو کەسانە دەگوترا کە بەکرێ گیراوی دەزگا حزبیەکانی حزبی بەعس بوون و لەسەردەمی جەنگی (عێراق-ئێران)دا بەخۆبەخش دەبوونە بەعسی و چەکیان بۆ حکومەت هەڵدەگرت، لەشارەکانی کوردستاندا زۆربەی پیاوانی جەیشی شەعبی کورد بوون و خەڵکی ئەو گەڕەک و کۆڵانانە بوون کە کاریان تێدا دەکرد لەشارەکانی دیکەی عێراقیشدا بەهەمان شێوەبوو بێگومان زۆر کەس لەیادیەتی ئەوانە زۆربەیان کاری خراپەیان دژی خەڵکی ستەمدیدەو هاوشاریەکانی خۆیان دەکرد، لەنێو خەڵکی نیشتمانپەروەردا پیاوانی جەیشی شەعبی زۆر قێزەون بوون، تەنانەت بەکارێکی عەیبە دەزانرا پیاو ببێتە جەیشی شەعبی، لەو ساڵانەدا گەیشتبووە ئاستێک مرۆڤ نەک هەر

حزم و کەس و کاری تەنانەت ئەگەر دراوسێیەکی جەیشی شەعبی بووایە، خەلک گاڵتەیان پێ دەکردو پێیان دەگوت: ( برۆ دراوسێکەت چاک بکە ئینجا باسی کوردایەتی و نیشتمانپەروەری بکە). جەنگی ئێران و عێراق کلّپەی سەندبوو، زۆر لەگەنجەکانی کورد ئامادە نەبوون خزمەتی سەربازی بکەن و بەشداری ئەو جەنگە خوێناویەبن، بۆیە لەسەربازی هەڵدەهاتن و زۆریشیان روویان دەکردە چیاکان و دەبوون بە پێشمەرگە. ساڵی نوێی خوێندن دەستی پێ کردەوەو چووینە پۆلی دووەمی ناوەندی و دەستمان بەخوێندن کردەوە، هەروەک پارویێرار کۆمەڵێ قوتابی بەزمانی بەعسیەکان(گێرە شێوێن!!) پێکەوە دەهاتین ودەچووین و زۆر لەقوتابیەکان نەیان دەوێرا برادەرایەتیمان بکەن، لەوە دەترسان ناویان بێتە ریزی ناوی ئێمەوە. هاوکات دەستگیرکردنی ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیانی هاورێمان و لەسێدارەدانی گەنجانێکی زۆری سلێمانی کەمێک ئێمەی ترساندبوو، بۆیە وەکو ساڵانی رابردوو بەهەڵپە نەبووین، بێگومان رۆژ لەدوای رۆژیش ژمارەی بەکرێ گیراوان و پیاوانی سیخوڕو دەستەودایەرەی دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێمی لەزیادبووندابوون شەوانە زۆر نەدەهاتینە دەرەوە، چونکە زۆربەی کۆڵان و گەڕەکەکان ماڵی پیاوانی (جەیشی شەعبی) لێ بوو، دەترسایین خەبەرمان لێ بدەن، بەڵام ئەو هاتنە دەرەوەی شەومان بەتەواوی واز لێ نەهێنابوو، بەڵکو هەر شەوێک بەباشمان بزانیایە، لەگەڵ نزارو برادەرانی ترما کۆڵانە و کۆڵانمان دەکرد... شەوێک لەوشەوانە بەرێکەوت جەیشی شەعبییەکی خەڵکی سەرچنار من و نزارو برادەرانی دیبوو، چوو بوو بەباوکمی گوتبوو: ( شێرزاد فێربووە شەوان لەگەڵ چەند گەنجێکی خراپدا! دەسورێتەوە)، باوکم ئەو رۆژە هاتەوە زۆر لێم تووڕەبوو لێی پرسیم: (بۆچی شەوان دەچیتە دەرەوە کوڕم ئەوەندە مەچۆرە دەرەوە تکات لێ دەکەم لەگەڵ ئەم سەگانەدا تووشی گێچەڵم مەکە) منیش هاوارم دەکرد: (بەس پێم بڵێ کێ پێی گوتووی بزانە چی لێ دەکەم) باوکم ئەم قسەیەی پێ ناخۆش بوو، بۆیە هێرشی بۆ هێنام و پڕ بەدەنگ هاواری دەکرد: ( بۆ نیازت وایە بیکوژیت؟!!) ئیدی لەدوورەوە دایکم وەک پیشەی هەمیشەیی لێوی لێ دەگەستم و دەیگوت: (باوکت راست دەکات کوڕی خۆم شەوانە بۆ دەچیتە دەرەوە؟!)ئیدی لەو شەوەوە ترسی باوکیشم

زیادی کرد، دەبوایە لەویش بترسامایە، ئۆقرەشم نەدەگرت، شەوانە بەبێ نزار دانیشم، بۆیە ئەو شەوانەی کە باوکم لە کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار ئیشکگر بوایە دەستبەجێ دەرۆیشتمە دەرەوە، خۆ ئەگەر باوکیشم لەماڵ بوایە، هەرشەوەی درۆیەکم بۆ ڕێک دەخست شەوێک دەمگوت کتێبم بیرچووە دەچم لای نزار دەیهێنمەوە، شەوێکی دی دەمگوت ئەو وانەیە تێ ناگەم دەچمە لای برادەرێک فێرم بکات، شەوی واهەبوو دەمگوت: دەچم سەعی بە برادەرەکانم دەکەم، ئیدی هەر چۆنێ بوو لەدانیشتنی شەوانە خۆم دانەدەبڕاند.

## ویستیان بەدرۆ شایەدی بدەم

لەدەوروبەری تاقی کردنەوەکانی نیوەی ساڵی خوێندن بوو، ڕۆژێکیان یەکێک لەمامۆستا بەعسیەکان لەسەر ڕەفتارێک کە بەداخەوە لەیادم نەماوە لەقوتابیەکی هاوڕێمانی دا، قوتابییەکە ناوی (محەمەد حەمەئەمین) بوو بە (حەمەی حەمەومینی قەساب)ناسرا بوو، ئیتر مامۆستاکە هێندە بەڕق وکینەوە لەحەمەی دا،کار گەیشتە ئەوەی لەدەرەوەی قوتابخانە توند قژی گرت و سەری دا بەدیوارێکی کۆنکرێتی دا، لەو کاتەدا خوێن لەسەری حەمە پژاو بورایەوە، من ویەک دووبرادەری تر خێرا باوەشمان بە حەمەدا کردو گەیاندمانە بنکەی تەندروستی سەرچنار، لەوێ داوای ڕاپۆرتی پۆلیسیان لێ کردین، ئەوەبوو چوینە بنکەی پۆلیسی سەرچنارو مفەوەزێکی عەرەبی لێ بوو لێکۆڵینەوەی لەڕووداوەکە کرد، ئێمەش گوتمان:ئەوە مامۆستا لێی داوە مفەوەزەکەش دەستبەجێ ڕاپۆرتێکی بۆ ئێمە نووسی و ڕاپۆرتێکیشی ناردە قوتابخانەی سەرچنار بۆ لێکۆڵینەوە لەو ڕووداوەو دواجار لیژنەیەکی تایبەتی لێکۆڵینەوە پێکهێنرا. ڕۆژی شەممەی هەفتەی داهاتوو بەیانی زوو بانگیان کردم بۆ ژووری بەڕێوەبەر بۆ لێکۆڵینەوە لەو ڕووداوە، بەر لەوەی بچمە ژووری بەڕێوەبەر مامۆستا بەعسیەکەم بینی لەبەردەرگا هەڕەشەی لێ کردم گوتی( هەر قسەیەکی خراپ دژی من بکەیت بە فەسڵ کردنت دەدەم) منیش گوێم نەدایە قسەکەی چوومە ژوورەوە بۆ بەردەم مفەوەزی پۆلیس و لیژنەی لێکۆڵینەوەی پەروەردە، مامۆستاکەش بەدوامدا هاتە ژوورەوە، یەکەمین پرسیاری

مفەوەزەکە ئەوەبوو گوتی: (تۆ بەعسیت؟)وتم (نەخێر ئینجا بەعسیەتی حەقی چیە بەسەر ئەم کێشەیەوە؟) پاشان پێیان گوتم: (سوێند بخۆ کەچیت دیوە بەراستی ئەوە دەگێریتەوە).

منیش سونێدم خواردو گوتم بەڵێ ماموستاکە سەری ئەوقوتابیەی شکاندو لەدەرەوەی قوتابخانەش لێی دا، پاشان بەمفەوەزەکەم گوت: (بەڵام ئەوەتا ماموستاکە هەڕەشەم لێ دەکات دەڵێ بەفەسڵ کردنت دەدەم) کەچی مفەوەزەکە گوتی: (بێگومان تۆ فەسڵ دەکرێیت چونکە شکاتت لەماموستای خۆت کردووە)، ئینجا وازی لەمن هێناو ڕووی کردە ماموستاکە گوتی: تۆ هەڕەشەت لێ کردووە؟ ماموستاکەش زیرەکانە بۆ حاڵی خۆی گوتی: ( کاکە گیان ئەو شێرزادە ئێوە باشی ناناسن، من دوایی پێتان دەڵێم ئەوە چی دەکات لەم قوتابخانەیەو خەریکی چ گێرە شێوێنیەکە) ئیدی من دەستم لەخۆم شت زانیم باسی سیاسەت دێنێتە پێشەوەو تووشی گێچەڵێکی گەورەم دەکات.. بۆ ڕۆژی دوایی باوکمیان بانگ کردبوو گوتوبیان: (ئەو کوڕەت ناوی کەوتۆتە ناو ناوانەوە، هەوڵ بدە تەربێتی بدەیت) دوای ئەوە فەرمانی فەسڵ کردنم لەقوتابخانەی ناوەندی سەرچناری کوڕان دەرچوو، بەم شێوەیە باجی ڕاستگۆیی خۆمم داو زۆر بەناحەق منیان لەخوێندنی ئاسایی بێبەش کرد.

# قوتابخانەی ئێواران . . .
# چۆن پەیوەندیم بەڕێکخستنەکانی پارتییەوە کرد؟

ئەوەی لەقوتابخانەی ناوەندی سەرچناری کوڕان لێی ڕوودام، خەمێکی زۆری لادروست کردم لەبەر خۆم نا، بەڵام دایکم و باوکم زۆریان خەم لە چارەنووسم دەخوارد، لەڕاستیشدا خەمی منیش زیاتر پرتەو بۆڵەی ئەوان بوو، باوکم تاڕادەیەک پێی خۆشبووکە بەو شێوەیە لە قوتابخانە فەسڵ کرام، هەمیشە پێی دەگوتم: (هەموو کات ئاوا ڕاستگۆ بە، هەرگیز هەوڵی درۆکردن مەدە، بەڵام تکات لێ دەکەم ئاگاداری ژیانی خۆت بەو گیانی خۆت بپارێزەو سەرمان بەفەتارەیەکا مەدە) بەهەرحاڵس لەبەر ئەوەی بەرەسمی لەقوتابخانە دەرکراوبووم جارێکی تر بۆم نەبوو لەقوتابخانەی ئاسایی بخوێنمەوە، بۆیە ئەو ساڵە چوومە قوتابخانەی ئێواران وساڵی ١٩٨٤ دەستم کردەوە بەخوێندن لەپۆلی دووەمی ناوەندی لە (قوتابخانەی زانستی ئێواران) ئەو قوتابخانەیە لەنزیک سەنتەری شاری سلێمانیەوە بوو لەگەڕەکی برایم پاشا، بۆیە بۆ قوتابیەکی وەکو من کەلەسەرچنارەوە دەهاتم تاڕادەیەک دووربوو، دەوامی ڕۆژانەی ئەو قوتابخانەیە لە سەعات (٣)ی عەسرەوە دەستی پێ دەکرد تاوەکو (٦) ئێوارە. سەرەتا کەشوهەوای قوتابخانەکەم کەمێک بەنامۆیی دەهاتە پێش چاو، بەڵام دواتر وردە وردە کە لێی شارەزابووم بینیم بۆ جۆش خرۆش و جوڵەو چالاکی قوتابیە نیشتمانپەوەرەکان لەناوەندی سەرچنار زۆر گەرم و گوڕترە، ئەو قوتابخانەیە دانیشتن و قسەو گفتوگۆو پیاسەی قوتابیان یەک پارچە باس باسی سیاسەت بوو، ڕۆژانە کە دەچوومە دەوام وام دەزانی دەچمە

بەرەیەکی شۆڕشگێڕییەوە، لەو قوتابخانەیە ڕێکخستنە نهێنیەکانی زۆربەی حزبە کوردستانیەکان کاریان دەکرد، بەهۆی هەڤاڵێکمەوە ئەو قوتابیانەم ناسی کە لە ڕێکخستنەکانی پارتیدا کاریان دەکرد، بۆیە بەرەسمی پەیوەندیم پێوەکردن ودەرکەوت کۆمەڵێ گەنجی زۆر ئازاو بوێرو چاونەترس وچالاک بوون، ئەوانەی لەیادم مابێ شانەکان بریتی بوون لە (شێرەی سەعە سوور، شاهۆ کە ئێستا کادیری لقی چوارە، فەرەیدون کەبە (فەرە لوت پان) ناسرابوو،شەهید (سالار محەمەد عەبدولکەریم) ئەمانە بەرەسمی ڕێکخستنەکانی پارتی بوون لەو قوتابخانەیەدا، منیش کە پەیوەندیم پێوە کردن ئەوە یەکەمین ڕۆژانی کارکردنم بوو بەڕەسمی لەو ڕێکخستنانەدا. ئەم کۆمەڵە قوتابیە زۆر پێکەوە بووین و هەرچیەکی نوێمان لەبارەی چالاکی پێشمەرگەو ڕێکخستنەکانی ناو شارو هەواڵی پیاوانی دەزگا سەرکوتکەرەکان ببیستایەو ببینیایە ڕۆژانە بۆ یەکترمان باس دەکرد، هەست و بیرێکی شۆڕشگێری کوردستانیمان هەبوو زۆرجار بەیاننامەمان هەڵدەواسی، هەندێ جار شەوان تادرەنگانێ دیواری قوتابخانەکەمان دەنوسی وبەدروشمی شۆڕشگێرانە پرمان دەکردەوە ئیدی چالاکی ترمان زۆر بوو، بەڵام حەز دەکەم ئەو ڕاستیە بڵێم کە ئەو دیوار نووسینە بەفەرمانی سەروخۆمان نەبوو، بەڵکو زۆربەی جارەکان خۆمان سەربەخۆ ئەو دیوارانەمان دەنووسی و مەبەستیشمان ئەوەبوو کە خەڵک هەمیشە ورەی بە بەرزی بمێنێتەوەو دڵنیابێ کە شۆڕش و کوردایەتی و پارتایەتی بەردەوامە، ئیدی من و هەڤاڵانم ئەو کاتە بەو شێوەیە بیرمان دەکردەوە، چونکە وەک باسم کرد ئێمە زیاتر هۆشیاریی شۆڕشگێریمان هەبوو، دەمانویست بەهەر شێوەیەک بێت بۆ دەزگا سەرکوتکەرەکان بسەلمێنین کە تاوەکو ئێستاخەڵک هەیە دژیان وەستاوەو حوکم و دەسەڵاتی ئەوان بەهەموو شێوەیەک ڕەت دەکاتەوە، ئەگەرچی ئەو ساڵە یەکێتی نیشتمانی کوردستان وەک حزبێک، بە سەرکردایەتی و سەرجەم کادیرو چەکدارەکانیەوە هاتنەوە ناوشار، بەڵام لەژێر پەردەی وتوێژدا ماوەیەک لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا تەبا مانەوە، وەلێ دوای ئەوەی حکومەتی بەعس ئامادەنەبوو هیچ خواست و داوایەکیان بۆ جێبەجێ بکات بەناوی دانوستانەوە بەناچاری ڕوویان کردەوە شاخ. ئێمە ئەو دەمە وەکو

ڕێکخستنەکنی پارتی لەچالاکی خۆمان بەردەوام بووین. من دەمزانی هەڤالانم چالاکی زۆر گرنگترو کاریگەر تریان هەیە لەناو شاردا، بەڵام لەبەر سێ هۆ منیان لێ دوورە پەرێز گرتبوو.

یەکەم: لەبەر ئەوەی من تازە دەمناسین وپەیوەندیم پێوەکردبوون.

دووەم: من لەچاو ئەواندا منداڵ و کەم ئەزموون بووم دەترسان بکەومە هەڵەوەو ئاشکرابین.

سێیەم: سروشتی کارکردن لە ڕێکخستنە نهێنیەکانی پارتیدا بەو شێوەیە بوو، هەتا ئەندامێک ماوەیەکی زۆر لەگەڵیاندا نەبوایەو ئەزمونی تەواوی وەرنەگرتایە داخڵی چالاکیە گەورەکانیان نەدەکرد، وردە وردە ڕێکخستنە چالاکەکانی ناوشارمان ناسی هەندێ جار هەرلەنێو قوتابخانە بەنهێنی کۆبوونەوەمان دەکرد، بەرپرسی ئەو شانەیەی منی تێدا ئەندام بووم (شەهید سالار محەمەد عەبدولکەریم) بوو سالار وەکو نزار وابوو لە ئازایەتی و بوێریدا کەم وێنە بوو، هاوڕێیەکی دڵسۆز بوو، کوڕی تەنگانە و لێ قەومان بوو، ئیدی زۆر بەپەرۆشەوە بووم لەچالاکیەکی گەورەدا بەشداری بکەم، زۆر جار داوام لەسالار دەکرد کە بەشداریم لە چالاکیە تایبەتیەکاندا پێ بکات، لەهەندێ کۆبوونەوەدا ئەو داوایەم دەخستە ڕوو، سالاریش وەک گەنجێک کە خەسڵەتێکی زۆری پێشەوایەتی تێدابوو، هەموو جارێک دەیگوت: (بەسەرچاو ئەمە شۆڕش و خەباتەو مولکی کەسمان نییە، هەموومان حەقی ئەوەمان هەیە بەشداری تێدا بکەین، ئەم خەباتەی ئێمە لەپێناو ئازادی و سەرفرازی خەڵکی کوردستاندایە، بەڵام تکاتان لێدەکەم پەلەم لێ مەکەن بەڵێنتان دەدەمێ فریای هەموو شتێک بکەوین)، سالار زۆر مەراقی گوێگرتن بوو لەرادیۆی دەنگی کوردستانی عێراق زۆر بەوردی گوێبیستی دەبوو یەک وشەی لەکیس نەدەچوو زۆرجاریش رادیۆیەکی بچووکی لەگەڵ خۆی دەهێنا بۆ قوتابخانە، شەوێکیان هەر لەنزیک قوتابخانەی خۆمان لەکۆڵانێکدا، سالار و چەند هەڤاڵێکی تر لەبەردەمماڵێکدا گوێیان بۆ رادیۆی دەنگی کوردستانی عێراق هەڵخست و بەمن و چەند هەڤاڵێکی دیکەیان گوت ئێوە لەسوچی کۆڵانەکەدا پاسەوان بن، ئەگەر کەسێک هات ئاگادارمان بکەنەوە وەختێکمان زانی یەکێک لەپیاوانی گەڕەک هاتە دەرەوە و هاواری

کرد: (شەرت بێ ئێستا تەلەفۆن بۆ ئەمن بکەم و هەمووتان بە گرتن بدەم).
پیاوەکە بەعسی بوو خەریک بوو بچێن بۆی و هەڕەشەی لێ بکەین، بەڵام گوتمان نەوەک سبەی بمانناسێتەوە، بۆیە لێی بێ دەنگ بووین وبڵاوەمان لێ کرد، ئیدی زۆربەی شەوەکانمان بەم شێوەیە بەسەر برد بێگومان شەوانە کە درەنگ دەڕۆیشتمەوە سیناریۆیەکی درۆ لەنێو گیرفانما ئامادە بوو، بۆ ئەوەی قەناعەت بەباوکم و دایکم بهێنم کەبۆچی لەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە دواکەوتم، تا لەو سەروبەندەدا ڕەشبگیرییەکی یەکجار بەرفراوان دەستی پێ کردو بەجارێ هەزاران گەنج دەخرانە زیندانە تاریکەکانی ڕژێمی عێراقەوە.

## خۆ پیشاندانەکانی قوتابیانی سلێمانی

بەهاری ساڵی ١٩٨٤ بوو ژمارەیەکی زۆری قوتابیانی سلێمانی کە لەزانکۆکانی سەلاحەددین و موسڵ و بەغدا دەیانخوێند، لەبەر ئەوەی بەشداری مەشقی سەربازی و خولی (جەیشی شەعبی)یان نەکردبوو لەزانکۆ دەرکرابوون، ئیدی هەوڵێکی زۆریان دا بیانگەڕێننەوە، بەڵام بێ هودە بوو، بۆیە دواجار گەڕانەوە سلێمانی و خۆپیشاندانێکی گەورەیان سازدا پاشان هەموو شاری گرتەوە.
ئەو بەیانییە شار شڵەژابوو لەهیچ شوێنێکدا هیچ دیمەنێکی ئارامی لەو بازاڕو کوچەو کۆڵانەدا هەستی پێ نەدەکرا، بۆ هەر لایەک دەڕۆیشتی دەستەدەستەو کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵک گرمۆڵەیان خواردبوو، بۆیە هەر ئەو ڕۆژە سەعات (١٠)ی سەر لەبەیانی وەک ئەو کات لەسلێمانی دەیانگوت: (قلیشایەوە)زاراوەیەک بوو لەسەرەتای ساڵانی هەشتاکان لەنێو خەڵکی سلێمانیدا بڵاوبۆوە، ئەویش کاتێ ڕووداوێک لەنێو شاردا لە دژی ڕژێمی ڕووی دەداو پیاوانی دەزگا سەرکوتکەرەکان پەلە پروزێیان پێ دەکەوت. بەڵێ ئەو بەیانییەش قڵیشایەوە خۆ پیشاندانەکان لەشەقامی مەولەویەوە لەلایەن قوتابیە دەرکراوە کوردەکانی زانکۆکانی موسڵ و سەلاحەددین و بەغداوە دەستی پێ کرد، پیاوانی پۆلیس و ئەمن و جەیشی شەعبی بەجارێ کەوتنە گیانی خەڵک و تەنانەت بەکلاشینکۆف و بیکەیسی خەڵکیان گوللەباران دەکرد، ئێمەش تێکرای هەڤاڵانمان لەنێو

خۆپیشاندانەکاندا بووین، لە هەر جێیەک خۆپیشاندان کڵپەی بسەندایە ئێمە لەوێ بووین. ئەو خۆپیشاندانانە لەدژی دامودەزگاکانی ڕژێم بەردەوام بوو قوتابیان ڕۆڵێکی بەرچاوو سەرەکیان گێڕا لەو خۆپیشاندانەدا کە پتر لە ڕۆژێکی خایاند،حکومەت تا دەهات پیاوانی دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی زیاتر بەگژ خەڵکیدا دەکردو ڕەشبگیرییەک دەستی پێ کرد ئەو سەری دیارنەبوو، چەکدارو سیخوڕەکانی حکومەت لە هەر شوێنێک قەرەباڵغیان ببینیایە تێکڕای ئەو خەڵکەیان دەپێچایەوە ئەو ڕۆژە من و شێرەی سەعە سوورو سالارو کاروانی حەسەن مارگر، پێکەوە لەنێو خۆپیشاندانەکان بووین، خۆپیشاندانەکان گەیشتبووە دەوروبەری گەڕەکی ئیبراهیم پاشا، لەسەر شەقامی ئیبراهیم پاشا ئۆتۆمبێلێکی(موسەلەحە)مان بینی ڕاگیرابوو دەستبەجێ هێرشمان کردە سەری و ئاگرمان لە ئۆتۆمبێلەکە بەردا، ئیدی حکومەت هێزێکی زۆری خستە نێو ئەوگەڕەک و شەقامانەو بەزەبری دەستڕێژو گوللەباران بڵاوەیان بەخۆپیشاندانەکە کرد. لەترسی پیاوانی دەزگا سەرکوتکەرەکان هەریەکەو خۆی دەکرد بە کوچەو کۆڵانێکدامن لەگەڵ ئەو سێ کەسەی کە باسم کرد پێکەوە خۆمانکرد بەماڵێکدا لەگەڕەکی برایم پاشا، هەر لەدەرگاوە پیرەژنێکی نورانی و ڕوح شیرین بەزەردەخەنەوە هات بەرەو پیرمان (دوایی بۆمان دەرکەوت ئەو پیرەژنە دایکە شەهید بوو).

بەهەر حاڵ کەبەوردی سەرنجمان دا بینیمان (٦-٧)گەنجی تر هەر لەماڵی ئەو پیرە ژنە خۆیان حەشار داوە، پیرەژنەکەش بەدەم و لەبزێکی شیرینەوە پێی گوتین:( فەرموون کوڕی خۆم.. بەقوربانتان بم، وەرنە ژورێ ئەمڕۆ ڕۆژی کوردایەتی و مەردایەتیە) پاش کەمێک سفرەی بۆ هەمووان ڕازاندەوە برنج و فاسۆلیایەکی خۆشی هێنایە بەردەمان، ئەوە یەکێک بوو لەو خواردنە هەرە خۆشانەی کە هەتا لەژیاندا مابم بیرم ناچێتەوەو تاوەکو ئێستا تاموچێژی لەناو دەمدا ماوە، هەڵوێستی ئەو پیرەژنە زۆر بەختەوەری کردین، ئەوەندەی تر هانی داین کە لەسەر ئەو ڕێبازو بیرکردنەوەیە بەردەوام بین. بەهەرحاڵ دەوروبەری سەعات (٤)ی عەسر، یەک یەک لەماڵی پیرەژنەکە دەهاتینە دەرێ و هەریەکەو بەرەو ماڵی خۆیان ملی دەنا، بەڵام من کاتێ هاتمە دەرێ سەیری ئاوباڵای خۆمم کرد تەماشا دەکەم جل و بەرگەکەم سەراپا ڕەشی تایەی سوتاوە

و بۆن ئاگرو دوکەڵێکم لێ دێ هەر کەسێبی بینیمایە دەیزانی من لەخۆپیشاندانەکاندا بەشدار بووم، بۆیە لەترسی خەڵکی گەڕەک و بەتایبەتی لەبەر دڵی دایکم و باوکم نەم وێرا بچمەوە سەرچنار، راست بەرەو ماڵی مامە نەجیبم لەداروغا بەڕێ کەوتم و شەو لەوێ خۆم شت و جل و بەرگم خاوێن کردەوە ئینجا بۆ سبەی چوومەوە ماڵەوە، ئیدی لەوێ بەزمی لێکۆڵینەوەی باوکم و دایکم دەستی پێ کردو پرسیار بارانیان کردم.

## بەرەو پێشمەرگایەتی

رۆژانی دوای ئەو خۆپیشاندانانە سلێمانی بۆنی خوێنی لێ دەهات، بۆ هەر شەقام وسەری کۆلانێک دەرۆیشتین پیاوانی دەزگا ئەمنیەکانی حکومەت دوو دوو سێ سێ وەستابوون، زۆربەی شەقامە سەرەکیەکانی بازاڕ ئۆتۆمبێلی مسەلەحەو کۆمەڵێ چەکداری لێ بوو، ڕەشبگیری فراونتر بوو شەوانەو ڕۆژانە دەیان گەنجی ئەو شارە بەکۆمەڵ دەگیران و کەس نەیدەزانی بەرەو کوێیان دەبەن!! ئێمەش لەنێو قوتابخانەدا ڕۆژانە هەواڵی نوێمان دەبیست، هەر ڕۆژەی هەڤاڵێکمان دەگیرا، لەراستیدا ترسمان لێ نیشتبوو، وەک هەموو جارێکیش دووپاتی دەکەمەوە ترسی ئێمە لەسەرو گیانی خۆمان نەبوو، چونکە ئێمە لەمێژبوو دەستمان لەخۆمان شتبوو، بەڵام زیاتر خەمی مەینەتی و ئازاری دایک وباوکمان بوو، دەترساین بەئاشکرا بوونی ئێمە ئازاری ئەوان بدەن، قوتابخانەی زانستی ئێوارانیش وەک پێشتر باسم کرد، وەک مەڵبەندێکی شۆڕشگێڕی وابوو تەنانەت تاقە مامۆستایەکی بەعسیشی تێدا نەبوو، هەموو مامۆستاکانمان خەڵکانێکی کورد پەروەرو نیشتمان پەروەر بوون، بۆیە بیروهزری شۆڕشگێڕی و گیانی خەباتکاری ڕۆژبەڕۆژ لەنێو ئەو قوتابخانەیەدا لەپەرەسەندندا بوو، لەکۆبوونەوەو چپە چپ و چالاکی خۆمان بەردەوام بووین، هەموو شەوێک درەنگانێ دەگەڕامەوە ماڵەوە .کەش و هەوای سیاسی سلێمانی تادەهات ترسناکتر دەبوو، بەشێوەیەک دەنگۆی ئەوە بڵاوبوو بۆوە گوایە ئەوانەی لە خۆپیشاندانەکاندا بەشداربوون وێنەیان گیراوە و یەک یەک دەگیرێن. زەمەن گەیشتە مانگی (١٢)ی ساڵی ١٩٨٤، شەوێکیان دوای

تەواوبوونی وانەکانی ئەو ڕۆژە هەر لەبن دیوارێکی قوتابخانەدا (سالار) بەرپرسی شانەمان کۆبوونەویەکی پێ کردین، ئامادەبووان (من و کاروان و فەرەلوتپان و بێستون) بووین سالار لەو کۆبوونەوەیەدا باسی ئەوەی کرد کە هەڤاڵەکانمان زۆربەیان گیراون لەوانە (نزار سەرسپی، ئاسۆ عەلی نەجار،ئەرسەلان قرگەیی، کەمال کەلان، شەهید سالح) بۆیە ئەگەری ئەوە هەیە ئاشکرا بووبین، ئەوەبوو لەکۆتایی کۆبوونەوەکەدا تێکرا لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە بۆ ماوەیەک لەنێو شار دوورکەوینەوە بۆ ئەوەی لەبەر چاوان!!! خۆمان بزر کەین، ئەوەبوو بڕیارماندا ئەو پێنج کەسەمان بۆ سبەی سەعات (٧)ی بەیانی زوو لەنزیک شوقەکانی سابونکەران یەکتری ببینین و بەرەو ئەو ناوچانە بڕۆین کە پێشمەرگەکانی پارتیمانی لێیە.

ئیدی ئەو شەوە گەڕامەوە ماڵەوە هەندێ کەلوپەلی پێویستم ئامادەکرد، ئەو شەوە هەر بیرم دەکردەوە ،لەلایەکەوە دڵم زۆر خۆش بوو چونکە ئەوە خەونە پیرۆزەکەی منداڵیمە وا خەریکە دێتەدی، لەدڵی خۆمدا دەمگوت: (تەواو ئیدی شێرە مەسیحی دەبێتە پێشمەرگە.. تەواو ئیدی منیش وەک کەسانی شۆڕشگێر و ئازادیخواز ڕوو دەکەمە چیاو چەکی پێشمەرگایەتی دەکەمە شانم) هەندێ جار بیرم لەتەمەنی خۆم دەکردەوە ئاخر ئەو کاتە هێشتا هەرزەکارێکی تەمەن ١٦ ساڵ کەمتر بووم لەناخەوە لەخۆمم دەپرسی: ( خۆ من هێشتا منداڵم تۆ بڵێی پێشمەرگەکان من قبوڵ بکەن و چەکم بدەنێ) تەواوی ئەو شەوە بۆ چرکەیەک خەوم لێ نەکەوت، خەمی ئەو دایک و باوکە بێ دەسەلاتەشم بوو، زۆرم خۆش دەویستن دەترسام ئیدی ببڕاو ببڕا نەیانبینمەوەو ئەمە دوا شەو بێ کە لەگەڵیاندام پتر لە جارێک دایک و باوکم ماچ کرد، دایکم دوو سێ جار لێی پرسیم: (چیتە کوڕی خۆم بۆ خەوت لێ ناکەوێ؟) هیچ وەڵامم نەدایەوە بۆ سبەی سەعات (٥ر٦)ی بەیانی زوو بەبێ ماڵئاوایی بە بێ ئەوەی بەکەس بڵێم و کەس ئاگای لێ بێت، ماڵم بەجێ هێشت ودەوروبەری سەعات (٧)لای شوقەکانی سابونکەرانەوە دەرچووین و پێکەوە لەگەڵ کاروان و سالار و فەرهاد و بێستوون دا چووینە گەراجی ئۆتۆمبێلەکانی قەڵاچوالان، ئەو ڕۆژە زۆر ئاسودە بووم دەستێ جلی کوردیم لەبەرکردبوو نزیکەی (٣٠)دینارم لەگیرفاندا بوو، لەوێ لەنەقلیات چووینە ناو پاسێکی (١٨)

نەفەری (مارسیدس)ەوە و بەرەو قەلاچوالان بەڕێ کەوتین، چەند جارێک لەبازگەکانی ڕێگا لێیان دەپرسین بۆ کوێ دەچن؟ ئێمەش هیچ خۆمان تێک نەدەدا بەبێ ترس دەمانگوت بۆ قەلاچوالان گەیشتینە ئەوێ ولەنێو بازاڕی قەلاچوالان لەسەر داوای سالار جووتێ پێلاوی لاستیکم کڕی و لە پێم کرد، ئینجا دیسان بە پاسێکی تر چووینە چوارتاو لەوێوە بەهەمان شێوەبە ئۆتۆمبێلێک خۆمان گەیاندە کەناروێ.. لەکەناروێ چووینە مالی هەڤالێکی پارتی دیاربوو سالاریان باش دەناسی وئەوانیش سەر بە ڕێکخستنەکانی پارتی بوون، ئەو پیاوە مەڕومالەتێکی زۆری هەبوو هاوکات شوانی تایبەتی هەبوو، ئەوەبوو لەگەڵ شوانەکەیدا ناردینیە مالی هەڤالێکی ترو چەند ساتێک لەوێ ماینەوەو، پیاوی خاوەن مالّ بەتەواوی شارەزای ناوچەکەبوو ئیدی پێشمان کەوت و گوتی خۆم لەگەلّتان دێم، چونکە لەسەر ڕێتان کەتیبەیەکی مەدفەعی حکومەت هەیە نەبادا ڕێتان لێ بگرن. ئەوەبوو پێ بە پێ دوای چاوساغەکەمان کەوتین، وەختێ نزیک بووینەوە لەکەتیبەکە ئەو پیاوە پێی گوتین: (کوڕینە ئێستا بەبێ ئاوڕدانەوەو خۆشلەژاندن بەلای ئەم کەتیبەیەدا ڕەت دەبین ئەگەر هات و تەقەیان کرد حەقی منتان نەبێ ئێوە هەر بەرەو پێش ڕابکەن و من بۆ خۆم دەگەڕێمەوە ئیتر مەترسیتان لەپێش نامێنێ) ئەوەبوو بەسەلامەتی کەتیبەی مەدفەعیەکەمان بەجێ هێشت و کابراش خواحافیزی لێ کردین و بەرێگەیەکی تردا گەڕایەوە. لەوەبەدواوە سالارو فەرهاد شارەزای ڕێگەکەبوون دیاربوو ئەوە یەکەم جاریان نەبوو بێنە ئەو ناوچەیە، ملی ڕێیان گرت بەپێ تا ئەو کاتەی گەیشتینە گوندی (کۆزێ) ئەو ڕێگەیە هیچ بازگەو ڕەبیەی حکومەتی لێ نەبوو تەنیا هەندێ ڕەبیەی سەربازی بەلوتکەی شاخ و سەری گردەکانەوە بوون لەوێوە بەرەو (کەوانە دۆڵ) بەڕێ کەوتین، زستانێکی سەخت بوو، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە بەفر دەباری و شاخ و چیاو دۆلّ و گردو چەم یەک پارچە بەفر داپۆشیبوون، بەلام ئەو گۆرانیە خۆشانەی کاروان لەرێگە بۆی دەگوتین سەرماو تۆفان و ماندوو بوونی لەبیر بردینەوە، بەفر تا سەر ئەژنۆمان هاتبوو فەرە لوتپان هەر جار ناجارێ بەدەم ڕۆیشتنەوە دەیگوت:( کوڕینە ڕەنگە گورگ بمانخوات) گەیشتینە چەمێک لەقەراغ ئەو چەمە کەمێک دانیشتین.. پێشتر لەکەناروێ یەکی

نەفەریک کەبابمان کربوو لەجانتاکانمدا بوو لەوێ کەبابەکەمان خواردو ئێوارەمان لێ داهات، ئاسمان تاریک بوو، بەڵام لەبەر سپیایی بەفر هێشتا ئەو ناوچەیە رۆشن بوو، هەر بەپێ بەچەمەکەدا پەرینەوە تا سەرسنگمان ئاو هات، کە لەچەمەکە هاتینە دەرەوە سەرما لەو ئا بالاتەرەی دەداین، هێندە سەرمام بوو وەخت بوو بیر لەگەرانەوە بکەمەوە چونکە بەراستی بۆ هەرزەکاریکی وەکو من ئەو سروشتە سەختە ئەزنۆ شکێن بوو، بەڵام هەموو جارێ کە خەیاڵی خۆشی پێشمەرگایەتی لەکەلەمی دەدا ئیدی هەموو ئازاریکم بیر دەچۆوە لەرۆیشتندا گورج دەبوومەوە ئەوەبوو گەیشتینە کەوانە دۆڵ، فەرهاد لەدوورەوە بە ئەنگوست بەرزاییەکی پیشان داین و گوتی: ( ئەوبەرزاییە گلکۆی شێخێکی لێیە،ئیدی لەوێوە گوندی چاڵە خەزێنە دیارە لەوێ پێشمەرگەی لێیە ) ئەو قسەیەی فەرهاد هانی داین هەنگاوەکانمان خێراتر بکەین و بەگورجی بە بەرزاییەکەدا سەرکەوتین تا گەیشتینە گلکۆی شێخەکە. ئیدی لەنزیک گلکۆکەوە تەماشامان کرد گوندی (چاڵە خەزێنە) دیاربوو لەو کاتەدا لەدڵی خۆمدا دەمگوت:( هەی ئافەرین پێشمەرگە، وەرە لەم بنی دنیایەوە بگەیتە ناو شار بۆ چالاکی ) ناوی پێشمەرگە هێندەی ترلام پیرۆزو بەرزتربوو..تەواو ئیتر ئەمە ئەم رۆژەیە کە لەمنداڵییەوە خەونم پێوە دەدی، ئەمە ژیانی پێشمەرگایەتیە. زوو زوو لەبەرخۆمەوە لەگەڵ خۆم دەدوام(شێرازد خۆت گورج و گۆڵ کەرەوە ئیدی تۆ بووی بە پێشمەرگە ) هەندێ جاریش بیرم لەروخسارە قێزەونەکانی پیاوانی بەعس دەکردەوەو دەمگوت:( ئای چرچاوە نەگریسەکان ئیتر چیتان لەدەست دێ بیکەن، تەواو من لێتان یاخی بووم ،دەبێ واتان لێ بکەم لەماڵی خۆشتاندا نەوێرن بەبێ خەم سەربنێنە سەرسەرین، شەرت بێ ئەگەر بۆم بلوێ نەیەڵم چیتر خاکی ئەم کوردستانە گلاو کەن) ئیدی بەدەم ئەم بیرکردنەوانەوە لەبەرزاییەکەوە بەرەو گوندی چاڵە خەزێنە بەرێ کەوتین. دنیا تەواو تاریک بوو چیتر تارا بەفرینەکان دەرەقەتی تاریکایی شەویان نەدا، ئێمە بەرەو تروسکاییە کزەکانی چرای ماڵانی گوند هەنگاومان دەنا، هەر پاش چەند دەقیقەیەک رۆیشتن لەهەموو لایەکمانەوە دەنگی راکێشانی میلی کلاشینکۆف رای چڵەکاندین، دەنگێک لەتاریکیەکەوە هاواری کرد (کێی زەلام؟!) فەرهادیش بەدەنگێکی بەرز گوتی

حۆمانین(دێزە)، تومەس (دێزە)ووشەی نهێنی نێوانیان بوو ئیدی چەند لایتێکیان لێ داین و لێمان هاتنە پێشەوە کە بینیم مەفرەزەیەکی پێشمەرگەبوون، فەرماندەی مەفرەزەکە شەهید (فەرەی مامە عەبە)بوو کەمن ئەو کات نەمدەناسی فەرهاد وسالار بەیەکتریان ناساندین بە فەرەی مامە عەبەیان گوت: (ئەوە شێرە مەسیحیە کە بۆمان باس کردی) ئیدی زۆر بەگەرمی باوەشی پێدا کردم و چەند جارێک ماچی کردم.. ئەوەبوو لایتیان لەبۆسەکانی دیکەی پێشمەرگەداو لەگەڵماندا بەڕێ کەوتن. ئێستاش نازانم چۆن گوزارشت لەخۆشی ئەو شەوە بکەم خەریک بوو لەخۆشیا باڵ بگرم، وام هەست دەکرد دەسەڵاتم بەسەر هەموو دنیادا دەشکێ، سەراپا گیانم بوو بوو بەهێز سەرماو ئازارو برسێتی ڕێگامان بیر چۆوە، لەمن وابوو بەردو دارو درەخت و ڕەزو کانی و شاخ وچیا و دۆڵی ئەو ناوە تێکڕا پێکەوە چەپڵەی ئافەرینم بۆ لێ دەدەن... لەبیریشم نەچێ کەبەدرێژایی ئەو شەوە حکومەتی عێراقی تۆپبارانی ئەو ناوچانەی دەکردو گرمەو لورە لوری گولە تۆپ بەسەر ئێمەدا دەرۆیشت، هەر ئەو شەوە گەیشتینە گوندی چاڵە خەزێنە.

## گوندی چاڵە خەزێنە

ئەوکات بارەگای لقی چواری پارتی دیموکراتی کوردستان لەسورێن بوو، کاک نادر هەورامی بەرپرسی لقی چوار بوو، بارەگای لیژنە ناوچەکانی سنووری لق بە ناوچەکانی دەوروبەری سلێمانیدا بڵاوبوو بوونەوە، بۆ نموونە لەسنووری ناوچەی شارباژێڕ چەند گوندێک ئاوەدانبوو لەوانە هەردوو گوندی چاڵە خەزێنەو چنارەی شێخ لەتیف، لەگوندی چاڵە خەزێنە بارەگای لیژنەی ناوچەی چوارتاو لیژنەی ناوچەی دوکانی لێ بوو، لەچنارەی شێخ لەتیفیش بارەگای لیژنەی ناوچەی پێنجوێنی لێ بوو شەهید شەریف سەعید ناسراوە بە (شەفە کەچەڵ) بەرپرسی ناوچە بوو، هەروەها بەرپرسی لیژنەی ناوچەی چوارتا کاک دەروێش ئاغا و بەرپرسی ناوچەی دوکان شەهید خاڵە عەفان بوو،، گوندی چاڵە خەزێنە لەنزیکەی ٣٠ ماڵ پێک هاتبوو، یەکێکە لەگوندە خۆشەکانی سنووری قەزای چوارتا. ئەو کات شەهید عەبدوڵلا ئاغا کارگێڕی لق و بەرپرسی بەشی عەسکەری بوو، لەناو

گوندی چاڵەخەزێنەدا پتر لە (٢٠٠) پێشمەرگەی تێدا بوو، کاک حەمە یادگار فەرماندەی هێزی چوارتاو شەهید فەرەی مامە عەبەش ئامر کەرت بوو لەبەتالیۆنی (٢)ی هێزی چوارتا، بەهەر حاڵ کە گەیشتینە گوندی چاڵە خەزێنە، ئەو کات لەسەرەتای گوندەکە نزیکەی (٦-٧) ماڵێک لەسەر ڕێمان بوو پاشان بەرەو ژوور ڕۆیشتین و گەیشتینە چەند ماڵێکی تر کە بریتی بوون لەبارەگاکانی پێشمەرگە خۆمان کرد بە یەکێک لەو بارەگایانەدا لەدوورەوە دەنگێک هاواری کرد: (بەخێر بێن) کە تەماشام کرد پیاوێکی کامڵی قۆزو روح شیرین بوو، جلوبەرگ و قەمسەڵەیەکی خاکی لەبەردا بوو ، فیشەکدان ودەمانچەی لە پشتێنەکەی بەستبوو، رادیۆیەکی بەدەستەوە بوو دوو پێشمەرگەش لە تەنیشتیەوە وەستا بوون، پێ دەچوو فەرمانەدەی پێشمەرگە بێت، ئێمەش وەڵامان دایەوە (خۆش بی یاخوا زۆر سوپاس) ئیدی کە زیاتر لەیەکتر نزیک بووینەوە، فەرەی مامە عەبە ئەو پیاوەی پێناساندین و گوتی: (ئەوە کاک دەروێش ئاغایا) ئەویش باوەشی پیاکردین و زۆر بەگەرمی دووبارە بەخێرهاتنی کردین، کە بینی ماندوو دیارین و ئاو باڵامان تەڕو قوڕاویە فەرمانی دا خێرا ئاومان بۆ گەرم بکەن و جلوبەرگمان بدەنێ، ئینجا پێی گوتین(بڕۆن ساتێک حەوانەوە وەربگرن و پاشان دەتان بینم) ئەوێمان بەجێ هێشت و چووینە بارەگایەکی تر و ئاوی گەرمیان بۆ هێناین و جلوبەرگمان گۆڕی، هەر لەو بارەگایە چووینە ژوورێ کەوە کۆمەڵێک پێشمەرگە لەدەوری زۆپایەکی دار دانیشتبوون، شەهید خاڵە عەفان( عوسمانی قادر منەوە) قسەی خۆشی بۆ دەکردن و پێشمەرگەکانیش تێکڕا بە قسەو نوکتە خۆشەکانی خاڵە عەفان پێدەکەنین.

خاڵە عەفان پێشمەرگەیەکی ئازاو قارەمان بوو، لەنێو پێشمەرگەدا زۆر خۆشەویست بوو ئێمە لەناو شار زۆرمان بیستبوو لەسەر ئازایەتی و نەبەردی خاڵە عەفان ،بۆیە ئەو ڕۆژە کە بە خزمەتی گەیشتین زۆر ئاسوودە بووم لەو ژوورە ڕێزێکی زۆریان لێ گرتین، چەند پێشمەرگەم دەبینی سەد ئەوەندە ورەم بەرز دەبۆوە، پاش چەند دەقیقەیەک سفرەیەکیان لەبەردەماندا راخست و پێشمەرگەیەک قاپێکی گەورەی هێنا پێنج گیپەی تێدا بوو ئیتر مەگەر خودا بزانێ ئەو گیپەیە چەند خۆش و بە چێژ بوو، بەتایبەتی دوای

ئەو هەمـوو برسیەتی و مـاندووبوونە، دوای ئەوە سەرو پەرداخێک چامان خواردەوە. لەراستیدا لەمێژبوو فێری جگەرەکێشان بوو بووم بەدرێژایی ئەو رێگایەش دوو پاکەتم پێ بوو تەواوم کرد، دوای نان خواردنی ئەو شەوە زۆر حەزم لەجگەرە بوو، بەڵام شەرمم دەکرد داوای جگەرە لە پێشمەرگەکان بکەم. کەچی فەرەی مامە عەبە دەتگوت لەدڵمایە هەر لەخۆیەوە پاکەتێکی سۆمەری دەرهێناو پرسی:( جگەرە دەکێشی؟) گوتم بەڵێ ئیدی پاکەتەکەی دامێ و دوای ئەوە مـاوەیەکی زۆر باسی پێشـمـەرگـایەتی بۆ کـردین و ئامۆژگاری زۆر کردین بۆ ماوەی سەعاتێک زیاتر چەندین وانەی بەنرخ و بە پێزی سەبارەت بە کوردایەتی و ئازادیخوازی بۆ گوتینەوە. پاش ماوەیەکی کەم بانگیـان کـردینە بارەگـای سەرەوە لەوێ کـاک دەروێش و کـاک حەمـە یادگـاری برای و چەند پێشـمەرگەیەک دانیشـتبـوون، بەراستی رێزێکی زۆریان لێ گـرتین بۆیە هێندەی تر ورەم بەرزتر دەبۆوەو حـەمـاسم بۆ پێشمەرگایەتی بەکوڵتر بوو، کاک حەمە یادگار قەڵەمێکی بەدەستەوە بوو شتی دەنووسی، یەکـە یەکـە چەند پرسـیـارێکی لێکردین لە یەکـێک لەپرسیارەکاندا بەمنی گوت: چۆن بوو بڕیارت دا بێیتە ئێرە؟ گوتم(ئەگەری ئاشکرابوونی ناومان لەئارادا بوو ترساین دەسگیرمان بکەن) پاشان کاک حەمـە یادگـار سـەیرێکی قەدو باڵای کردم و گـوتی:(تۆ ئاخر زۆر منداڵی پێشمەرگایەتیش گاڵتە نییە، کارێکی قورس و گرانە من لەو بڕوایە دام تۆ بەم تەمـەنەوە لەناو شـاردا زیاتر سـودت لێ دەبینرێت مـادام قـوتابی بیت حەق وایە لەخوێندن بەردەوام بیت).

هەرچەندە لەم قـسـانەدا کـاک حەمـە یادگـار نـاحەقی نەبوو، چونکە من لەچاو ئەواندا یەکجار منداڵ بووم، بەڵام بەراستی کەمێکم دڵگرانی کردم، بۆیە بەخەمـێکەوە گـوتم: (من هاتووم ببـمە پێشـمـەرگە لای ئێوە، ئەگـەر قـبـوڵم ناکـەن دەچـمەوە لای کـاک فـرەنسـۆ هەریری ئەو خزمانە لەوێ دەبمە پێشمەرگە) ئیدی کـاک دەروێش ئاغا بە پێکەنینەوە گوتی: (ئێ زۆر باشە دەتنێـرینەوە لای کـاک فـرەنسـۆ هەریری پاشان کـە گـەورە بوویت بوویتـە پێشـمـەرگـەیەکی ئازاو نەبەرد دەتهـێنینەوە لای خـۆمـان)، بەهەر حـاڵ ئەو قسـەیەی کـاک دەروێش لەبابی سوعبەتەوە بوو، ئیدی پاش گـفـتوگـۆیەکی زۆر کاک حەمە یادگار گوتی: (بائارەزووی خۆت بێت، بەڵام دڵنیام ئەگەر

دایک و باوکت هاتن بەشوێنتا دەبێت بڕۆیتەوە بەراستی هێشتا منداڵیت و ئەزموونت کەمە ئێمە حەز ناکەین منداڵی وەکو تۆ واز لە خوێندن و قوتابخانە بهێنێت)، ئەوە بوو پاش ئەوە بڕیارم دا بمێنمەوە، حەزم نەدەکرد کەس بزانێ من لەناو ئەم گوندەدام، دەترسام باوکم و دایکم پێی بزانن و بێن بەشوێنما، بەهەر حاڵ تاوەکو حەفتەیەک خۆم بەخوێندنەوەی هەندێ کتێب لەبارەی پەیڕەوو پرۆگرام و مێژووی پارتیەوە خەریک کرد، وردە وردە فێربووم لەگەڵ پێشمەرگەکاندا دەچوومە دەرەوە، بەڵام هێشتا چەکیان نەدابوومێ لەبەر منداڵیم، پاش یەک دوو ڕۆژ چوومە لای کاک حەمە یادگارو داوای چەکم لێ کرد بۆ ئەوەی وەک پێشمەرگەکانی تر پاسەوانی و ئێشک بگرم.. ئەوە بوو بۆ ڕۆژی دوایی چەکی دامێ و نیوەڕۆیەک (شەهید عەبدوڵڵا ئاغا) هاتە ئەوێ و کۆبوونەوەی بەناوچە کردو لەگەڵ پێشمەرگە تازەکانی وەکو ئێمەدا بەیەکتریان ناساندین و پاشان وەکو پێشمەرگە ناومان تۆمار کرا .هەمان شەو پاسەوانیم گرت،بەڵام چۆن پاسەوانیەک! دوایی بوو بوومە مایەی نوکتەو پێکەنینی پێشمەرگەکان، چونکە ئەو شەوە هەر نەفەرێک بچوایە بۆ مزگەوت هاوارم دەکرد: (کێی زەلام؟) دیسان لەو سەرەوە کە دەگەڕایەوە هێشتا (٥٠)مەتر لێم دوور بوون هاوارم دەکردەوە: (زەلام کێی؟) بەرێکەوت پێشمەرگەیەک چووە مزگەوت و کاتێ گەڕایەوە کە دەیویست بچێتە وە ناو بارەگا کە نزیک بارەگا بۆوە هاوارم کرد (زەلام کێی؟) پێشمەرگەکەش بە پێکەنینەوە گوتی: (ئای ترحێو من وارۆیشتم و گەڕامەوە، تازەپێم دەڵێ زەلام کێی؟) ئیدی بۆ سبەینێ باس باسی ئەو هەڵوێستەی من بوو، وەکو نوکتە دەیانگێڕایەوە بۆ ڕۆژی دووەم خۆم بەستبوو لەمن وابوو لەهەموو کوردستاندا پێشمەرگەی وەکو من ئازاو گورج و گۆڵی تێدانیە، کەچی کاتێکم زانی فەرەی مامە عەبە، بەوردی تەماشایەکی قەدو باڵای کردم و بەخەندەیەکەوە گوتی: ( مەخزەنەکانت هەڵگێڕەرەوە حەیامان مەبە!!) کە سەیرێکی خۆمم کرد تەماشا دەکەم مەخزەنە فیشەکەکانی بەرپشتێنەکەم، سەرەو خوار بەستووە.

سەرەڕای هەموو ئەوانەش ڕۆژ بەڕۆژ باوەڕم بەخۆم قایم تردەبوو، کە کلاشینکۆفە گەورە قورسەکەم لەشان دەکرد وام دەزانی هەموو کورد

چاوەڕێی منە بچم رزگاری بکەم ،هەفتەیەک دوای ئەو ڕووداوانە ڕۆژێکیان پیاوێکی بەتەمەن لە دوورەوە هات بەرەو گوندو ڕووی کردە بارەگاکەی کەمنی لێ بووم، ئەو وەختە لەسەر بانیژی بارەگا بەچەک و تفاقەوە وەستابووم پیاوە بە تەمەنەکە هاتە پێشەوەو پرسی: (ئەرێ کاکە گیان هیچ کوڕێکی مەسیحی لەم ڕۆژانەدا هاتۆتە ئێرە؟!) دەستبەجێ دڵم خەبەری داو زانیم ئەوە باوکم ناردویەتی بۆ سۆراخی من، ئەوەبوو لێم پرسی: (باوکی ناوی چیە) گوتی: (فەرمان یاقۆ) ئیتر کاک حەمە یادگار هات ویەکێک لەخاوەن ماڵەکانی گوند گوتی: (ئەو پیاوە بەتەمەنە خزمانە متمانەی پێ بکەن) کاک حەمە یادگار چەند پرسیارێکی لێ کردو بەمنی گوت خۆت ئاشکرا بکە، ئەوە بوو گوتم من شێرازدم لەراستیدا لەمێژبوو هەواڵی ماڵی خۆمانم نەدەزانی، بیری دایک وباوک و خوشک و براکانم زۆر دەکرد هەمیشە چاوە فرمێسکاوییەکانی دایکم لەبەرچاوبوو تاقە خەم و گرفتم ئەوەبوو کە لەپاش ڕۆیشتنم دایک وباوک و کەس و کارمیان گرتبێت، بەڵام هەموو کاتێ دڵی خۆمم بەم قسانە دەدا یەوە. (خۆ من لەو هەموو پێشمەرگە قارەمانانەی تر زیاترنیم، خۆ دایک و باوکم لەکەس و کاری ئەو هەزاران شەهیدە زیاتر نین، گرنگ ئەوەیە ئێستا لەنێو خەڵکدا سەریان بەرزە.. کوڕەکەیان پێشمەرگەیە) بەڵێ لەدڵی خۆمدا دەمگوت (خۆ ئەگەر هەر یەکێ لە ئێمە لەترسی ئازارو ئەشکەنجەو دەسگیرکردنی دایک و باوک و کەسوکاری نەتوانێ ڕوو بکاتە چیاو نەبێ بە پێشمەرگە، کەواتە هەتا ماوین دەبێ بەژێر دەستەیی بژین، و ڕۆژانە سوکایەتی پێ کردنی پیاوان و دەستەو دایەرەکانی ڕژێم قبوڵ بکەین) بەهەر حاڵ پرسیارێکی زۆرم لەو پیاوە کرد کە باوکم بۆ سۆراخی من ناردبوویە چاڵە خەزێنە( ئەرێ دایک و باوکم نەگیراون؟ ئەرێ ئازاریان نەداون؟) پیاوەکە گوتی:( نەخێر کەس نەگیراوە، بەڵام باوکت زۆر خەفەتبارە بیستویەتی گوایە ئێوە لەرێگا کەوتوونەتە نێو کێڵگەی مینەوەو لەناو چوون) ئەگەرچی هێشتا متمانەی تەواوم بەو پیاوە نەبوو، بەڵام سلاوم بۆ باوکم ناردو بە پیاوەکەم گوت: ( بەباوکم بڵێ نەیەت بۆ ئێرە، من نایەمەوە) پاشان هەر بۆ ئەوەی باوکم زۆر بێ ئومێد بێ لەگەڕانەوەم درۆیەکی سپیم کردو گوتم: (من رەنگە لێرەوە برۆم بۆ ئێران و لەوێوە ڕووبکەمە ئەوروپا، ئیدی بە باوکم بڵێ بەتەمای

من نەبێت نەبەتە ئێـرە!!) (٧-٨) ڕۆژێک دوای ئەوە دایکی بێسـتـوونی برادەرمان لەنێو شاری سلێمانیەوە هات بۆ لای کوڕەکەی، بێستونیش هەر لەگەڵ ئێمەدا هاتە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی، ئەوەبوو بەر لەوەی دایکی بێسـتوون بێت، دایکم چوو بووە لای و پێی گـوتبوو، لەگەڵ بێسـتووندا شێرزاد بهێنەرەوە، بەهەر حاڵ دایکی بێستوون بەدەستبەتاڵی گەڕایەوە نەمن چووم لەگەڵیداو نە بێسـتوونی کوڕی، ئەوەبوو هەر بەچەند ڕۆژێک دوای ئەوە دووبارە دایکی بێسـتوون هاتەوە لامان و ئەمجارەیان دایکم هەواڵی بۆ ناردبووم و گوتبووی(ئەگەر نەگەڕێتەوە من دێمە لای) ئەوەیان خـەمـیکی بۆ دروست کـردم، ڕەنگە دایکم بێت بۆ ئێـرەو تووشی کـارەساتێکیش بێت، یەکـەمین ڕۆژی پێشـمـەرگـایەتی هەر بەو مـەرجـە قـبـوڵیـان کـردم، ئەگـەر بێت و دایک وباوکم بێن بەشـوێنمـدا دەبێ بگەڕێمەوە، بۆیە کاتێ ڕاوێژم بەکاک حەمە یادگار کرد، زۆر ئامۆژگاری کردم کە بگەڕێمەوە ناو شارو وەکو ڕێکخستن کار بکەم باشترە، حەمە یادگار پێشمەرگەیەکی ورە بەرز بوو، هەمیشە هانی دەداین کە لەسەر ئەو ڕێبازە بەردەوام بین، بەڵام لەهەمانکاتدا مرۆڤێکی واقیع بین بوو، دەیگوت هەر کـەسـەو دەبێ بە پێی تەمـەن و ئەزمـوون وتوانای خـۆی کـار بکات و خەبات بکات. هەرچۆنێ بوو بەرەزامـەندی هەمـوو لایەک بڕیارمـاندا (بۆ سبـەی سـەعـات (٥)ی بەیانی زوو من و بێسـتـوون و دایکی و چاو ساغێک بەرەو سلێمانی بەڕێ بکەوینەوە) ئەوەبوو بەر لە ڕۆیشتنمان کاک حەمە یادگار، کەفیلی لەچاو ساغەکەمان وەرگرت و چەند قسەیەکیشی لەگەڵ کرد، پاشان منی بانگ کردە ئەو لاوەو بەتەنیا کۆمەڵێ ئامۆژگاری کردم لەبارەی کـاری ڕێکسـختنی ناو شارەوە، ئینجا پێی گوتم لەمەو دوا ناوی نهێنیت:( شاخەوان)ە، لەهەمووشی سەیرتر ئەوە بوو کە داوای لێ کـردم، بەگـەیشـتنەوەم بۆ سـەرچنار پەیوەندی بکەم بە نزاری نووریـەوە نهێنیەکیشی پێ گوتم: کە بەنزار رابگەیەنم.. ئا لەو ساتەدا نزارم هێندەی تر خـۆش ویست ئەو ڕۆژە یەکـەمین جـارم بوو بزانم (نزار) ئەو پەیوەندیە بەهێزەی هەیە لەگەڵ هێزی پێشمەرگە.. ئیدی لەکاتی خۆماندا بەهەمان ئەو ڕێگەیەی لێـوەی هاتبـووین کـەوتینەوە ڕێ، بەڵێ پاش (١٧)ڕۆژ پێشمەرگایەتی کە بەشبەحاڵی خۆم تاوەکو ئێستا بەخۆشترین ڕۆژانی

تەمەنی دەزانم و هەردەم شانازی پێوە دەکەم لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٥ دا گەڕامەوە بەرەو شار. ئەوەبوو چاوساغەکەو دایکی بێستوون هەریەکەیان سواری بارگیرێک بوون و ئێمەش بە پێ لەگەڵیاندا، ئەو ڕۆژە بەددم هەنگاوەکانەوە گریام زۆر گریام، ئاخر من لەمنداڵییەوە خەونم بە چەکی پێشمەرگایەتییەوە دەبینی، نازانم بۆ وا بەئاسانی گەڕامەوە، بەڵام کە بیرم دەکەوتەوە من دەبمە ڕێکخستنی نهێنی ناوشارو ئەرکێکی پیرۆزو گەورەم دێتە ئەستۆ، تارادەیەک ئاسوودەییەک بەناخمدا دەهات. ماوەیەکی زۆرمان بە پێ بڕی تا گەیشتینە کەناروێ و لەوێ لەماڵێک لاماندا شەو لەو ماڵە بووین و بۆ بەیانی زوو لەگەڵ خاوەن ماڵەکەدا بەجێبێکی لاندرۆفەر بەرەو چوارتا کەوتینە ڕێ و لەچوارتا تەسلیمی ماڵێکی کردین کە خاوەنەکەی تەکسیەکی پێ بوو، پاشان بەو تەکسیە بەرەو شاری سلێمانی بووینەوەو سەعات (١١)ی پێش نیوەڕۆ گەیشتینەوە ناو شار. لێتان ناشارمەوە هەستم بەدڵتەنگی و بێتاقەتییەکی زۆر دەکرد، بیری سلێمانیم دەکرد وام دەزانی (١٠)ساڵ زیاترە نەمدیوە، بەڵام رەنگ و روخسارە قێزەونەکانی پیاوانی بەعس هەموو شتێکی لەبەرچاو خستبووم، بێزاریم گەیشتە رادەیەک کە تەواو پەشیمان بووم لەگەڕانەوەم بۆ ناو شار، خەمی هەموو ئەمانە لەلایەک و ترسی لێکۆڵینەوە ناخۆشەکانی باوکم لەلایەکی دیکە وەستابوو، بەهەر حاڵ سەرەتا لەماڵی بێستوون لاماندا لەگەڕەکی سەرکارێز جل وبەرگی پێشمەرگایەتیمان نەگۆڕیبوو پێڵاوە لاستیکەکانمان قوڕو لیتەی ڕێگە سواغی دابوو، ناو باڵامان قوڕی و شکەوەبوو بوو. کە گەیشتینە بەردەم ماڵی بێستوون ولەتەکسیەکە دابەزین، ئافرەتێکی دراوسێیان بەدایکی بێستوونی گوت: (بەخێر بێنەوە.. ئەوە کوڕەکەتان لەکوێ بوو؟) ئەویش دەستێکی بۆ من درێژ کرد و گوتی: (لەگەڵ ئەم سەگبابە چوو بوون بۆ بەغدا) ئافرەتەکەی دراوسێشیان تەماشایەکی قەدو باڵای ئێمەی کردو لچێکی لێ هەڵقورچاندین و بەزمانێکی تانە ئامێزەوە گوتی: (بەغداو پێڵاوی لاستیک؟!!!) دوای ئەوە جووتێ پێڵاوم لە بێستوون وەرگرت و پانتۆڵێکی فش و گەورەی باوکی بێستونم لەپێ کردو دایکی بێستونیش دینارێکی دامێ و تەکسیەکم گرت بەرەو سەرچنار، هەر کە لەسەری کۆڵان دابەزیم دیتم وانەنکم لەبەر

دەرگا دانیشتووە قسە بۆ خوشکەکانم دەکات. ئەوەبوو هەر کە چاویان بەمن کەوت هەر هەموویان بەگریانەوە بەرەو ڕووم هاتن و باوەشیان پێدا کردم، ئیدی ئەو ڕۆژە هەواڵیان بۆ باوکم و مامەکانم و خزمان ناردو هەموویان هاتن بۆ بەخێرهاتنەوە، باوکم کە لەسەر ئیش بوو لەکارگەوە هاتەوە باوەشێکی پێدا کردم و بۆ ماوەی (١٠) دەقیقەی ڕێک بەری نەدام، فرمێسکی خۆشی و ناخۆشی لەچاویدا قەتیس مابوو، فرمێسکی خۆشی لەبەر ئەوەی بەکوڕەکەی شاد بۆتەوەو فرمێسکی ناخۆشیش لەترسی گیانی من بوو نەوەک ئاشکرابم و دەستگیر بکرێم، بەهەر حاڵ باوکم دەستی خستە سەرشانم و گوتی: ( خەمت نەبێ کوڕی خۆم ئەگەر زانیمان جۆرە مەترسیەک لەئارادایە بەپەلە دەتنێرمەوە بۆ ناو پێشمەرگەکان) ئەو شەوە ئۆقرەم لەبەر بڕابوو زۆر بیری نزارم دەکرد بۆیە هەر ئەوشەوە بەنهێنی میوانەکانم بەجێ هێشت و پایسکلێکم لەناری حاجی زایر وەرگرت و چوومە ماڵی نزار، ئەوەبوو نزار خۆی دەرگای لێ کردمەوەو بەتوندی باوەشمان بەیەکدا کردو گوتی (دەمزانی چووبوویتە ناو هێزی پێشمەرگە). بەهەر حاڵ نێهنیەکەی حەمە یادگارم پێ گوت و هەواڵی هەڤاڵانم پێ گەیاند، لەو شەوە بەدواوە تا هەفتەیەکیش ترسی ئەوەم هەبوو ئاشکرا بووبم و بێن بمگرن هەر کاتێ گوێم لەدەنگی ئۆتۆمبێل بوایە لەکۆڵانەکەدا وام دەزانی هاتوون بۆ گرتنی من،لەراستیشدا زۆر خۆم دەرنەدەخست.

## خەبات بەشێوازێکی تر

زۆربەی کات لەماڵەوە بووم وباسی ئەو (١٧) ڕۆژەی پێشمەرگایەیتم بۆ خوشک و براکانم دەکرد، ئەو کاتە باری ئابووری ماڵمان زۆر باش بوو، باوکم یەکێک بوو لەوانەی کەپاسی کۆستەری هەبوو بۆیە ڕۆژێکیان پێی گوتم :( کوڕی خۆم ئیتر واز لەم سەر ئێشەیە بێنە ،ئەوە پاسی کۆستەرمان هەیە بۆ خۆت بچۆ سەری ئیش بکە) من مۆڵەتی شوفێریم نەبوو، بەڵام هەر لە مێردمنداڵیەوە شوفێرییەکی زۆر باشم دەزانی چونکە لەوەتەی فامم کردبۆوە، باوکم ئۆتۆمبێلی هەبوو، ئیدی باوکم لەو خەیاڵەو منیش کاتێ تەنیا دەبووم لەخەیاڵێکی دیکەدا دەژیام:( خوایە گیان تۆ بلێی جارێکی دیکە، هەلی پێشمەرگەکایەتیم بۆ بڕەخسێ) بەم شێوەیە بەردەوام بووم تا

ئەو کاتەی قەناعەتم بەوە هێنا لەماڵ بچمە دەرەوەو ئیدی لەگەڵ هاوکمدا بەرۆژ ئیشم دەکرد، دوایی وردە وردە بۆم ڕوون بۆوە کە خەڵک بەتایبەتی خەڵکی خراپ و راپۆرت نووسەکان بەوچەند ڕۆژ پێشمەرگایەتیەی منیان نەزانیوە، دایکم و ئەوان لای دراوسێکان گوتووبیان شێرزاد ئەو ماوەیە لەهەولێر بووە لەماڵی خزمانی خۆمان.لەو ماوەیەدا چەند جارێک دەچووم بۆ هەواڵ پرسینی سالار، وردە وردە چوونە دەرەوەی شەوانم لەگەڵ نزاردا دەستی پێ کردەوە، نزار کۆمەڵێ هەڤاڵی باشی هەبوون کە لەرێکخستنەکاندا چالاکیان لەگەڵ ئەنجام دەداین، ئەو ماوەیە کۆمەڵێ چالاکی بەرچاومان ئەنجام دا، بەڵام دڵسۆزی نزارم زیاتر لەوەوە بۆ دەرکەوت، کە لەکاتی چالاکییەکاندا نەیدەهێشت هەڤاڵەکانی تری من بناسن، ئەو ماوەیە سەرچنار کۆمەڵێ گەنجی پارتی و کوردپەروەری باشی تێدا پەیدا بوو بوو نزار پێی دەگوتم: شێرە ئەوانە بناسەو متمانەیان پێ بکە ئەوانە (کوڕی کۆنن) ئەوە ووشەی نهێنی بوو بۆ پارتیەکان، لەوانە فەلاحی کاک عەلی و لوقمانی باقی و زۆری تر کە ئێستا ناویانم لەیاد نەماوە.. من دەمزانی نزار لەبواری کاری رێکسختنی نهێنیدا کاری گەورە گەورەی دەکردو لەناو پێشمەرگەدا جێی متمانە بوو ،بەڵام زۆر جار نزار نەیدەهێشت تەنانەت منیش بەو چالاکیانە بزانم، ئیتر خۆی دەکرد بەشوێنی سەیر سەیردا هەندێ جار لێم دەپرسی: بۆچی دەچیت؟ دەیگوت خەمت نەبێ دوایی هەمووی دەزانی، هەر بۆ زانیاریتان ماڵی نزاریش لەرووی ئابوریەوە وەزعیان باش بوو نزار ئوتۆمبیلێکی جۆری (بیجۆ)ی پێ بوو، شەوو ڕۆژ بەم بیجۆیە دەهات و دەچوو ئیشی رێکخستنی ئەنجام دەدا.

ئەو ماوەیە خەڵکێکی زۆرمان کەسب کردو حەزیان دەکرد چالاکیمان لەگەڵ ئەنجام بدەن، بەڵام نزار زۆر بەهۆشیاری مامەڵەی دەکرد هەمیشە هەوڵی دەداو کۆبوونەوەی پێ دەکردن ووانەی نیشتمانپەروەری و کورد پەروەری دەدانێ، بەڵام نەیدەهێشت ئاگاداری چالاکی و نهێنیەکانیترین، دوای (١٠-١٥) ڕۆژێک مامم لای بەڕێوەبەر واستەی بۆ کردم وچوومەوە دەوامی قوتابخانە، هێشتا مانگێک نەبوو دەوامم دەکرد سالارو فەرهاد هاتنەوە بۆ ناوشار،ئیدی ئەوانیش وەکو من بۆ کاری رێکخستن وازیان لە پێشمەرگایەتی هێنا، ئەوەبوو سالار و فەرهادم بەنزار ناساند ئیدی لەوە

بەدواوە پێکەوە کارمان دەکرد لەو ساڵانەدا کە داپڵۆسین و زوڵم و زۆرداری حکومەتی عێراقی بەسەر خەڵکی کوردستانەوە سنووری پەڕاندبوو، لەکاتێکدا کە ڕۆژانە سەدان گەنجی کورد دەخرانە زیندانە تاریکەکانەوە، لەو ساڵانەدا کە ڕۆژانە چەندین ڕۆڵەی ئەم وڵاتە لەسێدارە دەدران و پیاوانی دەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێم بەخراپترین شێوەو شێواز ئازارو ئەشکەنجەی خەڵکیان دەدا، ئا لەو ساتانەدا نا ئومێدی باڵی بەسەر خەڵکدا کێشابوو، پیاوانی ڕژێم بەکەماڵی ئیسراحەت پاڵیان دابۆوەو بە ئارەزووی خۆیان خراپە کاریان دەکرد، بۆیە ئەو بارودۆخە وای پێویست دەکرد کە هەر چۆنێ بێت لەخەڵکی بگەیەنین کە خەباتی ئەم گەلە بۆ ئازادی بەردەوامە دەبوایە تێیان بگەیەنین کە شۆڕش بەردەوامەو هێشتا لەم شارەدا خەڵک هەیە تەسلیم بەو واقیعە تاڵە نەبووە،ئامادەنییە بەژێر دەستی بژی بۆیە ئێمە سەربەخۆ هەندێ کارمان دەکرد.

وەک بۆم باسکردن نزار و سالار دوو کوڕی ئازاو چاونەترس بوون، ماوەیەک نزار بەعامی ئاشکرا، ڕێگەی بەو گەنجانە دەگرت کە باوکیان یاخود کەس و کاریان بەعسیەو لێی دەدان، هەندێ جار هەڕەشەی لێ دەکردن بەراستی ئەوانیش لێی دەترسان، زۆرجار دیوارەکانمان بەدروشمی کوردایەتی ڕەش دەکردەوە. شەوێکیان نزارم بینی و پێی گوتم: ( شێرە ئەمشەو کارێک دەکەین تەحەدای هەمووبەعسیەکانی ئەم شارە بێت) منیش گوتم چییە؟ گوتی:( ئەمشەو لەدیواری بنکەی پۆلیسی سەرچنار دەنووسین) ڕەنگە بەلای خوێنەرەوە کارێکی ئاسان بێت، بەڵام ئەوەی لەو ساڵانەدا لەسەرچنار ژیابێت دەیزانی ئەو کات بنکەی پۆلیسی سەرچنار، شوێنێکی چەند ترسناک بوو خۆ ئەوە هەر ناوی بنکەی پۆلیس بوو، ئەگینا دائیرەی ئەمن و بەندیخانەو پیاوانی بەعس بەدەیان و هەموو دەزگا سەرکوتکەرەکان لەو بنکەیەدا بوون، بنکەکەش لای بازاڕی سەرچنار بەسەر بەرازییەکەوە بوو، سەربان و بنبانی بەپاسەوان گیرابوو، تەنانەت دیواری هیچ خانویەکی دیکەی پێوەنەبوو، وەکو قەڵایەکی زوڵم و زۆرداری وابوو زۆر لەگەنجانی سەرچنار کە ئەگیران و لەسێدارە دەدران لەو بنکەیەوە ناویان دەڕۆیشت. بۆیە نزار دەیگوت دیواری مەخفەری سەرچنار دەنووسین و تەحەدای هەموو بەعسیەکان دەکەین، ڕەنگە ئێستا دیوار

نووسین شتێکی ناشارستانی بێت، بەڵام بۆ ئەو ڕۆژانە وەک سەرەتاش باسم کرد واتای زۆربوو، دیوار نووسین یەکێک بوو لەو کارانەی کە پیاوانی بەعسی دەتۆقاندو ئومێدێکی لە دڵی خەڵکدا دەرواند، ئەوەبوو ئەو شەوە چووین لەسەر دیواری بنکەی پۆلیسی سەرچنار بە بۆیە چەند دروشمێکمان دژی حزبی بەعس نووسی، بۆ بەیانیش هەر بۆ ئەوەی لەنزیکەوە بزانین ئەو کارەی کردوومانە چ کاردانەوەیەکی هەیە، لەگەڵ نزار دا چووین بۆ فەرمانگەی پۆستە ئەو فەرمانگەیە زۆر نزیک بوو لەبنکەی پۆلیس کاتێ گەیشتینە ئەوێ بەڕێوەبەری پۆستە پێی گوتین (مردوتان مرێ ئەوە خوا گرتوونی؟! بەم بەیانیە زووە ئیشتان بەم ناوە چییە، بڕۆن هەتا زووە ئەم ناوە چۆڵ کەن ئەفسەری بنکەکە تووڕە بووە لەبەیانیەوە هەموو پاسەوانەکانی داوەتە بەر شەق و بەئۆتۆمبێلیش بردنی خودا دەزانێ بۆ کوێی بردوون) ئەم قسەیەی بەڕێوەبەری پۆستە دڵخۆشی کردین، ئەوەبوو کە هاتینە دەرەوە تعدادیان بە پۆلیسەکان دەکردو ئەفسەرێکی ئەمن جنێوی پێ دەدان، ماوەیەک من و سالار و نزار دەچووین پرۆگرامەکانی رادیۆی دەنگی کوردستانی عێراقمان تۆمار دەکرد، کاسێتەکانمان لەماڵی پیاوانی بەعس فڕێ دەدا بۆ ئەوەی بیان ترسێنین دەمانویست خەڵکی کوردستان نەبێتە ئەڵقە لەگوێی ڕژێمی عێراق. زۆر لەکارو چالاکیەکانی خۆمان و دوایین دەنگوباسی شارو هەواڵی پیاوانی بەعس و هەرچی زانیارییەک کە بمانویستایە بە راپۆرت دەماناردە دەرەوە ئا لەڕۆژانەدا خۆم بەکەسێکی گەورە دەزانی ١٠٠ ٪ قەناعەتم بەو کارانەم هەبوو کەئەنجامم دەدا، دەمزانی کە هەنگاوی بەجێ دەنێم و هەنگاوەکانم بەرهەمی باشی دەبێت، خۆ بەلایەنی کەمەوە خەڵک لەترسی ئێمە بەحەزەرو ترسەوە دەبوونە بەعسی، خۆ بەلایەنی کەمەوە هەڤاڵانی پێشمەرگەم سوود لە زانیارییەکانم وەردەگرن، خۆ بەلایەنی کەمەوە ویژدانی خۆم دەحەسێنمەوەو، بەم کارە رووبەڕووی خیانەت دەوەستم. ڕۆژ هات و ڕۆیی نزار بەردەوام بوو لە شەڕ فرۆشتن بە کوڕی پیاوانی بەعس شەو بەئاشکرا دەهاتین و دەچووین، جارێکیان بەرپرسی حزبی بەعس لەکارگەی چیمەنتۆی سەرچنار باوکی نزاری بانگ کردبوو پێی گوتبوو نابێ ڕێگە بدەیت کوڕەکەت شەوانە بێتە دەرەوە، شەوێکی تر کۆمەڵێک پێشمەرگە هاتبوونە ناو شارو پیاوێکی

جەیشی شەعبی سەرچناریان بردبوو، کەچی بەرپرسی حزبی بەعس کارگەی چیمەنتۆ بە باوکمی گوتبوو: ( ئاگاداری خۆت بە ئەو شەوەی جەیشی شەعبییەکەیان فڕاندووە، خەڵک کوڕەکەی تۆیان دیوە ئاماژەی بۆ چەکدارەکان کردووەو چاو ساغیان بووە).

لەراستیدا کە باوکم ئەو قسانەی بۆ گێرامەوە کەمێک حەزەرم وەرگرتو چووم لەماڵی مامم خەوتم. باوکم ئەو ماوەیە کارو کاسبی لێ تێک چوو بوو، شەوو ڕۆژ لەهەوڵی ئەوەدا بوو کە بۆیان بسەلمێنێ من کاروباری سیاسی ناکەم ئەو کەسەش کە شەو بینراوە من نەبووم، ئەوە بوو دواجار بەباوکمیان گوتبوو( باشە واز لەکوڕت دێنین، بەڵام بەمەرجێ بەڵێنمان پێ بدەی کە چیتر شەوانە لەگەڵ ئەو گەنجانەدا نەیەتە دەرەوە)، لەدوای (٢٠) ڕۆژ لەفڕاندنی، ئەو پیاوە جەیشی شەعبیە گەڕایەوە، ڕۆژێکیان لەیەکێک لەکۆڵانەکاندا من و نزار یەن دوو هەڤاڵی تر بەیەکەوە وەستابووین، کەچی کاتێ ئەو جەیشی شەعبیە بەلامانا ڕەت بوو لەبەر خۆیەوە گوتی: (وەڵلاهی دەبێت بیانکەم بە پیاو!).

ئەو مەبەستی ئێمە بوو، بەڵام بەسەر خۆماندا نەهێنا.

## تەنگ و چەڵەمە

وورده ورده کوڕانی سەرچنار دەیانزانی کە من خەریکی کاروباری سیاسیم، بەڵام هێشتا بۆیان روون نەبووبۆوە، چۆن و لەگەڵ کێ و سەر بە چ ڕێکخستنێکم. (س) کوڕێکی دراوسێمان بوو زۆر لەمێژبوو یەکتریمان دەناسی دەشمانزانی لەگەڵ دەزگا سیخوریەکانی بەعس دەستی تێکەڵ کردووەو ڕێگای خیانەتی گرتۆتەبەر، (س) پاسێکی پۆلۆنی پێ بوو لەهێڵی سەرچنار وەکو کۆستەرەکەی ئێمە ئیشی دەکرد، هاوکات ئەویش دەیزانی من خەریکی چیم! بۆیە زۆرجار لەکۆڵانەکەدا خێسەی لێ دەکردم بەو نیازەی چاو ترسێنم بکات و تێم بگەیەنێت ئەو دەتوانێ بەگرتنم بدات، بەڵام لە پیاوەتی خۆی ئەو کارە ناکات، ئەو دەمە لەبەر جەنگی عێراق و ئێران و بۆردومانی فڕۆکە ئێرانیەکان زۆربەی هەرە زۆری بەنزیخانەکانی سلێمانی داخرابوون، تەنیا یەک دوویەکیان کرابوونەوە ئەویش شەوانە ئۆتۆمبێل دەچوون سەرەیان بۆ بەنزین دەگرت، شەوێکیان (س)ی

دراوسیمان بە پاسەکەیەوە هاتە بەر دەرگاو گوتی:( وەرە لەگەڵما دەچین بەنزین وەردەگرین)، منیش لەدڵی خۆمدا گوتم با مەزندە نەکات من لێی دەترسم بۆیە سەیری حەوشەکەی خۆمانم کردوو بەدرۆ گوتم« باوکە من لەگەڵ (س) دەچم بۆ بەنزیخانە» لەراستیدا کەس لە حەوشەکەماندا نەوەستابوو، بەڵام من (س)م ترساند بۆ ئەوەی وابزانێ ماڵەوەمان ئاگادارن کە لەگەڵ ئەو دەڕۆم، گەیشتینە لای بنکەی تەندروستی سەرچنار و (س) باسەکەی خۆی بەم قسەیە دەست پێکرد(کوڕی باش ماوەیەکە لەگەڵ ئەو برادەرانە تەعقیبی خەڵک دەکەن!) یەکسەر زانیم دەیەوێ چی بڵێ بۆیە بەتوڕەییەوە وەڵامم دایەوە( ئینجا مەبەستت چییە؟) (س)گوتی: (تو شەرەفت تۆو نزار بەکێ دا ئەو نامەیەتان ناردبوو بۆ پێشمەرگە، بۆ ئەوەی بێن ئەو جەیشی شەعبیە ببەن و بیترسێنن؟). هێندەی تر تووڕەبوونم زیادی کردو هاوارم کرد بەسەر (س): «(س) باش گوێ بگرە، لەوە زیاتر هیچ قسە نەکەی ئەگەر پیاوی حکومەتیشی منەتت بە پێڵاوەکانم، چیت لەدەست دێت بیکە، بەڵام وەڵڵا یەک شتم بەسەر بێت من هەموو لایەک تێدەگەینم هەڵت واسن»ئیتر (س) بە هەڕەشە کردنەکەی من کەمێک ترساو خۆی هێمن کردەوەو گوتی:( شێرە گیان من حەقم چییە، پیاوی حکومەتی چی و تەڕەماشی چی، ئێمە کوڕی فەقیرین)، منیش پێم گوت: ( درۆ دەکەیت ئەگەر پیاوی حکومەت نەبوویتایە ئەو قسە هەڵەق و مەلەقەت نەدەکرد) بەهەر حاڵ ئەو شەوە گەڕاینەوە دابەزیم و ماڵئاواییم لە (س) نەکرد کە ویستم بڕۆمە ژوورەوە (ج)ی دراوسێمان بانگی کردم، (ج)یش کچێکی هەتا بڵێی جوان بوو، ئەویش دەمێک ساڵ بوو دراوسێمان بوو زۆر لەکوڕانی گەڕەک بەو کچە سەرسام بوون، بەڵام ئەو زۆر برادەرایەتی لەگەڵ (س) دا هەبوو منیش هەر لەبەر ئەوە ئەو کچەم خۆش نەدەویست، کەچی وەک بڵێی پیلانێکی (س) بێت (ج) بانگی کردم و زۆر بەڕووی خۆشەوە قسەی لەگەڵ کردم دەیویست بەتەڵەکەبازی سەرنجم بەلای خۆیدا رابکێشێ و هەوڵ بدات چەند نهێنیەکم پێ بدرکێنێ، بەهەر حاڵ زۆر خۆی باداو زۆر بەنازو نوکەوەقسەی لەگەڵ کردم، زۆر پرسیاری کرد ( شەوان بۆ کوێ دەڕۆیت؟ خەریکی چیت؟ بۆ لای کێ دەچیت؟ ئەی ئەو ماوەیە دیارنەبوویت لەکوێ بوویت؟)، بەڵام هەوڵەکانی بێ هودە بوو،

چونکە ١٠٠٪ دڵنیا بووم کە ئەو قسانە (س)فێری کردووەو ئەو زانیارییانەی بۆ ئەو دەوێ. نزاریش زۆرجار لەکۆبوونەوەکاندا ئامۆژگاری ئەوەی دەکردین، کە لەگەڵ کچاندا بەحەزەربن نەوەک دوژمن وەک چەکێک بەکاری بێنێ، ئەوەبوو (ج)م بەجێ هێشت و بۆ سبەی رووداوەکانی شەوی رابردووم بۆ نزار گێڕایەوە سەبارەت بە (س)و (ج)، نزار زۆر ڕقی هەستا و پێی گوتم (بۆچی شەو نەهاتی پێم بڵێی؟) هەر چۆنێ بوو نزار ئامۆژگاری کردم کە زیاتر ئاگاداری خۆم بم و قسەم لێ دەرنەهێنن، ئا لەو سەرو بەندەدا تەرمی (شەهید سالح)ی برای سالاریان هێنایەوە ناوشار، ئەویش ئەندامێکی چالاکی ڕێکخستنەکانمان بوو ماوەیەک بوو دەسگیرکرابوو، پاش لێدان و ئەشکەنجەیەکی زۆر کە دانی بەهیچدا نەنا حکومەتی عێراق لە سێدارەی داو تەرمەکەیان ناردەوە سلێمانی و پرسەدانانیش قەدەغە بوو.
ڕۆژی دواتر من و نزار چووینە لای سالارو باسی (س)مان بۆ کردو و راوێژێکمان پێ کرد کەچی لێ بکەین، ڕۆژ بەڕۆژ سالار لەبەرچاومدا گەورەتر دەبوو، بەتایبەتی ئەو ڕۆژە کە بەمن و نزاری گوت:( ئێوە پیشانی منی بدەن و حەقتان نەبێ من خۆم دەزانم چۆن عاقڵی دەکەم، ئێوە سەرچنارین هەر شتێکی لێ بکەن دەتانناسێتەوە) ئەوەبوو پێنج ڕۆژ دوای ئەوە ڕۆژێکیان سالار دەم وچاوی خۆی بەجامانەیەک داپۆشیبوو، هەر لەناو پاسەکە ملی (س)ی گرتبوو بەهەڕەشەوە پێی گوتبوو: (شێرزاد یەک شتی لێ بەسەر بێت تۆ دەکوژم) هەر ئەو ڕۆژە دەمە وعەسرێکی درەنگ، (س) و دایکی هاتنە ماڵمان و بەدایکمیان گوت زەلامێک لەسەر شێرزاد هەڕەشەی کوشتنی لە (س) کردووە، ئیدی (س) دوو سێ جار لێی پرسیم: (ئەو زەلامە کێ بوو ناوی چییە؟) منیش بەتوڕەییەوە پێم گوت (مەسەلە من نیم تۆ خۆت کوڕێکی باش نیت، ئێستاش ئەوە لەبەرچاوی دایکتدا پێت دەڵێم هەر شتێکم لێ بەسەربێت تۆ بەرپرسیاریت) (س)یش گوتی: (منیش هەر شتێکم لێ بێت تۆیت)، بەهەر حاڵ ئەم ڕووداوانە ترسێکی لادروست کردم، بۆیە بەئاشکرا نەدەچوومە لای سالار تەنیا لەناو سینەماکانی سلێمانی ژوانمان دەبەست و لەوێ قسەمان دەکرد. هەرچەند ڕۆژێک دوای ئەوە مفەوەزێکی پۆلیس هاتە ماڵمان و داوای لێ کردم کە ئەو دەقەیە لەگەڵی بچم بۆ دائیرە ئەمنی سەرچنار، چونکە شکاتیان لێ

کردووم لەسەر کێشەی هێڵی پاسەکان، کە چوومە دائیرەی ئەمن بینیم لەژووری بەڕێوەبەری ئەمن  نزار دانیشتبوو. لەراستیدا بەبینینی نزار دڵم داخورپا باش بوو بەڕێوەبەری ئەمن یەکسەر بە پێکەنینەوە پێشوازی کردم و بەزمانێکی کوردی سەروگوێلاک شکاو پێی گوتم: (وەرە کاکە وەرە ڕەشە) ئینجا لێی پرسیم لەگەڵ (س)دا کێشەتان چیە بۆچی شەڕی پێ دەفرۆشن؟ توومەس (س) نەیوێراوە بڵێ کە ئێمە رێکخستنی نێهێنین، بەڵکو گوتبووی ئەوانە شەقاوەن و شەڕم بێ دەفرۆشن،و نایەڵن خەڵک سواری پاسەکەی من بێت، ئیتر بەڕێوەبەری ئەمن رووی کردەوە ئێمە گوتی: (بۆچی وا دەکەن؟) منیش کە زانیم مەسەلە سیاسیەت نییە ئیدی دەنگم دلێر بوو بەپێکەنینەوە گوتم (ئینجا ئەو کێشە بچووکە دائیرەی ئەمنی بۆ چیە؟ ئەرەوەڵا پاسەکەی شەق وشڕو پیس و پۆخڵە و حەق نییە کەس سواری بێت) ئا لەو کاتەدا نزار خێسەیەکی لە (س) کرد، بەڕێوەبەری ئەمن چاوی لێ بوو بۆیە پڕ بەدەنگی بەسەر نزاردا هاواری کرد: (بۆچی خێسەی لێ دەکەیت؟ من زۆر ڕێزم لێ گرتن، بەڵام دیارە ئێوە شایەنی ڕێزگرتن نین، باش بزانن ئێمە دەسەڵاتدارین و پشتتان دەشکێنین) ئینجا پاش ئەوەی زۆر هەڕەشەی لێ کردین و قسەی ناشرینی پێ گوتین  وردە وردە زمانی خۆی هێواش و نەرم و نیان کردەوەو گوتی: (من ئەم قسانە دەکەم مەبەستم خراپەکاری نییە، بەڵکو ئێوەش ئەگەر کەسێک دەستدرێژیتان بکاتە سەر  بۆتان هەیە شکات بکەن، خۆتان دەزانن ئێمە عێراقین سۆزو بەزەییمان هەیە ئیتر بۆچی رقتان لەئێمەیە بۆچی نابن بەبەعسی و هاوکاری ئێمە ناکەن؟ هەر چەندە دڵنیاشم ئێوە رۆژێ لە ڕۆژان هەر دەبنە بەعسی و ڕێگەی راستی خۆتان دەدۆزنەوە!! )دوای ئەو قسانەی بەڕێوەبەر ویستم لەوە زیاتر گێچەڵی سیاسیمان بۆ نەنێتەوە هەستام لەبەرچاوی هەموویان باوەشم کرد بە (س) داو دوای من نزاریش (س)ی ماچ کردو هەرسێکمان لەژوورەکە هاتینە دەرەوە هەر لەناو ڕارەوەکەی دائیرەی ئەمنی سەرچناردا نزار تەماشایەکی (س)ی کردو پێی گوت: (من تازە دەستم لەخۆم شتووە، بەڵام شەرت بێ نەیەڵم ئەمەت بەسەرەوە بچێت)، ئیدی (س) خەریک بوو بگەڕێتەوە دووبارە شکاتمان لێ بکات، من خێرا باوەشم پێدا کردو ماچم کردەوە نەمهێشت، بەهەر حاڵ دوای ئەو

ڕووداوه باوكم پێی باش بوو لەسەرچنار دووربكەومەوه، نەوەبوو مامم لە شەقامی مەولەوی لەناو بازاڕی سلێمانی دوكانێكی پێڵاو فرۆشتنی بۆ كردمەوه ماوەیەك لەو دوكانە كاروكاسبییم كرد، بەڵام پەیوەندیم بەنزارو سالارەوه نەپچڕا، بەڵكو هەفتەی جارێك و دووان دەهاتنە لام بۆ دوكان. ئەو ماوەیە بارودۆخی شاری سلێمانی زۆر ئاڵۆز و شپرزە بوو بۆیە ماوەیەك چالاكییەكانمان ڕاگرت، ڕۆژانە دەیان گەنجی ئەو شارە دەگیران و لەسێدارە دەدران،جەنگی عێراق-ئێران زۆر بەخراپی و خوێناوی تاوی سەند بوو، پیاوانی ڕژێم و دەستەودایەرەی بەعس ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر سوكایەتیان بەخەڵك دەكرد، جلی ڕەش و ڕیش هێشتنەوه لەهەموو شتێك یاساغ تر بوو، هەر كەس لەبەری بكردایە بەدرۆوه دەیگوت كەسوكارم لەشەڕی (قادسیەی سەدام)دا شەهید بووه!! وردەوردە هاتوچۆی نزار و سالار بۆ لای من كەم بۆوه، سالار جار جارە بەنهێنی وەك مشتەریەكی دوكان دەهاتە لام و پێی دەگوتم:( ئەمشەو فلانە چالاكی دەكەم، بەڵام ئێوه مەیەن چونكە پێ دەچێت ئاشكرا بووبین)، ئا بەم شێوەیە هێدی هێدی هاتوچۆی سالاریش كەم بۆوه.

## دواجار ئاشكرا بووین

كۆتایی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٥بوو، نزیكەی دوو مانگ بوو نە سالار دەهاتە لام و نەهیچ دەنگ و باسێكم دەزانی. نیوەڕۆیەك جامخانەی دوكانم داخستو چوومە هەمبەرگرخانەیەك بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ، ئەوەندەم زانی سالار بەرەنگ و ڕوویەكی بێ تاقەت و بەپەشۆكاوی خۆی كرد بەهەمبەرگرخانەكەداو هاتە لامەوه پێی گوتم:(لەتیف هاتۆتەوه بۆناو حكومەت). لەتیف گەنجێكی ناكەس بەچەبوو، ماوەیەك چووبووه دەرەوه بۆ پێشمەرگایەتی، بەتایبەتی ئەو ماوەیەی ئێمە پێشمەرگە بووین ئەویش لەوێ بوو ئێمەشی بینی، بەڵام من زۆر خۆم لێ نزیك نەكردەوه بەراستی من ئەو كات كە لەناو پێشمەرگەشدابووم عەقڵم ئەو لەتیفەی نەگرت، چونكە ڕەفتارو هەڵسوكەوتی لەپێشمەرگەی دڵسۆز نەدەچوو، بەهەرحاڵ بەسالارم گوت: (ئینجا هیچ گرفتێك بۆ ئێمە دروست دەكات؟) سالار گوتی: (بەڵێ چونكە دەڵێن لیستێكی لەگەڵ خۆی هێناوەتەوەو لەناو شار

لەگەڵ پیاوانی ئەمن و بەعسی دەگەڕێ و ڕێکخستنەکان و ماڵی کەس و کاری پێشمەرگەیان پیشان دەدات).
گوتم: (ئینجا ئێمە ئێستا چی بکەین باشە؟) بەراستی کە گوتم لەو قسانەی سالار بوو کەمێک ورەم دابەزی، بەڵام سالار لەوەڵامی پرسیارەکەمدا گوتی: (تۆ مەترسە چونکە بەباشی ناتناسێ و ماڵیشتان نازانێ) بەهەر حاڵ گوێم نەدایەو گوتم چی دەبێ بابێ، دوای ئەو دیدارەی سالار بەتەواوەتی وازم لەسەرچنار هێناو شەوانە لەماڵی مامم دەخەوتم و ڕۆژانە لەشەقامی مەولەوی لەدوکانەکە کارم دەکرد. پیاوانی ڕژێمیش لەنێو بازاڕدا ناسراوبوون هەر کە دەردەکەوتن وام دەزانی بۆ گرتنی من دێن کاتێ ئۆتۆمبیلی لاندکرۆزەرو عەسکەریم لەو شەقامە بەرچاو بکەوتایە خێرا خۆم ئامادە دەکرد بۆ هەڵهاتن، ڕۆژی ١٩٨٥/٧/٦ نیوەڕۆیەک سالار هاتەوە لام وگوتی: (زانیارییەکی وام بیستووە ئەوانەی هاتوونەتەوە ناوشار حکومەت ئەزیەتیان نادات) کەمێک لەو دڵەراوکێیە هێور بوومەوە، بەڵام هەر سێ ڕۆژ دوای ئەوە سالار جارێکی دیکە هاتەوە لام و گوتی (لەتیفم دیوە و زۆر بەگەرمی سڵاوی لێ کردم و لێی پرسیم خەریکی چیت و سەرخۆشیشی لێ کردم بەبۆنەی شەهیدبوونی ساڵحی برامەوە) هەروەها لەتیف هەواڵی منیشی لەسالار پرسیبوو، سالار گوتبووی شێرە مەسیحی چووە بۆ هەندەران کەچی لەتیف گوتبووی: (نا نەچووە دەزانم خەریکی چییە!).
منیش ژمارەی تەلەفۆنی ماڵی مامم دا بەسالارو گوتم لەمەودوا بەتەلەفۆن قسەم لەگەڵ بکە، دوای ئەوە زانیم ئیتر بە ئاسانی ناتوانم لەناوشاردا بژیم، چەند جارێک بیرم لەوە کردەوە کە ڕووبکەمەوە چیاو ببمەوە بە پێشمەرگە، بەڵام نازانم بۆچی دەست و بردم لەم بڕیارەمدا نەکرد، سالار دوای ئەوە تەنیا یەکجار تەلەفۆنی بۆ کردم و نیوەڕۆیەکیش هاتەلام وەکو بڵێی دڵم خەبەرێکی ناخۆشی دا بێ، ئەو نیوەڕۆیە سالارم ماچ کردو جووتێ پێڵاوم بەدیاری دایە، سالار کوڕە هەژاربوو جیا لەکاری ڕێکخستن و قوتابخانە بەردەوام بۆیاخچێتی دەکرد، هەموو جارێک کە دەهاتە لام ناوبالای لە بۆیاخدا سواخ درابوو ئەو جارە دواجاربوو کە سالارم لەناو شاردا بینی. دوای ئەوە جار ناجارێ بەتەکسی دەچوومەوە سەرچنارو

سەردانی ماڵی خۆمانم دەکرد، ئەو کات باوکم لەکارگەی چیمەنتۆی سەرچنار شوفێری شۆفڵ بوو، ئەوەبوو داوایان کردبوو کە بەخۆی وشۆفڵەکەیەوە بچێتە بەرەکانی شەڕی عێراق ئێران، ئەو نیوەڕۆیە ڕۆیشتمەوە ماڵی خۆمان بینیم دایکم و ئەوان دەگرین ئەو ڕۆژە ١٩٨٥/٧/١٥ بوو باوکمیان بردبوو بۆ پارێزگاری عەممارە بۆ ناو بەرەکانی شەڕ، ئیدی لەدوای ئەوەوە هیچ دەنگ و باسی نەما، بۆیە بە پێویستم زانی ئەو ماوەیە شەوان لەنێو خوشک و براکانما لەماڵی خۆمان بمێنمەوە، بەڵام زۆر بەحەزەربووم هەر کاتێ لەکۆڵانەکەماندا دەنگی ئۆتۆمبیل بهاتایە، دەستبەجێ دڵداری برام دەنارده سەربان بۆ چاودێری، ئەو ماوەیە دڵە ڕاوکێ باڵی بەسەردا کێشابووم، لەخەیاڵی خۆمدا دەمگوت ئێستا نا کەمێکی تر پیاوانی بەعس دێن و دەمگرن، زۆر دوو دڵ بووم ئەندامانی ماڵەوەشم تەواو بێ تاقەت کردبوو، دایکم هەمیشە دەگریا، ئەو ماوەیە زۆر بیری سالارم دەکرد حەزم دەکرد هەواڵی بزانم دەترسام گیرابێت و سەری تیاچووبێت، ئەوە بوو سەعات (٤)ی عەسری ڕۆژی ١٩٨٥/٧/٢٧ تەلەفۆنم بۆ ماڵی دراوسێیەکی سالار کردو ئافرەتێک وەڵامی دامەوە گوتی: (ماڵی سالار کەسی لێ نییە، ئەم بەیانییە زوو دایکی و برابچووکەکەی بەشڵەژاوی چوونە دەرەوە ئیدی نازانم بۆ کوێ ڕۆیشتوون!) ئەو ئێوارەیە زەردەپەڕ دەرکەوتوو، دنیا وردەوردە تاریک داهات، خەم دایگرتم (تۆ بڵێی سالار چی لێ بەسەرهاتبێ؟) سالار بۆمن کەم نەبوو، براو هاوڕێ و هەڤاڵ و مامۆستای نیشتمانپەروەری و بارزانی پەروەربەتیم بوو، ئێستاش وانەکانی سالارم بیر ناچێتەوە، نمونەی کوڕێکی ئازاو بەجەرگ و بەوەفاو دڵسۆز بوو، هەرگیز نەیدەزانی ترس چییە، هەر کەس سالاری وەک من بناسیایە ئێستا هۆن هۆن فرمێسکی بۆ دەڕشت. ئەو ئێوارەیە تەکسیەکم گرت و چوومە گەڕەکی سەر شەقام بۆ ماڵی سالار، کۆڵان تاریک و کش و مات بوو چووم لەدەرگای ماڵی سالارم داو کەس لێی نەکردمەوە، لەدراوسێکەی تەنیشتیانم پرسی گوتی: ( لەماڵ نین نازانم بۆ کوێ چوون) بە نائومێدی گەڕامەوە ماڵی خۆمان لەسەرچنار لەشم داهێزابوو، ئەوەندە خەمبار بووم مێشکم قورس بوو بوو، بەباشم زانی بچمە حەمام و پاک خۆم بشۆم، تازە کراسێکی سپیم کڕیبوو دوای

خوشوشتن لەبەرم کردو جوان خۆم گۆڕی، وەکو بلێیی دڵم خەبەری دابێ.
ئەوشەوە چوومە دەرەوە دوو پیاڵە گوڵە بەرۆژەم کڕی، ئەو کات ئەدای
خوشکم منداڵێکی جوانکیلەی تەمەن (٥ر١)ساڵ بوو ئیدی لەباوەشم
گرت و بەنێو کۆڵانەکەماندا چەند جارێک هاتم و چووم، هەر بیرم دەکردەوە
دەبێ چارەنووسی سالار چی بێت؟ پیاسەم کرد تا ئەو کاتەی ماندوو
بووم، سەعات (١٢)ی شەو چوومەوە ماڵەوە، چوومە هۆڵەکەو لەناو
جێگادا پتر لە سەعاتێک بیرم کردەوە خۆشم نازانم چۆن خەوم لێ کەوت،
ئەو شەوانە خەوەکانم هەمووی ترسناک بوون.

# ئەو بەیانییەی دەسگیرکرام

ڕۆژی ۱۹۸۵/۷/۲۸ سەعات (٦)بەیانی دەنگی ئۆتۆمبیلی مسەلەحەو لانگدۆزەرو تەپە تەپی سەربان و گرم و وڕی دەرگاو پەنجەرە لەخەو ڕای پەڕاندم تەواو شلەژام، گوێم لێی بوو لەحەوشەو لەسەر بان و بنبانەوە چەند کەسێک بە عەرەبی هاوار هاواریانە (تعال هنا.. اصعد منا.. امشی منا) موبەڕیدەکەمان دەنگی زۆر بەرزبوو، بۆیە ماڵەوە هێشتا خەبەریان نەبوو بۆوە، زانیم بۆ من هاتوون ئەوە ڕۆژەکەبوو کە هەمیشە حسابم بۆ دەکرد بەشێکم لەپەردەی هۆڵەکە لاداو لەدرزی پەنجەرەکەوە تەماشای حەوشەی خۆمان و بەردەرگام کرد، دیواری حەوشەکەمان زۆر نزم بوو بینیم هێزێکی زۆر لە پیاوانی دەزگا سەرکوتکەرەکان دەوری ماڵی ئێمەیان دابوو، هەندێکیان جلی مغاویریان لەبەردابوو، چەند کەسێکیشیان جل وبەرگی ئاسایی و دەمانچەیان بەدەستەوە بوو دیتم وا یەکێکیان خەریکی شکاندنی دەرگای حەوشەیە.

شۆفرلێتێکی پیکاب (مسەلەحە) و سێ چوار لاندگرۆزەر لەکۆڵان وەستابوون، زۆر شلەژام بێ شک بۆ گرتنی من هاتوون بۆیە بیرم لەوە کردەوە کە هەرچۆنێ بێت، هەڵبێم و خۆم لەو چەکدارانە ڕزگارکەم بیرم لەسەربان کردەوە ویستم لەوێوە ڕابکەم، بەراکردن بەقادرمەکاندا سەرکەوتم کاتێ دەستم برد بۆ کێلونی دەرگای هەورەبانەکە تەماشام کرد چەکدارێک لەپەنجەرەی هەورەبانەکەوە بەتوڕەییەوە هاواری کرد: (وین؟ انزل) کێوە دابەزە خوارەوە دەی... لەسەربان بێ ئومێد بووم و هێشتا بەتەواوی بە پێپلیکانەکاندا نەهاتبوومە خوارێ، بینیم هەموو خوشک وبراکانم باوەشیان بەدایکما کردووەو گریان و شین وشەپۆڕیانە تێکڕای ژوورەکان

بەچەکدار گیرابوو، منیش لەشلەژانی خۆمدا چوومە مەتبەخەوە کاتێکم زانی یەک دوانێ بەهەموو هێزیان پاڵیان پێوەنام بۆناو هۆڵەکە، یەکێک لەپیاوەکان کە دیاربوو ئەفسەری ئەمن بێت، بەتوندی هاواری کرد بەسەر دایکمدا: (وین شێرزاد؟) شێرزاد لەکوێیە، دایکم گوتی: ( لێرە نییە!) زۆر بەزەیم بەدایکم دەهاتەوە، زۆر بەکوڵ دەگریاو ئەژنۆی وەکو شەقشەقە دەلەرزی، ئینجا ئەفسەری ئەمنەکە بەدایکمی گوت: ( ئەدی مێردەکەت لەکوێیە؟) دایکم گوتی: (لەبەرەکانی شەڕە)، ئەفسەرەکە گاڵتەی پێ هات (شەڕی چی؟!!)دایکم وەڵامی دایەوە (مێردەکەم شوفێری شۆفڵەو چووە بۆ بەرەکانی شەڕ) ئەفسەرەکەش بەتووڕەییەوە قۆڵی دایکمی گرت وگوتی: (مادام وایە شێرزادی لێ نییەو مێردت لەماڵ نییە، دەبێ تۆ بێی لەگەڵماندا ئیشمان پێتە) ئیدی کە دایکمم لەو هەڵوێستە وادی ئاگرم تێ بەربوو وئەژنۆم شکا، بۆیە بە ئەفسەری ئەمنەکەم گوت: ( کێت دەوێ؟ ئەگەر شێرزادت دەوێ من شێرزادم) هەر کە گوێی لەم قسەیەی من بوو، بەهەموو هێزی خۆی زللەیەکی تێ سرەواندم و دامی بەزەویدا ئینجا قیژاندی (سەگی کوڕی سەگ یەک سەعاتە لێرەیت بۆ ناڵێی من شێرزادم؟) لەگەڵ دەنگی زللەکەو کەوتنی مندا دایکم و ساهیرەی ئامۆزام خوشک و براکانم دەستیان کرد بەگریان و هات و هاوار، لەو کاتەدا حەزم دەکرد بمردمایەو ئەو گریانەی دایکم نەبینیایە، بەدرێژایی ڕۆژانی تەمەنم بیر لەو گریانەی ئەو بەیانییە دایکم دەکەمەوە، ئیدی بەهەر هەموو چەکدارەکان کەوتنە گیانم و بەشەق و زللە بردیانمە دەرەوە، ئەوەبوو دایکم و یەک دوو ئافرەتی دراوسێمان بەگریان و هاوار هاتن بەدوامانداا ،ئەوەندەم زانی ئەفسەری ئەمنەکە بەعەرەبی هاواری کرد بەسەریاندا (وەڵاهی ئەگەر نەگەڕێنەوە، ئێستا لەبەر چاوتاندا دەیکوژم... بگەڕێنەوە دەی) لەژێر شەق و زللە و پێ لەقەی چەکدارەکاندا ئاوڕم لەدایکم دایەوە بینیم خۆی داوە بەرزەویداو خۆڵی بەر دەرگا دەکات بەسەری خۆیدا و دەگری، ئای کە ئەو دیمەنەی دایکم ئازاری دام و خەفەتی خستە دڵمەوە، نەم دەتوانی ئەگینا حەزم دەکرد بگەڕێمەوەو لەبنی پێوە تا تەوقی سەری ماچ کەم و داوای لێ بوردنی لێ بکەم، دەم ویست پێی بڵێم:دایەگیان مەگری ئەمە باجی هەڵوێستێکی نیشتمانپەروەرییە، بەڵام چی بکەم ئەو بوارەم بۆ نەرەخسا

بەهەر حاڵ پەل و پۆیان گرتم و خۆشم نەمزانی چۆن خستیانمە ناو پێشی شۆفرلێتەکە، ئەفسەرەکە منی خستە نێوان شوفێری شۆفرلێتەکەو خۆیەوە سەرنجم لەروخساری شۆفێرەکەدا زۆر بە بەزەییەوە سەیری کردم وسەرێکی بادا، دەمزانی ویژدانی ئەو دیمەنە قبوڵ ناکات و هیچ دەسەڵاتیشی نیە، ئەوەبوو خۆی پێ رانەگیراو بە تەشەرە بە ئەفسەری ئەمنەکەی گوت: (ئەمە لەنیوەشەوەوە ئەم هەمووو هێزە چەکدارەت بۆگرتنی ئەم منداڵە ئامادەکردووە؟!) ئەفسەرەکەش بە شوفێرەکەی گوت: ( وا مەڵێ ئەمە تۆ نایناسی چ گەوادێکە، دایکە ئەفرەتیەکەشی دەیەوێ درۆمان لەگەڵ بکات دەڵێ لێرە نییە!!) بەر لەوەی ئۆتۆمبێل و هێزەکە بکەونە رێ پیاوێکی ریش سپی کە بەجلوبەرگەکانیا پێ دەچوو خەڵکی ئەو گوندانەی دەوروبەری سەرچنار بێت، هاتە پێشەوە لە ئۆتۆمبیلەکەو تەماشایەکی منی کردو قومێکی لەدارجگەرە درێژەکەی داو لە ئەفسەری ئەمنەکەی پرسی: ( ئەرێ ئەو منداڵە بۆ کوێ دەبەن؟) ئەوەندەم زانی لەهەموولایەکەوە چەکدارەکان گورگ ئاسا لەو پیاوە بەتەمەنە بەربوون و هەمووگیانیان شکاند، بەراستی دیمەنی گریان و لەخۆدانی دایکم و ئەو هەڵوێستە بەرزەی ئەو پیاوە بەتەمەنە خەمێکی زۆری لا دروست کردم، وەلێ لەهەمان کاتدا هێزو ورەیەکی پێ بەخشیم، دوای ئەوە ئۆتۆمبیلەکان کەوتنەرێ بەرەو گردەکەی سەرچنار، لەدڵی خۆمدا دەمگوت بێ شک ئێستا دەچن رێبوارو ئاسۆسووریش دەگرن (ئەو دوو گەنجەش سەر بەرێکخستنەکانی ئێمە بوون) ئیدی بەو بەیانیە زووە شەقامەکانی سەرچنار تاک و تەرا ئۆتۆمبیل و رێبواری پێدا دەرۆیشت، تەنیا لای نانەوخانەو سەمونخانەکان قەرەباڵغ بوو وردە وردە گەیشتینە گردەکەو قوتابخانەی ناوەندی سەرچناریشمان بەجێ هێشت. ئینجا بەرەو خواربووینەوەو لای لێژاییەکە ئۆتۆمبیلەکان وەستان، تەماشام کرد ئۆتۆمبیلێکی جۆری داتسۆنی سوری مۆدیل (٧٩)و کرۆنایەکی تەکسی لەدوویەکدا لەو بەر شەقامەکەوە وەستابوون. ئەوەبوو ئەفسەری ئەمنەکەو (مفەوەز عەلاء)و ئەقیبێکی ئەمن لە پیکابەکە دابەزینە خوارەوە وەختێکم زانی ئەوەی مەزەندەم نەدەکرد دیم بەچاوی خۆم دیم ...بەڵێ(ج)ی دراوسێمان کچە جوانەکەی گەڕەکەکەمان) کە چەند جارێک ویستی قسەم لێ دەربهێنێ لەناو داتسۆنەکە دابەزی!! زۆرم سەیر

لێ هات لەخۆمم دەپرسی: (باشە (ج) بەم بەیانیە زووە چی دەکات لێرە؟! ئەی ئەم ئەمنانە لەکوێ دەناسێ؟!) (هەرچەندە پێشتر گومانم لێی هەبوو چونکە زۆر برادەری (س)بوو کورە بەعسیەکەی گەڕەکەمان بەهەر حاڵ هەردوو ئەفسەرە ئەمنەکە چوونە ئەو بەر بۆ لای (ج)و تەوقەیان لەگەڵ کرد پاش ئەوەی هەرسێکیان بەوردی تەماشایەکی منیان کرد ئیدی (ج) تەوقەی لەگەڵ ئەمنەکاندا کردو سواری کرۆنا تەکسیەکە بوو رۆیشت. بەرلەوەی مفەوەز عەلاو نەقیبەکە بگەنەوە لامان،شوفێری شۆفرلێتەکە لێی پرسیم: ( ئەو کچە دەناسی؟!) منیش باشم دەناسی،بەڵام نەموێرا راستی بڵێم بۆیە گوتم: ( نەخێر) پاشان شوفێرەکە گوتی: ( ئەو بەدڕەوشتە تۆی بەگرتن داوە) دوای ئەو قسەیە راستیەکانم بۆ روون بۆوە. پاشان ئۆتۆمبێلەکان بەلای تەنکیەکەی گردەکەی سەرچناردا بەخێرایی رۆیشتن وبەرەو سەنتەری شار کەوتنەڕێ، کە نزیک دوڕیانەکەی سەرچنار بووینەوە مفەوەز عەلا دەیویست زیاتر سوکایەتیم پێ بکات بۆیە پێی گوتم: ( ها نەمردی سواری ئەم ئۆتۆمبیلەش بوویت!) منیش هیچ وەڵامم نەدایەوە ئیدی توڕەبوو قژی گرتم و سەری خستمە ژێر قاچیەوە یەک دوو پێ لەقەی دابەسەرماو گوتی: (گەواد سەرهەڵنەبڕی چاوت بنوقێنەو حەقی هیچت نەبێ) ئیدی لەدوای ئەوەوە نەمزانی بۆ کوێم دەبەن، چونکە سەرم لەژێر پێی مفەوەز عەلادا بوو لەبن دەشبڵی ئۆتۆمبیلەکە، وەختێکم زانی ئۆتۆمبیلەکان لەجێیەک لایانداو وەستان نەمدەزانی کوێیە چونکە لەگەڵ وەستانی ئۆتۆمبیلەکاندا بەپارچە پەرۆیەکی ڕەش هەردووچاویان بەستمەوەو دایانبەزاندم، ئینجا دوو کەس لەملاو لاوە هەردوو پەلیان گرتم و پاش چەند هەنگاوێک رۆیشتن یەکێکیان بەعەرەبی گوتی :( قاچت بەرزکەوە قادرمەیە) بەر لەوەی قاچم بەرزکەمەوە گوێم لێ بوو لەبەرامبەرم دا دەرگایەکی ئاسن کرایەوە، تەنیا یەک پلەبەرز بوومەوەو چوومە ژورێکەوە دەرگا ئاسنیەکەیان لە پشتمەوە داخست، هێشتا پەڕۆکەی بەر چاوم نەکرابۆوە وامدەزانی ژوورێکەو هەر منی تێدام پێشتر لە ئۆتۆمبێلەکەدا ئەوەندەیان پێ لەقە دابوو بەپشتی سەرما بەقەموری دەرۆیشتم نەم دەوێرا سەرم بەرزکەمەوە یەک دوو هەنگاو چوومە پێشی پێم نا بەشتێکدا لەقاچی مرۆڤ دەچوو، لەپڕ یەکێک هاواری کرد:( ئای

قاچم) لەو کاتەدا لەکاردانەوەی دەنگی ئەو مرۆڤە بەخێرایی سەرم بەرزکردەوە، وەختێکم زانی سەرم دا بەسەقفێکی ئاسنداو زرنگەی مێشکم هات، هەر بیرم دەکردەوە ئاخۆ ئێرەچی بێت بۆچی سەقفەکەی هێندە نزمە؟! ئا لەو بیرکردنەوەیەدا بووم لەدەستە راستمەوە دەنگێکی نزم هات کە پێ دەچوو کوڕێکی گەنج بێت لێی پرسیم: ( ئەرێ کاکە تۆ چیت؟ تازە گیراوی یان سجنی کۆنی؟) گوتم: (تازە گیراوم، تۆ پێم بڵێ ئێرە چییە، ژوورە یان سجنە چییە؟) لەولاوە دەنگێکی تر بەپێکەنینەوە گوتی: (بەقوربان ئێرە ناو حاویەی زبڵە) سەرەتا باوەڕم نەکرد وام دەزانی سوعبەتم لەگەڵ دەکەن، گوتم: ( دەباشە دەی جێیەکم بۆ بدۆزنەوە بادانیشم) بەرلەوەی دانیشم دەنگێکی تر پرسی: ( ئەرێ تۆ لەدەرەوە هاتویت ئێستا چ کاتێکە شەوە یان ڕۆژە؟!) گوتم: (بەیانی زووە).

گوێم لە چەند دەنگێکی تربوو یەکێک پێ دەکەنی یەکێکی دی نقەنقەو هاوار هاواری ئازاری جەستەی دەهات، تومەس ئەم حاویەی زبڵە ژووری پێشوازی زیندانیە نوێکانەو پڕە لە زیندانی ئیدی لەناو خۆیاندا جێیەکیان بۆکردمەوەو دانیشتم چاوم هەر بەسترابوو، بەڵام دەستم ئازادبوو بۆیە بەدەستە ڕاستم هێدی هێدی لایەکی پەڕۆ ڕەشەکەم لەسەرچاوم لابرد.. تەماشا دەکەم زۆر تاریکە وبەراستی ئەمە حاویەی زبڵە.. سەیرێکی دەورریەری خۆمم کرد جگە لەمن (٧)گەنجی دیکەی تێدابوو، دوانیان زۆر شێوەیان لەیەک دەچوو پێ دەچوو برابن یەکێکیان دەست و قاچی ئاوسابوو وا دیاربوو زۆریان لێ دابێت، براکەی تر سەری شکێنرابوو ڕوومەت و لاملی هەمووی خوێن بوو، هەر حەوتیان لەپشتەوە پەلبەست کرابوون، هەموویان جلی ئاسایی ناوماڵیان لەبەردابوو، ئیدی بیجامەو فانیلەی عەلاگەو کراس هەموویان پێ خاوس بوون دوایی بۆم دەرکەوت دەدوانزە ڕۆژ پێش من گیراون و ئەو دوانەش کەلەیەک دەچوون جمکە برابوون ناویان (فەرەیدون و فەرهاد) بوو.

یەکێکیان لێی پرسیم: (تۆ خەڵکی کوێی لەسەر چی گیراویت؟) گوتم: ( ماڵمان لەسەرچنارە) ئیدی درێژەم بەوەڵامەکەم نەدا، ئا لەو کاتەدا گوێم لەدەنگی چەند کەسێک بوو لەدەرەوەی حاویەکە بەعەرەبی قسەیان دەکرد بۆیە خێرا پەڕۆکەی سەرچاوم دادایەوە، لایەکی دەرگای حاویەکە کرایەوە

گوێم لەدەنگی مەنجەڵ و کەوچک و قاپ و قاچاخ بوو.
یەک دوو سەمونی ڕەقیان فڕێ دایە بەردەممان ئینجا گوێم لێ بوو یەکێکیان بەعەرەبی گوتی: (لیش ماکلبج؟)... بۆچی کەلەبچە نەکراوی؟ بەراستی من نەمزانی مەبەستیان کێیە بۆیە وەڵامم نەدانەوە، ئەوەندەم زانی بەیەک زللە شلەپەی لەلا ڕومەتم هەستاند و گوتی: (و یاک لیش ماتجاوب)... لەگەڵ تۆمە بۆ وەڵامم نادەیتەوە؟ منیش زۆرم پێ ناخۆشبوو، بەلام بێ دەسەلاتیش بووم ئیدی گوتم: (ئێ وەرە کەلەبچەم بکە، من چوزانم بۆچی کەلەبچە نەکراوم!) ئیدی دەرگایان داخست و ڕۆیشتن بەرلەوەی لەحاویەکە دووربکەونەوە گوێم لێ بوو یەکێکیان بەعەرەبی بەوی دیکەی دەگوت: (بەلام ئەوانە کەلەبچە کراون، چۆن دەتوانن نان بخۆن؟!)ئەوی دیکە وەڵامی دایەوە: (گوێ مەدەرێ ئێستا دەنێرین بەشوێنیانداو دەیانبەنە سەرەوە لێرە نامێنن).. لەنێو زیندانیەکانی حاویەکەدا من لەهەموو یان باشتر عەرەبیم دەزانی بۆیە گفتوگۆی نێوان ئەو دوانەم بۆ کردن بەکوردی گوتم: ( ئەوە دەڵێ دەمانبەنە سەرەوە، ئاخۆ سەرەوە کوێ بێت؟) یەکێک لە زیندانیەکان ناوی عەلی بوو هەر پێ دەکەنی ئەو وەڵامی دامەوە گوتی: ( دەزانم سەرەوە کوێیە زۆرباشە بەس رزگارمان کەن لەناو ئەم ئاسنە) نیو سەعات دوای ئەوەش هێشتا کەس دەستی نەبردبوو بۆ سەمونەکان چونکە ئەوان چاوبەستراو و کەلەبچە بوون، دەمویست چاوبکەمەوەو سەمونەکەیان بەسەردا دابەش بکەم، بەلام لەخۆمەوە گومانم لەو عەلیە هەبوو چونکە زۆر پێ دەکەنی! بێگومان لەم گومانەدا بەهەڵەداچوو بووم بەهەر حاڵ نیو سەعاتی دیکەی برد دووبارە دەرگای حاویەکەمان کرایەوە، گوێمان لەدەنگی ئۆتۆمبیل بوو بەرامبەر دەرگای حاویەکە دەهات ئیدی ئەوەبوو یەکە یەکە پڕیان پێدا دەکردین و فڕێیان دەدایانە ناو ئۆتۆمبێلێکی داخراوەوە دوای ئەوە ئۆتۆمبێلەکە نزیکەی (١٠٠)مەترێک ڕۆیشت دەرگایەکی گەورەکرایەوە، لەوێش یەک یەک پەلیان گرتین و فڕێیان داینە خوارەوە ئینجا بە پێ بردیانین زوو زوو دەیانگوت (سەردانەوێنن) نەماندەزانی ئاخۆ ئەم شوێنە کوێیە، لەو بڕوایەدا بووم ئەشکەوت بێت، بەلام لەبەر ئەوەی پێم خاوس بوو دەمزانی زەویەکە کاشیە نزیکەی (٢٠) مەترێک ڕۆیشتین و پاشان گوتیان دەی بەریز

دانیشن بەر لەوەی دابنیشین یەکی شەق و زللەیەکیان لێ داین پاش چەند دەقیقەیەک یەکێک بە کێبلێی کارەبایی بەربووە قاچ و قوڵمان ئیدی ئێمەش زیاتر خۆمان گرمۆڵە دەکرد، گوێم لەدەنگە دەنگ و گفتوگۆی ئەمنەکان بوو بەعەرەبی باس باسی من بوو یەکێکیان دەیگوت: (وەرە وەرە بزانە ئەمە چەند بچووکە) ئەوی دی دەیپرسی (ئەوە چیە گێرە شێوینە یان دزە؟!) لەولاوە ئەمنێکی تر دەیگوت: (چیە ئەوە چی کردووە؟) ئیدی هەموو بەکۆمەڵ دایانە قاقای پێکەنین. ئەو پیاوانە هەر چۆنێک بوو دەیانویست خۆمانمان لا سوک بێت دەیانویست وامان تێ بگەیەنن، کە ئەوان ئێمە بەخەڵکێکی هیچ و پوچ و بێ دەسەلات دەزانن، واش نەبوو ئەوان وێڕای پەلی بەستراوو چاوی بەستراومان هەر لێمان دەترسان ، بەهەرحاڵ ئەو هات و هاوار و پێکەنینە لەچرکەیەکدا هەر هەمووی وەستا ئەو حەوشەیە بەتەواو بێ دەنگ و کش مات بوو گوێم لەتەپەی پێلاوێک بوو لێمان هاتە پێشەوە، لەپڕ دەنگێکی گڕ بەعەرەبی گوتی: (چاویان بکەنەوە) کە پەرۆکەی چاویان کردینەوە پاش چەند چرکەیەک ئینجا بەر چاومان روون بۆوە وردە وردە سەرمان هەڵبڕی، کە دەبینم (رائید تەها) بوو، ئەم پیاوە زۆر لەگەنجانی سلێمانی دەیانناسیەوە، چونکە هەمیشە خۆی و پاسەوانەکانی بەناو شەقامەکانی شاردا دەسوڕانەوەو ئەزیەتی خەڵکیان دەدا، رائید تەها بەپیاوێکی دەسەڵاتداری ناو دەزگا سەرکەوتکەرەکانی ڕژێمی عێراقی ناسرابوو، وەک جەلادێکی بێ رەحم و دژ بەکورد ناوی دەرکردبوو، خوێنڕێژێکی کەم وێنە بوو لەراپەڕینە شکۆدارەکەی ئاداری ١٩٩١ی خەڵکی کوردستاندا لەناویان برد، رائید تەها گەنجێکی باڵا بەرزی سمێڵ ڕەش بوو ئەو ڕۆژە قاتێکی چاکەت و پانتۆڵی پۆشیبوو لەدوورەوە بۆنی عەترەکەی دەهات زۆر خۆشبوو، دیاربوو وەکو دەسەڵات لەهەموو ئەوانەی تر گەورەتر بوو، چونکە فەرمانی بەسەر هەموویاندا دەکرد، بەر لەهەموو شت رائید تەها سەیرێکی پیاوەکانی کردو پرسی: (ئەمانە نانیان خواردووە؟!) کەچی (عەلی زیندانیەکەی ناو ئێمە وەڵامی دایەوە) (نەخێر..نەء) ئینجا رائید تەها خێسەیەکی لە عەلی کردو بە پاسەوانەکانی گوت: (بۆچی نانتان نەداونەتێ؟) یەکێکیان گوتی: ( گەورەم کەلەبچە کرابوون) بەهەر حاڵ فەرمانی دا خواردنمان بۆ بێنن، ئیدی

هەر لەو شوێنەدا یەک مەنجەڵی ڕەشی فافۆنی لەسەد لاوە قوپاویان بۆ هێنایین پڕبوو لە شۆربای نیسک، لەگەڵ چەند سەمونێکی کۆنی ڕەقەوە بوو لەبەردەماندا فڕێیاندا. دەستمان کرد بەنان خواردن ئەو حەوت کەسەی لەگەڵ من لەو حاوەیەیەدا زیندانی بوون کە دوایی ناسیمن ئەوەی لەیادم مابێ (فەرهاد و فەرەیدون بوو برای جمک بوون) عەلیە سوور ،نزاری نانەوا، عومەری نوری بەگ، ئیدی هەرچۆنێ بوو نانمان خوارد ئەوە لەکاتێکدا کەگوێمان لێ بوو لەهەموو لایەکی ئەوحەوشەیەوە هاوار هاوار و ناڵەناڵی زیندانی دەهات کە لێیان دەدان و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکردن بەتایبەتی لەقاتی سەرەوە، دوایی بۆمان دەرکەوت ئەوە (دائیرەی قواتی طەواری چوارباخ بوو) لە سلێمانی بەتەواری چوارباخ ناسرابوو، ئەو شوێنە پێشتر قوتابخانەیەکی ناوەندیی کچان بوو پاشان کرابووە دائیرەی ئەمن و ڕۆژانە دەیان گەنجی کورد لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا لەو شوێنەدا گیانیان لەدەست دەدا.

بەدەم نان خواردنەوە ژێراوژێر تەماشایەکی دەوروبەری ڕاڕەوەکەم کرد، بینیم هەمووی پارچە جل و بەرگی ئەو زیندانیانەیە کە ئەشکەنجە دەدرێن (بیجامە، کراسی خوێناوی، نەعلی دڕاو، پشتێن، جامانە، لەفاف، لۆکەی خوێناوی، تاکە پێڵاو) ئیتر مرۆڤ کە لەو دیمەنەی دەروانی دەیزانی ئەمە چ مەملەکەتێکی ئیرهاب و خوێنرێژبە، هەر بیرم لەوە دەکردەوە تۆ بڵێی جارێکی دی ژیانی ئاسایی ببینینەوە، ئاخر بەهەر لایەکی ئەو بینایە دا دەرۆیشتی هات و هاواری خەڵک بوو، تەنانەت گوێم لەدەنگە دەنگی ئافرەتیش بوو کە بەکوردیش هاواری جەستەیان دەکرد، تومەس زیندانی ئافرەتیشی زۆر لێیە. پاش نان خواردن رائید تەها فەرمانی دا کە بمانبەنە سەرەوە، ئیدی بەبێ ئەوەی چاومان ببەستنەوە بە پێپلیکانەکاندا بردیانینە سەرەوە، ئەوەبوو لەناو ڕاڕەوەکەی قاتی سەرەوەش پڕبوو لە زیندانی بەسەر یەکدا کەوتبوون، دیاربوو ڕۆژانە ماوەی تایبەتیان هەبوو بۆ ئازارو ئەشکەنجەدانی زیندانیەکان. بەراستی تەواری چوارباخ ناوەندێکی تۆقێنەربوو بۆ سەرکوتکردنەوەی هەموو بیروباوەڕێکی شۆڕشگێڕی و ئازادی خوازی، ئەو دائیرەیە هێندە سامی هەبوو گەنجان نەیان دەوێرا بەدوو کۆڵان نزیک ئەو دائیرەیەش گوزەر بکەن، پاسەوانانی ئەو بینایە هەمیشە

لەخـۆیان بەشک بوون، گـومـانیـان لەهەمـوو رێبـوارێک هەبوو کـە بەو شەقامانەی ئەو دەروبەرەدا بڕوات. ئیدی تاگەیشتینە جێی مەبەست دیمەن و کارەساتی ویژدان هەژێنمان بینی بەتایبەتی لەڕارەوەکەی قاتی سەرەوە، زۆر لە زیندانیـەکـان ڕووت و قـوت بوون ئاو بالاّیان خـوێنی لێ دەچۆڕاو هەموو گیانیان شین و مۆر بوو بۆوە بست بەبستی جەستەیان جێی کێبلّ و کارەبا بوو.

نزیکەی (٦٠-٧٠) زیندانی لەو ڕارەوەدا بەسـەریەکـدا ترشـابوون، زۆربەیان خۆزگەیان بەمردن دەخواست هەندێکیشیان ژوانیان لەگەلّ مەرگدا بەستبوو، دەرگاو پەنجەرەی ئەو بینایە تێکڕا بەبلۆک گیرابوون دوایی بۆم دەرکەوت کە بۆچی چاویان نەبەستینەوە مەبەستیـان ئەوەبوو بەو دیمەنانە بمانترسێنن و زوو دان بە راستیـەکـاندا بنێین چونکە نێـوان ئێـمـەو ئەو زیندانیـانەی کـە بەخـراپترین شـێـوازی ئەشکەنجەدان هەمـوو گـیـانیـان شکابـوون تەنیـا مـوحا بەرەیەکی ئاسن بـوو، هەندێ لەزیندانەکان لەخاچ درابوون هێشتـا هەناسـە بڕکێـیان بوو، زیندانیەکی دیکە بەعەمـودێکەوە خوێن بە ناوگەلّیدا دەهاتە خوارێ دیاربوو بتلّی شووشەیان لەکۆمی بڕیبوو ئیـدی کەف لەدەمی دەهاتە دەرەوە هەر مـرخـە مـرخی بوو. ئای لەو دیمەنە ئازار بەخـشـانەی لەو دیو مـوحـاجـەرەکـەوە هەبوون دلّڕەقـتـرین کـەس لەئاستیـاندا تەسلیم بەویژدانی دەبوو، ئا لەو کاتانەدا بیرم لەخۆم دەکردەوە تۆبلّـێی ئێـمـەش بەو دەردە بەرن بێ شک هەر سـەرەمـان دێت،بەلاّم ئاخـۆ تاکەی لەم ولاّتەدا ئەم دیمەنانە بەردەوام بن؟!.

دیمەنەکـان خەمـێکی قـولّی دامێ و ترسـێکی بێ وێنەی لەدلّمدا دروست کرد، لەنێـو ئەو زیندانیانەی ناو ڕارەوەکـە وەستـا جەلال و عومـەر پاسۆکم ناسیەوە لە پڕ دەنگی پیاوێکی ئەمن رایچلّەکاندم کە گوتی: (عەلاوی، ئەو زیندانیانە وەربگرە) عەلاویش یەکێک بوو لەو پاسەوانانەی بەرپرسی زیندانیەکانی ئەو ڕارەوە بوو لەدوورەوە عەلاوی بە شەلەشەل هات دیاربوو ئیسقانی حەوزی شکابوو پیاوێکی سپیکەلەی کەلّەگەت بوو نیتاقێکی عەسکەری بەدەستـەوە بوو، دەستێ جلی مـغـاویری پۆشیـبـوو، ئەوەبوو بەخوارو خێچی بەرامبەرمان هات و لیستێکی بەدەستەوە بوو یەکە یەکە ناوی زیندانیـە تازەکانی خوێندەوە، چوارەم ناو من بووم، لەو کاتەدا میزم

زۆر دەهات وەخت بوو مـیـزەڵانم دەتەقی، بەڵام نەم دەتوانی قـسـە بکەم، ئینجا دەرگـای ڕارەوەکـەیان بۆ کـردینەوەو بەشـەق و زللەو قـایش و کـێبڵ یەکەیەکە لێیـان داین، کە گەیشـتینە پەنا دیوارەکانی ئەو ڕاڕەوە تێکڕای دیوارەکان بە پارچە پلێتی ئەستوری ئاسن ڕوو پۆش کرابوون هەریەکەولەو پلێـتـانە ئەڵقـەیەکی پێـوە لەحیم کـرابوو بۆ بەسـتنەوەو کـەلەپچـە کـردنی زیندانیـەکـان، ئینجـا لەژوورەوە باشـتـر لە زیـندانیـەکـان ورد بوومـەوە، هەر هەموویان هێندە ئازار درابوون ڕەنگی مردویان لێ نیشـتبوو وەستا جەلال و عـومـەر پاسـۆک هەربە هەڵواسـراوی مـابوونەوە ئا لەو سـەرو بەندەدا پاسـەوانێک لەوسـەری ڕارەوەکـەوە هاواری کـرد: (عـەلاوی ئاگـادار بە جەنابی رائیـد هات) ئیـدی دیسـان زیندان و پاسـەوانەکان یەک پارچە بێ دەنگی باڵی بەسەردا کێشـان، رائیـد تەها ویەک دوو پاسەوان خۆیان کرد بە ژووردا پێش هەمـوومان رائیـد تەها هاتەلای وەستا جەلالەوەو پێی گوت (ها.. شلۆنک؟) ئەویش تەنیـا سـەیرێکی ناوچەوانی رائیـد تەهای کـردو هیچ وەڵامی نەدایەوە .وەسـتـا جەلال هەمـوودەم و پلی خوێن بوو، وەزعی تەواو پەشـۆکـاو بوو بۆیە رائیـد تەها فـەرمـانی دا لەو پلێـتـەی بکەنەوەو جلەکانی لەبەرکەنەوە. هاوکـات عـومەر پاسۆکیش حاڵی لەوەسـتا جەلال خراپتر بوو چونکە ئەم کـوڕێکی قـەڵەوو تێکسـمـراوبوو ئینجـا لە لێـداندا ئێسقانی حەوزیشـیـان شکاندبوو بۆیە ئەویشیان لە پلێتەکەکردەوە ، بەڵام ئەم لەبەر شکانی ئێسقانەکانی نەیتوانی بە پێوە بوەستێ بۆیە دەستبەجێ کـەوت بەزەویداو لەهۆش خـۆی چوو،خـێـرا کـۆمـەڵێ پاسـەوان هاتن وعومەریان ڕاکێشا بۆ خوارەوە، ئیدی ئێمەوامانزانی مردووە نەمانزانی بۆ کوێیـان برد!! بەبینینی ئەو دیمەنانە زۆر نا ئومێدبووم، یەکەم جارم بوو لە ژیانمدا خـۆزگـەی مـردن بخـوازم لەدڵی خـۆمـدا دەمگوت ئەگـەر بکەومـە بەردەست ئەم گورگە جەلادانە داخۆ چیم لێ بکەن؟!، دوعـام دەکرد خـوایە گـیـان بەزەییت پێـمدا بێتـەوەو وا لەیەکـێکیـان بکەیت هەر ئێسـتـا یەک فـیـشـەک بنێ بەسـەردڵمـەوە و بمکوژێت ئیـدی دەبێ چ هەسـتـێـک لەوە ناخۆشتربێت کەمرۆڤ ژوانی لەگەڵ ئەو هەموو ئازارەدا هەبێت. پاش ئەوەی رائید تەها چووە دەرەوە سەرنجم دەدا زیندانیەکان بەبێ ناو خوێندنەوە یەکە یەکـە دەبرانە خـوارەوەو دەهێنرانەوە، یەکـێک لە زیندانیـەکـان گـوتی :(

هەستێ کاتی ئاودەستە) لەو بەندیخانەیە دا کاتی تایبەت هەبوو بۆ دەست بە ئاو گەیاندن، منیش دڵم خۆشبوو چونکە وەک باسم کرد میزەڵانم وەخت بوو بتەقێ، ئیتر لەو ڕۆژەوە زانیم ئەو کاتە کاتی ئاودەستە، بەڵام چۆن ئاودەستێک!! بەجارێ چوار پێنج کەسیان بەپاڵ و بەراکردن دەهێنایە خوارەوە، لەخوارێ دوو ئاودەستی لێ بوو بە لەوحی ئەلەمنیۆم سەریان گیرابوو، ئینجا دوو دوو دەیانارد ینە ئاودەستەکانەوەو لەچرکەیەکدا چەندین جار بەعەرەبی هاواریان دەکرد (خێراکەن دەی)، لەبەردەم دەرگای ئاودەستەکە جەلادێک بەدارێکەوە وەستابوو، بەر لەوەی بچینە ژوورێ دارێکی دەکێشا بەقاچماندا جەلادێکی دیکە لەسەر سەقفی ئاودەست دەوەستاو بەردەوام بەپێ لەقە دەیکێشا بە لەوحە ئەلمنیۆمەکەداو هاواری دەکرد (خێراکەن، خێراکەن دەی) ئیدی بەشێوەیەک شپرزەو تەنگاویان دەکردین زیندانی وا هەبوو ئەوەندیان لێدابوو دەستەکانی ڕەق هەڵاتبوون.
لەو ماوە کورتەدا تەنانەت نەیدەتوانی بیجامەکەشی دابکەنێ زیندانی هەبوو لەترسی هاوار هاوار و هەڕەشەی جەلادەکان حاڵەتی دەروونی تێک دەچوو هیچ میزی پێ نەدەکراو ناچار دەهاتە دەرێ. ئیدی هەر چۆنێ بوو بەپاڵ و بەلێدان لەناو دەستەوە بردیانینەوە بۆ ناو هۆڵەکە پاش ئەوەی کەمێک حەوامەوە، بەوردی بەروخساری زیندانیە تازەکانی دوا خۆمانم کرد سێ چوارێکم لێ ناسینەوە ئەوانیش سەر بەرێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون، بەهێواشی یەکێکیان لێی پرسیم: (کەی گیراوی؟) گوتم: (ئەمڕۆ) هەواڵی سالارم لێ پرسی گوتی: ( نایناسم شکڵ و شێوەی چۆنە؟) منیش وەسفی سالارم بۆ کرد، کەچی لەولاوە یەکێک لەزیندانیەکان گوتی: (ئەگەر سالاری بۆباخچی دەڵێی ئەوەتا لەهۆڵی ئەو دیو من دەیناسم) ئیدی ئاهێک بەدڵمدا هات و لەدڵی خۆمدا گوتم( سوپاس بۆ خوا شوکر لە سێدارە نەدراوە) لەوە بەدواوە چاوەڕێی ئەو ڕۆژەم دەکرد سالار ببینم و بەکەماڵی ئیسراحەت و بەبێ ترس قسەی لەگەڵ بکەم، بەراستیش هیچ ترس لەدڵمانەما بوو چونکە ئەوەی لێی دەترساین روویدا. بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ئەم بارودۆخە بەردەوام بوو لەم ڕارەوەوا، هەستانە سەر پێ قەدەغە بوو، تەنیا ئەو کاتانە نەبێت کە پیاوانی ئەمن و پاسەوانەکان دەرگایان دەکردەوە دەهاتنە ژوورێ. لەگۆشەی بنمیچی

سەقفەکەوە بڵندگۆیەک هەڵواسرابوو ئەو بڵندگۆیە بەوایەرێک دەنگی هات و هاواری ژووری ئەشکەنجەدان (غـرفـه التـعـذیب)ی دەگـواستـەوە بۆ زیندانەکانی سەرەوە واتە بۆ ناو هۆڵەکەی ئێمە. بێگومان هەڵواسینی ئەم بڵندگۆیەش شێوازێکی نوێی ئەشکەنجەی دەروونی و ترساندن و تۆقاندنی بەردەوامی زیندانیـەکـان بوو، چونکە لەژووری ئـەشکەنجەدان مـایکرۆفـۆن هەبوو دەنگەکەی دەدایەوەو بە بڵندگـۆکـە. هەردەم نادەمێ عـەلاوی دەهات وچەند نـاوێکی دەخـوێندەوەو دەیبـردنە خـوارەوە بۆ لێدان و ئەشکەنجـەدان ئیدی بەردەوام گوێمان لەهاوار و گریان و ناڵەناڵ بوو جاری واهەبوو لێدان و ئەشکەنجـە پتـر لە (١٠)سـەعـاتی دەخـایاند، بەردەوام ئێـمـە گـوێـمـان لەوهات و هاوارەیان بوو کـەسـیش نەیدەوێرا قـسـە لەگـەڵ کـەسـێکی تردا بکات، تەنیـا تەمـاشـای یەکـتریمان دەکـرد وەک بڵـێـی بەچاوگـفـتـوگـۆمـان سازادابوو، پاش سێ ڕۆژ لەو بارودۆخە بەیانیەک زوو دەوروبەری سەعات (٧) دەرگا ئاسنەکە کرایەوە، هەمووما‌ن خەبەرمان بۆوە هەر کەس چاوەڕێی ناوی خۆی دەکـرد بیبـەن بۆ ژووری ئەشکەنجـە بۆ لێکۆڵینەوە، پاسەوانی بەردەرگـاکـە بە ئەمنەکـەی گـوت: ( ها کـێت دەوێ؟) جـەلادەکـەش گوتی: (ئەوەی سەرچنار ئەوەی دوو سێ ڕۆژ لەمەوبەر هێنامان... شێرزاد فـەرمـان) دەسـتـبـەجێ زانیم هاتوون بۆ ئەوەی ببـەن بۆ لێـدان و لێکۆڵینەوە،بەڵام بۆ چەند سـاتێک دڵخـۆشی خـۆمم دایەوە گـوتم ڕەنگە مـواجـەهەم هاتبێ تەمـاشـایەکی زیندانیـەکـانی دەوروبەری خـۆمم کـردو هەستـامـە سـەرپێ سـەرنجم دا زۆر بەسـۆزو بەزەییەوە لێم دەڕوانن، دیاربوو دڵنیـابوون لەوەی کە دەمبـەن بۆ ئەشکەنجەدان ئەمنەکە گەنجێکی کامڵ بوو قژ ئاڵۆ زکاوێکی گەنم ڕەنگی دەم و چاو سێ گۆشە بوو( بەر لەوەی بگەینە پێپلیکانەکان، رای گرتم) پرسی:

- ناوت چیە؟

* شێرزاد

- لەسەرچی گیراوی

* نازانم

دوای ئەو وەڵامـەم دەم وچاوی گرژو مۆن کـردو دەسـتـێکی هەڕەشـەی لێ راوەشـاندم وگـوتی: (لەخـوارەوە نەڵێی نازانم ها... یەکـسـەر دەتکوژن)

ئینجا پالێکی پێوەنام و پێش خۆی خستم گەیشتینە سەر پێپلیکانەکان و دیسان قۆڵی راکێشامەوە بەهێواشی لێی پرسیم: ( مورادی باتا چی تۆیە؟) کەوای گوت کەمێک دڵم خۆش بوو، گوتم: (مامە برای باوکمە) ئینجا گوتی:( دوێنێ مورادی مامت هاتۆتە لام و داوای لێ کردم نەیەڵم ئازارت بدەن ئینجا تۆش چیت هەیە بەراستی پێم بڵێ و درۆم لەگەڵ مەکە بەراستی قسە بکە کێ تۆی تووشی ئەم گێچەڵە کرد؟ ناوەکەیم پێ بڵێ بۆ ئەوەی ئەو بگرین و تۆ بەربدەین) کە ئەو قسانەی کرد هیچ وەڵامم نەدایەوە، ئیدی کەوتینە ناو ڕارەوەکەو تا ئەو کاتەی کردمی بەژوورێکی بچوکدا، ژوورەکە چەند رەحلەیەکی قوتابخانەی لێ بوو بەنارێک و پێکی دانرابوون وێنەیەکی (سەدام حوسێن) بەدیوارەکەوە هەڵپەسێرابوو، لەزەویشدا چەند پارچە دارو تەختەیەکی شکاوی لێ بوو، دەیان پارچە پەڕۆ بۆ چاو بەستنەوەو جووتێ کاڵەی وەرزشی کەوتبوو. جەلادەکە کە دوایی بۆم دەرکەوت مفەوەزی ئەمنەو ناوی مەحمودە، بەجێی هێشتم ولەو دیوەوە دەرگای ژوورەکەی لێ داخستم، ماوەی (٥-٦)دەقیقە بەتەنیا لەو ژورەدا مامەوە ئەوەندەم زانی مفەوەز مەحمود دووبارە هاتە ژوورەوە، بەڵام ئەمجارەیان قۆڵی گەنجێکی سپیکەڵەی قۆزی گرتبوو، هەردوو چاوی بەپشتێنێکی ڕەش بەسترابۆوە، دەستەکانی لە پشتەوە کەلەپچە کرابوون دیاربوو زۆریان ئازار دابوو، پانتۆڵێکی ڕەش و کراسێکی ڕەشی لەبەردابوو هەموو گیانی تۆزو خۆڵ بوو دەم و چاویان شین و مۆر کردبۆوە بەووردی سەرنجم دا ناسیمەوە... ئەو گەنجە سالار بوو ئەو سالارەی براو هاوڕێی وهەڤاڵ و هاورێبازم بوو، ئەو سالارەی دەیان وانەی ئازایەتی و مەردایەتی و کوردایەتی لێوە فێر بووم لەمێژبوو نەم دیبوو، لەدڵی خۆمدا دەمگوت ئای سالارگیان خۆزگە لەم وەزعە دا تۆم نەدیایە حەزم دەکرد هەستمە سەر پێ و توند لە ئامێزی بگرم، بەڵام چی بکەم نەدەکرا ئەو ئاواتەم بهێنمەدی، مفەوەز مەحمود پشتێنەکەی چاوی سالاری کردەوە هەردووکمان وا خۆمان نیشاندا کە یەکتری ناناسین مفەوەز مەحمود بەپێکەنینەوە گوتی: (ئەوە بۆچی سلاو لەیەکتری ناکەن خۆ لەمێژە یەکتریتان نەدیوە؟!)منیش گوتم:

+ ئەوە کێیە؟

- سالارە سالار کوێرا لەبیرت چۆوە نایناسیت؟!

+ نەخێر نایناسم.
– ئەو کلاواتە لەگەڵ من مەکە من باشترین پسپۆڕی لێکۆڵینەوەم.
ئینجا بۆ ماوەی چەند چرکەیە بەتوڕەییەوە تەماشای سالاری کرد وەک پێمان بڵێ گومانم لەهەموو وەڵامەکانتان هەیە، سالار لەو کاتەدا بەمفەوەز مەحمودی گوت: (بۆچی وا سەیرم دەکەیت بڕوام پێ بکە نەدیوەمەو نەدەیناسم) لێرەدا مفەوەز مەحمود توڕەبوو هاواری کرد (باش گوێم لێ بگرن بایەک قسەتان پێ بڵێم، من ئەگەر بڕوا بەهەموو دنیا بکەم بڕوا بەئێوە ناکەم)پاشان وردە وردە زمانی خۆی هێمن و هێواش کردەوەو گوتی: ( مەترسن سەیرم مەکەن وابە عەرەبی قسەتان لەگەت دەکەم، منیش ئەسڵم کوردە راستیەکەم پێ بڵێن بەڵێن بێ رزگارتان دەکەم!) سالار بەو پەڕی متمانەو هێزەوە گوتی:( چەند ڕۆژە چیم پێ گوتووی هەر ئەوەیە بڕوا بکە ئەو شێرزادەی تۆ باسی دەکەیت نەدیومەو نە دەیناسم، من بۆ دواجار پێت دەڵێم هیچ نیم و هیچم نەکردووە) ئەوە یەکێک بوو لەهەڵوێستە بەرزەکانی سالار، هەمیشە دوژمنی خۆی بەبچووک دەزانی باکی بەئازارو ئەشکەنجە نەبوو، هەمیشە بەسەر بڵندی خۆی نیشان دەدا، ئیدی پاش ئەوەی مفەوەز مەحمود نەیتوانی یەک وشەمان پێ بدرکێنێ گوتی: (دیارە قسەی خۆش لەگەڵ ئێوەدا هیچ سوودی نییە) بۆیە داینشاندین و چاوی هەردووکمانی بەستەوەو لەدواوە کەلەبچەی کردین، بەر لەوەی بەجێمان بێڵێ دووبارە ویستی ئامۆژگاریمان بکات: ( ئێوە منداڵن چیتان هەیە بەراستی قسە بکەن، دایک وباوکتان گوناحن با لەوەزیاتر چاوڕێتان نەکەن، رەنگە لەم ڕۆژانەدا سەرۆکی فەرماندە (سەدام حوسێن) سەردانی ئێرە بکات و لێبووردنتان بۆ دەر بکات) دیسان هیچ وەڵامێکمان نەدایەوە. ئیدی دەنگی پێی هات و دەرگای ژوورەکە داخرا، لەوە بەدواوە گوێمان لەهیچ دەنگێک نەبوو تاوەکو (٢٠) دەقیقە زیاتر ژوورئاوا بێ دەنگ بوو ،بەڵام من وسالار هیچ قسەیەکمان نەکرد بەیەکەوە، ئێمە وامانزانی مەحمود چووەتە دەرەوەو ژوورەکە کەسی تێدانەماوە، لەپڕ لەپشتمانەوە مەحمود بەعەرەبی هاواری کرد:( سەگبابینە، بۆ قسە ناکەن؟ وەڵاهی راستیەکەم پێ نەڵێن باوکتان.......م) توومەس بەفێڵ دەرگاکەی داخستووەو دەیویست پێکەوە قسەیەک بکەین و بیسەلمێنین کە ئێمە

یەکتری دەناسین. وەختێکم زانی لەولاوە جەلادێک بەعەرەبی هاواری کرد (گەورەم بوتڵ بێنم!!) مەحمود لەوەڵامدا گوتی: (نا..نا بوتڵەکە مەهێنە ئەمانە کوڕی باشن ئێستا هەموو راستییەکانمان پێ دەڵێن) پاش ساتەوەختێک خامۆشی، لەپڕێکدا بەکێبڵ هەر لەپشتەوە کەوتە لێدانمان ئێمە بەچاو بەستراوی و بەکەلەبچەکراوی چوار مشتەقی لەسەر زەوی دانیشتبووین وئەویش بە هەموو هێزو توانای کێبڵی لێ دەوەشاندین، جارێک لەمن و جارێک لەسالار ئیدی دەست و پشت وسەروقاچمانی بەکێبڵ هەلا هەلاکرد، دیاربوو سالار بەر لەمن زۆری لێ درابوو بۆیە تارادەیەک لەسەر ئەو ئەشکەنجەیە راهاتبوو، بەڵام من ئەوە یەکەم جاربوو بەکێبلی کارەبایی ئەشکەنجەم بدەن ئازارم زۆر بوو رەنگە نەتوانم بەقسە باس لەو هەموو ئازارە بکەم هەر کێبڵێک کە بەرهەر شوێنێکم دەکەوت تێکڕای جەستەم دەینالاند، شوێن لێدانی کێبڵ لەجەستەمدا وەک سوتاوی وابوو بەشێوەیەک پاش چەند رۆژێکیش هەر دەکزایەوە، بەهەر حاڵ مفەوەز مەحمودی جەلاد بەردەوام بوو لەلێدانمان و سالاریش وەک هەموو جارەکانی تر پڕ بەو ژوورە هاواری دەکردو بەکوردی جنێوی بە مفەوەزەکە دەدا، دیاربوو جنێوو هات وهاواری سالار هێندەی تر رقی مفەوەز مەحمودی ئەستورتر دەکرد، بۆیە هەستم دەکرد زۆر بەتوندتر لەسالاری دەدا پاش چارەکە سەعاتێک لێدانی بەردەوام بەکێبڵ دەنگی سالار نەما ئەگەرچی بەچاونەمبینی، بەڵام هەستم کرد لەهۆش خۆی چووەو بوراوەتەوە. ئینجا گوێم لێ بوو مفەوەز مەحمود بەپاسەوانە عەرەبەکەی تری گوت: ( من ماندووبووم دەچم ساتێک دەحەسێمەوە، هابەو کێبڵە لێیان دە تادەگەڕێمەوە) ئیدی دەنگی دەرگا هات و ژوورەکە کەمێک بێ دەنگ بوو منیش خۆم جێڕو گرژ کردبۆوە، چاوەڕوانی ئەوەبووم ئێستا ئەو جەلادەی تر دەست بەلێدانمان بکاتەوە هاژو هوژی کێبڵ هات و چاوەڕوان بووم زرمە لەپشتی من یاخود سالاری هەڤاڵم هەستێ، کەچی کە بەوردی گوێم لەشریقە کێبڵەکە دەگرت دەیکێشا بەرەحلەکە یاخود زەوی یان بەدیوارەکەدا، بۆ ماوەی دە دەقیقەی رێک ئەم پاسەوانە کێبلی وەشاند، بەبێ ئەوەی یەک دانەی بە ئێمەدا بکێشێ، حەزم دەکرد هەستمە سەرپێ چاوەکانم بکەوە بزانم کێیە ئەو مرۆڤە بەویژدانە، هەموو راستیەکانم بۆ

ڕوون بۆوە، بۆم دەرکەوت کە مفەوەز مەحمودی جەلاد چووەتە دەرەوەی ژوورەکەو، ئەو پاسەوانەش کە لێدانی ئێمەی پێ سپاردووە، مرۆڤێکە تا سەر ئێسقان بەویژدانەو نایەوێ ئازارمان بدات، ئاخر لەنێو ئەو دامودەزگا سەر کوتکەرانەو لەنێو ئەو گورگە دڕندانە دا هەندێ جار خەڵکی زۆر بەویژدان و مرۆڤ دۆست هەڵدەکەوت، ئەم پاسەوانەش نموونەیەکی هەرەبەرزی ئەو ویژدانە زیندووە بوو، ئەو لەترسی ژیانی خۆی کێبلی دەوەشاند ،بەڵام هەر هەمووی بەدیوارو زەوی و ڕەحلەی ژوورەکەدا دەدا. بەشبە حاڵی خۆم کە ئەو هەڵوێستە جوانەی ئەو پاسەوانەم دی لەدوولایەنەوە زۆر ئاسوودە دەبووم، یەکەمیان هێندەی تر بڕوام بە ڕەوایی و ڕاستی ڕێبازەکەم پتەوتر دەبوو و زیاتر خۆم بەحەق دەزانی، دووەمیشیان ئەوەبوو دەمزانی ئەمە سەرەتای ڕۆژە ناخۆش و پڕ ئازارو ئەشکەنجەکانی ژیانی نێو ئەم ژوورە تاریکانەی دەزگا سەروکوتکەرانەیەو نموونەی خەڵکی وا بەویژدان بۆمن و بۆ هەموو زیندانیەکانی تر زۆر پێویستەو لەو ڕاستیەش گەیشتم کە (مەرج نییە ئەوەی چڕنوکی هەبێت دڕندە بێ) بەهەر حاڵ من لەم بیرکردنەوانەدا بووم پاسەوانەکە سەری لێ هێنامە پێشەوە بەهێواشی پێی گوتم: ( هەر کاتێ گوتم خۆت لەسەردەم پاڵخە دەستبەجێ پاڵکەوە) پاش چەند چرکەیەک لەودیو دەرگاکەوە دەنگی پێڵاوەکانی مەحمود هات، چونکە هێندە بەحەزەرەوە گوێم بۆ هەڵخستبوو باش ئەو دەنگەم دەناسیەوە، بۆیە بە بێ ئەوەی پاسەوانەکە پێم بڵێ یەکسەر لەسەردەم خۆمدا بەزەویدا، خێرا پاسەوانەکە پۆستاڵەکانی خستە سەرپشتی ملم ولەو کاتەدا دەرگا کرایەوە مفەوەز مەحمود بە پاسەوانەکەی گوت: (هاچی بوو.. دانیان بەراستیەکاندا نەنا؟) پاسەوانەکە گوتی: ( گەورەم زۆرم لێدان، لەوەتەی جەنابت ڕۆیشتویت هەمووگیانم شکاندن،بەڵام بێ سوودە هیچ قسە ناکەن، گەورەم ئەمەیان مندالە گوناحە لەو بڕوایەدانیم هیچ بزانێ و هیچیشی کردبێت) مفەوەز مەحمودیش بەتووڕەییەوە گوتی: ( نا..نا.. تۆ لەمانە بترسە تۆ نازانی ئەمانە چیان کردووە) بەهەر حاڵ پاش کەمێک فەرمانی بەپاسەوانەکەدا کە چاومان بکاتەوە، بەڵام بەدەست بەستراوی بمێنینەوە، زۆر بە پەرۆشەوە بووم ئەو پەرۆ ڕەشەی سەرچاوم لابرێ و بەوردی تەماشایەکی ئەو پاسەوانە بەویژدانە بکەم.. حەزم دەکرد

بزانم شکڵ و شێوەی چۆنە!! بۆیە هەر کە چاومانی کردەوە سەرنجم دا کوڕێکی گەنجی قۆزو سیما منداڵکاربوو، زۆرم خۆشویست هیوای ئەوەم دەخواست ڕۆژێک دابێ ئەو چاکەیەی بدەمەوە دەمزانی ئەم گەنجە چەندی پێ کرابێ ئازاری کەسی نەداوە، لەم سەروبەندەدا مەحمود گوتی: (ئێستا ئێوە هەر قسەناکەن؟!) منیش تەواو بێ تاقەت بووم و بە مەحمودم گوت:( من هیچم نەکردووە، تاوەکو ئێستاش نازانم بۆچی گیراوم) لێرەدا مفەوەز مەحمود پێ دەچوو قۆناخێکی نوێی لێکۆڵینەوە دەست پێ بکات لەگەڵماندا بۆیە گوتی:( زۆر باشە ئەگەر ئێوە نازانن بۆچی گیراون من پێتان دەڵێم، ئێوە سەر بە ڕێکخستنەکانی پارتین، لەکوشتنی هاورێکانی ئێمەدا لە سلێمانی بەشداریتان کردووە، ئینجا چوونەتە دەرەوە بوونەتە پێشمەرگە، ماوەیەک لەچاڵە خەزێنە ماونەتەوە پاشان گەڕاونەتەوە) دوای ئەو قسانە مفەوەز مەحمود بەپێکەنینەوە تەماشایەکی کردم و گوتی:( تۆ وێنەیەکی جوانیشت گرتووە بەجلی پێشمەرگایەتیەوە، وێنەکە لای ئێمە هەیە، بەڵام من دەزانم تۆ کوڕێکی فەقیرو بێ دەسەڵاتی لەترسی ئەوەی تەنیشتت ناوێری قسە بکەیت، ئێمە دەزانین سالار تۆی تووشی ئەو گێچەڵە کردووە،بەڵام تۆ مەترسە ئێمە ئەو دەکوژین، بۆچی لەخۆڕا خۆت بەلێدان و ئازارو ئەشکەنجە دەگەیەنی؟ دڵنیاشم تۆ هاوکاریمان دەکەیت چونکە ئەو هەتیوە (مەبەستی سالار بوو) دەیەوێ تۆش وەکو برا گۆڕبەگۆڕەکەی لێ بکات!!) (مەبەستی شەهید ساڵحی برای سالار بوو) ئینجا سەیرێکی پاسەوانە گەنجەکەی تری کردو بەدەست ئاماژەی بۆ سالار کردو گوتی: (ئەوە ناناسی؟ ئەوە برای ئەو ساڵحە بوو کە ماوەیەک پێش ئێستا لەسێدارەمان دا، ئەم خێزانە هەموویان گڵاوو چەپەڵن، هەموویان گێرە شێوێنن پێویستە لەسێدارە بدرێن) ئینجا ئاماژەی بۆ من کردو گوتی:( بەڵام ئەمەیان کوڕی باشە، مەسیحیە گوناهە سالار تووشی کردووە، من هیچی لێ ناکەم بەس بەراستی پێم بڵێ چۆن تووشیان کرد، ئیدی ئازادی دەکەین) ئەگەرچی عەرەبیەکی باشم دەزانی، بەڵام بۆ ئەوەی لەسالار بگەیەنم کە من ئامادەنیم هیچ بڵێم و هاوکات بەتەواویش سەر لەمەحمود بشێوێنم بەسەر ئاماژەم بۆ سالار کردو گوتم: ( وەڵاهی ئەوە پیاوی خۆتانەو دەتانەوێ منی پێ تووش کەن، باوەڕتان بێ نەدەیناسم و

نەدیومەو و نەمنیش هیچم) دوای ئەم قسەیەم مەحمود بەهەمرو هێزی خۆی بە پۆستاڵەکانی یەک شەقی لەکلاوەی ئەژنۆم هەڵداو هاواری کرد: (کوڕی قەحبە دەتەوێ شێتم بکەیت؟!) ئەو شەقە لەکێبڵەکان زۆرتر ئازاری دام،بۆیە هەمـوو گیانم بوو بەهێزو پڕ بەقوڕگم هاوارم کرد: (بەسە ئیتر منیش مرۆڤم وەکو ئێوە بۆ وام لێ دەکەن؟!) مەحمود گوتی: (بەخودا دیارە لەگـەڵ تۆدا هیچ سـوودی نییـە، بابچم ئەوانی ترت بۆ بهێنم) منیش بەحسابی خۆم هەڕەشەم لێ کرد. گوتم:( وەڵاهی دەبێ لای پارێزگاری سلێمانی و لای هەمـوو بەرپرسـان شکاتت لێ بکەم، چونکە تۆ بەزۆر خەڵک دەگریت و تەعزیبی دەدەیت بۆ ئەوەی بە زۆر ئیعترافی لەسەر شتی درۆ پێ بکەیت!!) مـەحـمـود بەتوندی جـرتێکی لێ داو گـوتی: (ئاخ..م بۆچی پارێزرگاریش سەر بەرێکخستنەکانی ئێوەیە؟! دەتۆ ئێستا ناوی بهێنە بزانە بەشەق پارێزگارت بۆ ناهێنمە ئێرە) منیش سەرم لەقاندو گوتم: (باشە باش) مەحمود گوتی: ( باشە باشەی چیتـە تۆ پاش کەمێکی تر لەسێدارە دەدرێیت، بەتەمای هەڕەشەم لێ بکەیت؟) ئا لەو قسانەدا بووین وەختێکم زانی لەودیوەوە بەشـەق دەرگـای ژوورەکـەیان کـردەوە، (٨-٩)زەلامی گەورەو کەتەو دەست ومەچەک ئەستوور بەجلی مغاویرییەوە خۆیان کرد بەژوورا، یەکێکیان روتبەی مولازمی یەکەمی بەستبوو دیاربوو لێپرسراوی هەموویان بوو، ئیمەیان هەڵسانە سەر پێ پاش ئەوەی لەزاری مفەوەز مەحمودەوە بۆی دەرکەوت کە ئێمە هیچمان نەدرکاندووە، بەیەکێک لەجەلادە سنگ پانەکانی خۆی گوت:( ئادەی بەو کێبڵە ئەو دنیایان پیشان بدە) بەرلەوەی بێنە پێشێ بۆ لێدانمان من لەجێی خۆمەوە هاوارم کرد:( وەڵاهی ئێمە هیچمان نەکردووە وهیچ نین) مولازمەکە بەعەرەبی گوتی: ( هیچ قسە نەکەیت، ئەگینا یەک بۆکست لێ دەدەم فـڕێت دەدەمـەوە ناو سەرچنار) ئینجا کێبڵەکەی لەجەلادەکە وەرگرت و یەکەم کێبڵی زۆر بەتوندی دا بە پشتما زرینگەی لێ هەستاند، وەک ئەوەوا بوو (ئاگریان لەسەر پشتم کردبێتەوە) ئەو ڕووداوە قسەیەکی مامۆستا عەلی چەپلەری قوتابخانەی بۆتانی سەرەتایی لەسەرچنار بەیاد هێنامەوە هەموو جارێ کە شتێکمان لەبارەی وانەکانەوە نەزانبیایە بەهەڕەشەوە پێی دەگوتین:( وەڵاهی سەعی نەکەن بەم دارە ئاگر لەسەر پشتتان دەکەمەوە) کەچی قەت لێی

نەدەداین یادی بەخێر بێ مامۆستایەکی دڵسۆزو کورد پەروەر بوو. بەهەر حاڵ ئەو مولازمە دوو کێبڵی دیکەی دابەپشتمداو هەموو جارێکیش دەیگوت: (قسە دەکەیت یان نا؟) دوای سێهەم کێبڵ کەزۆرم ئازارهات بەعەرەبی گوتم: ( هیچ نازانم، هیچم نەکردووە) ئینجا بەهەموو هێزی خۆی کێبڵێکی دیکەی لێ داهێنامەوەو ناڵەی لەپشتم هەڵساند، دەستبەجێ لەزۆری ئازاری جەستەم هەناسە بڕکێم پێکەوت و هێڵنجم دایەوەو رشامەوە و زەرداوم دەردا، کەمێک رامکرد بەولاوە سەرم گێژی خواردوو کەوتم بەلادا ئیدی کەوتمە هاوار هاواری (ئای، ئاخ ...ئۆف پشتم) لەراستیدا ئازارم زۆربوو، بەڵام هەندێ لەو هات و هاوارەم بەخۆ نواندن بوو ئێستاش نازانم بۆ وام کرد، نازانم ویستم وازم لێ بێنن یاخود بەزەییان پێمدا بێتەوە! بەهەر حاڵ پلانەکەم سەری گرت و لەو کاتەدا وازی لێ هێنام،بەڵام دوای من بەربووە گیانی سالار، سالاری بەد بەختیش شەکەت بوو بوو هێندەی لێ بدەن، ئەو مولازمە هەروەک پیاوانی فیلمەکانی (کۆنفۆ)لەشوێنی خۆی سوڕایەوەو بەهەموو هێزی بەو پۆستاڵە قورسانە یەک پێ لەقەی دا بەتەختی سنگی سالارداو دای بەدیوارەکەدا، ئینجا گەڕایەوە بەهەموو قوەتی یەک زللەی لەپەناگوێی سالارداو تەختی زەوی کرد. لەو کاتەدا تەماشای سالارم کرد، لەتاو ئەو ئازارو لێدانەکانی خۆمم بیرچۆوە مولازمەکە گوتی: ( گوناحە ها؟!!)پاشی چەند دەقیقەیەک مولازم و پیاوەکانی چوونە دەرەوەو بەمەحمودی گوت: ( ئەو مەسیحیەم بۆ بهێنە بۆ ژوورەکەی خۆم) لەو کاتەدا سالار لەزەویدا بەبێ هۆشی کەوتبوو... مەحمود پەلی گرتم و بەڕارەوەکەدا بردمی بەرەو ژووری مولازمەکە لەسەر ڕێمان لەڕارەوەکە پیاوێکی بەتەمەنی زیندانیم دی بەدەست دوو جەلادەوە بوو هەموو ئازای ئاسەواری لێدانی پێوە دیاربوو، ئاو باڵای ئەو پیاوە کوردە بەتەمەنە خوێن بوو، ئەو دیمەنە ناخی هەژاندم وەخت بوو مێشکم دەتەقی لەدڵی خۆمدا دەمگوت: ( خوایە خۆ ئاگاداری ئەم هەموو زوڵم و غەدرەی کە لەم میللەتە دەکرێت ) هەندێ جار تەواو نائومێد دەبووم، ئاخۆ کەی ئەم خەڵکە ئازاد دەبێ و لەم هەموو ستەمە رزگاری دەبێ ئای لەو خەونە.. ئەوە خەونی ئازادی کوردستان بوو ئەوە خەونی لەگۆڕنانی ئەو دەستە چەپەڵ و بەخوێن سورانەی پیاوانی دام و

دەزگا داپڵۆسێنەرو سەرکوتکەرەکانی ڕژێمی عێراقی و حزبی بەعسی دەسەڵاتدار بوو. بەهەر حاڵ سات لەدوای سات و ئازار لەدوای ئازار من باوەڕم بەخۆم زیاتر دەبوو، وردە وردە هەستم بەگەورەیی دەکرد هەستم دەکرد من لەوان بەهێزترم و ئەوان کۆمەڵێ جروجانەوەری بوودەڵەو هیچو پوچن.. لەوکاتەدا شیعرە بەرزەکەی (قانیع))ی شاعیرم بیرکەوتبۆوە، ئەو شیعرەی هەموو جارێ مامۆستای سروود لە شێوەی سروود بۆی دەچڕین:( گەرچی دوژمن وائەزانێ من بەدیلی لاڵ ئەبم.. باش بزانێ کونجی زیندانم قوتابیخانەیە) هەر چۆنێ بێ بەنێو دەیان دیمەنی کارەستاوی ئەو هۆڵ و ڕارەوانەی دائیرەی تەواری چواریاخدا مفەوەز مەحمود منی گەیاندە بەردەرگای ژووری مولازمەکە، دەمزانی ئەو مولازمە، دەسەڵاتدارو گەورەی ئەو جەلادانەیە، بەڵام هێشتا ناوی فێرنەبوو بووم کەمێک لەبەردەرگا ڕای گرتم و ئینجا پاسەوانێک هات گوتی: ( وەرە ژوورەوە) کە سەرم کرد بەژووردا، بینیم ژوورێکی نزیکەی سێ بەچوارەو کورسی ومێز لای سەرەوەی گرتووەو تاقمێک قەنەفەی تێدایە و تەختە ڕەشێکی قوتابخانە هەڵواسراوەو کۆمەڵێ وێنەی پێوەیە، ئینجا سەیری ئامادەبووانم کرد دیتم مولازم ئەوەڵەکەو مفەوەز مەحمود لەژوورەوە دانیشتوون یەکسەر مولازمەکە ڕووی کردە مفەوەز مەحمود و کەوتە قسە کردن: (مەحمود دەزانی زۆر غەدرمان لەم کوڕە باشە کرد، بەراستی ئەو هەموو لێدانەی نەدەویست چونکە کوڕێکی چاکەو ئێستا خۆی هەمووقسەیەکمان بۆ دەکات) منیش هێندە غیرەت گرتبوومی، هێندە ئیرادەم بەهێز بوو بوو لەدڵی خۆمدا دەمگوت:( ترحیو.. بەتەمای من بن قسەتان بۆ بکەم!!)پاش چەند دەقەیەک فەرموو فەرمووی دانیشتنی لێ کردم و فەرمانی بەمەحمود دا بچێتە دەرەوە، بەرلەوەی مەحمود بڕوات گوتی:(خەمت نەبێ شێرزاد کوڕێکی ژیرە ئێستا هەموو ڕاستیەکانم پێ دەڵێ) ئیدی مەحمود چووە دەرەوە و مولازمەکە پاسەوانێکی بانگ کرد گوتی:( چایەک بۆ شێرزاد بێنن) ئینجا گوتی: (هەتا چایەکەت بۆ دێ بڕۆ تەماشای ئەو تەختەیە بکە بەوردی سەرنج لەوێنەکان بدە بزانە کامیان دەناسیتەوە) بێگومان مەبەستی ئەو تەختە ڕەشە بوو کە وێنەکانی پێدا هەڵواسرابوو، منیش ئەو کاتە دانیشتبووم لەشوێنی خۆمەوە گوتم: ( وەڵاهی کەس ناناسم) بەو

وەڵامە ناوچەوانی گرژ بوو بۆیە بەهێواش گوتی: ( هەستە سەرپێ و تورەم مەکە بزانە لەو وێنانەی سەر ئەو تەختەیە کێ دەناسیەوە) ناچار لەتەختەکە نزیک بوومەوە هەر چەندە بەخێرایی لەوێنەکان ورد بوومەوە، بەڵام هەندێکم ناسینەوە لەوانە (کاک دەرویش ئاغا، کاک حەمە یادگاری برای، شەهید عوسمانی قادر منەوەر ناسراو بە خاڵە عەفان و شەهید فەرەی مامە عەبە بەهەمان شێوە) ئیدی بەراستی بەنیاز نەبووم هیچ راستیەک بدرکێنم، بۆیە وێنەکان زۆر بوون بەرەمەکی تەماشام کردن ئیدی پشتم کردە وێنەکان و رووم کردەوە مولازمەکە ئەویش بەروو خۆشیەوە بەعەرەبی گوتی: ( دەی مژدەم بەرێ کامیان دەناسیتەوە؟) منیش بەهێواشی گوتم: ( وەڵاهی هیچیان ناناسم) گوتی: (من پێت دەڵێم ئەوانە کێن!!) گوتم: ( ئاخر من نامەوێ بیان ناسم) بەڵام ئەو هەر بەردەوام بوو لەقسەکانی و گوتی: ( ئەوانە کۆمەڵێک، خەڵکی چەتەو رێگرن.. کوڕی خەڵک بەکوشتن دەدەن و گەنجی وەکو ئێوە چەواشە دەکەن!! پاشان پێم بڵێ مەسیحیەکی وەکو تۆ پەیوەندی بەکێشەی کوردەوە چیە؟ تۆ بۆ خۆت لەگەڵ ئەو چەتانە تێکەڵ کردووە؟ ئێوەی مەسیحی وەکو ئێمە عەرەبن.. ئاخر خەتای حکومەتەکەی خۆمانە ئەگینا ئەوانە! ترسنۆکن ناتوانن خزمەتی سەربازی بکەن بۆیە روو دەکەنە ئەو شاخ و دۆڵە) بەراستی گاڵتەی تەواویشم بەقسەکانی ئەو ئەفسەرە جەلادە نەدەهات، قسەکانی مایەی قەشمەری پێکردن بوو، منیش ژیانم کەوتبووە دەست ئەو ئەگینا ئەگەر بمتوانیا دەمزانی چۆن بۆی دەسەلمێنم کە پێشمەرگە مرۆڤێکی ئازادیخوازەو داوای مافی رەوای میللەتەکەی دەکات، دەمزانی ئەوەشی تێ بگەیەنم کەئەوان خۆیان چەتەو داگیرکەرن و ئەگەر ئەوان دەست لەقورتمی خەڵکی هەژارو ستەمدیدەو ئاشتیخوازی کوردستان بەردەن، ئاسوودەیی روو دەکاتە ژیانی هەموولایەک. هەموو ئەو قسانە وەک گریەیەک لەناخمدا پەنگی دەخواردەوە،بەڵام نەمتوانی دەریان پەڕێنم، کەنەشم درکاندن لەبەرچەند هۆیەک یەکەم شت بۆ ئەوەی ژیانی خۆم وسالار بپارێزم، دووەمیان ئەوەبوو حەزم دەکرد بمێنم چونکە بەرگەی ئازارێکی زۆرم گرت، لەسەرو ئەوانەشەوە ترسی ئەوەم هەبوو کە ئەگەر بەتوندی وەڵامم بدەمەوە قسەی لەوە ناخۆشتر ولەوە رەقتر دەکات ولەوە زیاتر سوکایەتی بە پێشمەرگە دەکات، چونکە

بەراستی زۆربەی هەرەزۆری پیاوانی ئەودەزگایانە خەڵکانێک بوون تا سەر ئێسقان خوێنڕێژو دژ بەمرۆڤ و نا ڕۆشنبیرو ناکەس بەچە، ئەوانە هەڵبژاردەی ڕژێمی عێراق و حزبی بەعس بوون،بەحسابی خۆی ڕژێمی عێراق بۆ پاراستنی ئەمنیەتی شارو ئاسایش و ژیانی خەڵک دامەزراندبوون، بەڵام بە پێچەوانەوە کاروپیشەی سەرەکی ئەوان سەرکوتکردنی هەموو نەفەسێکی ئازادیخوازی و لەناوبردنی شۆڕشگێران و ترساندن و تۆقاندنی خەڵکی بەشمەینەت بوو، بەڵێ ئەوان سەرچاوەی نا ئارامی و ناهێمنی بوون لەهەموو شاروشارۆچکەکاندا، لە هەموو شارێکی عێراقی ئەو کاتدا دائیرەی ئەمن قەڵایەکی پڕ مەترسی بوو هەمیشە بۆنی خوێنی لێ دەهات و دژ بە هەموو مافێکی مرۆڤ بوون و بەخراپترین شێواز پێشێلی ئەو مافانەیان دەکرد، بەهەر حاڵ مولازمەکە دوای ئەو قسانە بەئەنگوست ئاماژەیەکی بۆ وێنەکەی (سەدام حوسێن) کردو گوتی: (بەسەری سەرۆکی فەرماندە بەس پێم بڵێ کێ تۆی هەڵخەڵەتاندو لەگەڵ خۆیدا بردیتی بۆ ناو گێرەشێوێنەکان دەستبەجێ ئازادت دەکەم، من دەزانم یەکێکیان سالارە تۆ تەنیا ناوی ئەوانی دیکەم پێ بڵێ) منیش سوێندم زۆر خوارد بەزەردەخەنەوە گوتم: ( وەڵاهی ئەو کوڕەی باسی دەکەیت هەر نایناسم و نەم دیوە) ئەویش بە پێکەنینەوە گوتی: ( ئەوە بەراستتە یان سوعبەتم لەگەڵ دەکەیت؟ یەعنی ئێستا ئەگەر کتێبی ئینجیل بهێنم ئامادەی سوێند بخۆیت کە تۆ سالار نا ناسیت؟) گوتم: ( بەڵێ)، ئینجا پاش چەند ساتێک دەستی نایە ژێر چەناگەیی و لێم ڕاما، دەستێکی نابە زەنگی سەرمێزەکەیدا و فەرمانی بەپاسەوانەکەی دا کە سالاری بۆ بهێننە ژوورەوە، پاش کەمێک سالاریان بەچاو بەستراوی هێنایە ژوورەوە، فەرمانی دا چاوی بکەنەوە، ئەگەرچی سالار کەمێک زمانی عەرەبی دەزانی و لێی تێ دەگەیشت، بەڵام لەوێ وا خۆی نیشاندابوو کە یەک وشە عەرەبی نە تێ دەگات و نەقسەی پێ دەکات، بەعەرەبی بەسالاری گوت: ( چا ناخۆیت بۆت بهێنین؟) سالار لەوەڵامدا گوتی: (نەخێر هیچی ئێوە ناخۆم) مولازمەکە بەمنی گوت: ( ئەوە سالار چی دەڵێ) منیش بەعەرەبی گوتم:(دەڵێ چا ناخۆم) ئینجا سالاری دانیشاندو کەوتە قسەکردن: (سالار باش گوێم لێ بگرە ئەوە شێرزاد دانی نا بەهەموو ڕاستیەکاندانا و حەز

دەکەم تۆش وەکو ئەو عاقڵ بیت وراستیەکان بدرکێنی، نازانم تێ دەگەیت لەقسەکانم یان نا پێم خۆشە تۆش وەکو شێرزاد پیاو بیت و ئیعتیراف کەیت) سالار بەکوردی وەڵامی دایەوەو گوتی: ( ئەو کەیفی خۆیەتی من ناینناسم) دوای ئەو وەڵامە مولازمەکە زەنگی لێ دایەوە و مەفەوەز مەحمودی بانگ کردە ژوورەوە ئینجا رووی کردە مەحمود و پێی گوت:( ئەوە شێرزاد وەکو پیاو دانی بەهەموو راستیەکاندا نا) لەو کاتەدا کە ئەوقسەی بۆ مەحمود دەکرد، من هەڵێکم قۆستەوەو چاوێکم لەسالار داگرت ئیدی سالار بەو ئاماژەیەی من حاڵی بوو کە مولازمەکە درۆ دەکات و من هیچم نەدرکاندووە. ئینجا سالار کە زۆرتر لەبێ دەنگی من دڵنیابوو گوتی: ( من ئەو ناناسم دڵنیاشم ئەویش من ناناسێ خۆ ئەگەر بەدرۆش قسەی کردبێت من چی بکەم خەتای من چییە!!) هێشتا قسەکانی تەواو نەکرد مەحمود یەک زللەی لەسالار دا، لەوێدا مولازمەکە لەمەحمود تووڕە بوو گوتی: ( لێی مەدە وازی لێ بێنە) دوای ئەوە فەرمانی بەمەحمود دا کە لەتیف بانگ بکەنە ژوورەوە، لەتیف ئەو کوڕەبوو کە لەپێشمەرگایەتی من و سالاری دیبوو، ئەو لەتیفەی هەرزوو من و سالار گومانی ئەوەمان لێ کرد بەگرتمان بدات ودواجاریش هەر ئەو بەگرتنی داین... بەرلەوەی لەتیف بێتە ژوورەوە مولازمەکە بە ئێمەی گوت:( با ئەو گەوادە بێتە ژوورەوە بزانم ناتانناسێ) بێگومان ئەو جۆرەکەسانەی وەکو لەتیف بوون لای ئەو جەلادانەش هەر بەسووکی سەیر دەکران، مولازمەکە سەیرێکی منی کردو گوتی: ( بەوردی تەماشام بکە بزانە دەمناسیت؟) گوتم: (نەخێر) ئینجا گوتی:( ئەی من تۆ دەناسم؟)گوتم: ( نەخێر) گوتی: (ئەدی مەحمود دەناسن؟ دڵنیام ناینناسن، بەڵام ئێستا لەتیف دێتە ژوورەوە ئەویش وەکو ئێوە کوردە و برادەری خۆشتانە ئەویش پێشتر خائین بووە،بەڵام ئێستا هاتۆتەوە ناو ریزی نیشتمانپەروەران و خزمەت دەکات و یارمەتی ئێمەش دەدات لەئاشکراکردنی خائین و گێرە شێوێنەکاندا بێگومان کە دەڵێم خائین مەبەستم ئێوە نییە، چونکە ئێوە منداڵن و عەقڵتان پێ نەشکاوە هەڵخەتێنراون) بێگومان من لەخەیاڵی هاتنە ژوورەوەی لەتیف دا بووم،چونکە دەمزانی باشمان دەناسێ و ئاشکرامان دەکات لەناخەوە دوعام دەکردو لە خودا دەپاڕامەوە (خوایە لاڵی بکەیت و زمانی نەگەڕێ خوایە

کـوێری کەیت و نەماننـاسـێتـەوە) مـولازمەکـە فـەرمـانی دا کەلەبچەکـانی دەسـتـمـان بکەنەوە،لەو کـاتەدا لەتیف خـۆی کـرد بەژوورا دیاربوو لەناو بازاڕەوە هێنابوویان چونکە دووکـالەکی بەدەسـتـەوە بوو... ئای کـە ڕەزای قـورس و چارەگـران بوو، بڕواناکـەم بەدرێژایی تەمـەنم هێندە ڕقم لەهیچ رووخـسـارو دەم وچاوێکی قـێـزەون هەسـتـابێ، لەتیف هاتە ژوورەوە بەپێکەنینەوە سڵاوو تەوقەی لەگەڵ مولازمەکەدا کرد، ئەمیش زۆر بەبێ ڕێزییەوە سڵاوی سەندەوە یەکەمین پرسیار کەلە لەتیفی کرد گوتی: ( ها ئەم کـالەکـانەت لەکوێ دزیوە؟) لەتیـفیش بەپێکەنینەوە وەک کـەسـێکی ئاست نزم و بوودەڵە کالەکەکەی بۆ مولازمەکە ڕاگرت و گوتی: ( گەورەم کـالەک ناخـۆیت؟!) لەو کـاتەدا سەد ئەوەندەی تر خـۆم و سالارم لا گـەورە بوو، هەزار ئەوەندەش لەتیفم لەبەرچاودا بچووک بۆوە، ئینجا مولازمـەکە پێی گـوت: ( لەتیف سـڵاوێـک لەبرادەرەکـانت بکـە) لەتیف ئاوڕی لێ داینەوە و تەمـاشـەیەکی سـالاری کـردو گـوتی: (سـالار چۆنی ئەحـواڵت چۆنە؟) سـەیری منی کـرد، بەڵام سـڵاوی لێ نەکـردم لەتیف چاوەڕێی وەڵامی سـالار بوو،بەڵام ئەو نقـەی لێوە نەهات ئیدی لەتیف درێژەی دا بە قـسـەکـانی و گـوتی: ( سـالار..سـالار.. چیـە مـاڵت ئاوابێ بۆ وەڵامم نادەیتـەوە؟ چەند جـارم پێ گـوتی تۆش وەکـو من خـۆت تەسلیم بکەرەوە بۆچی بەقسەت نەکردم ئێسـتـاش پیـاو بەو بزانە مـولازم ئەحمەد چی دەوێ بەراسـتـی پێی بڵێ، بۆ ئەوەی ئازادتان بکات) سـالار هەر بەتووڕەییـەوە لەدەم و چاوی لەتیـفـی دەڕوانی و هیچ وەڵامـی نەدایەوە، لەقـسـەکـانی لەتیفەوە بۆم دەرکەوت ئەو مولازمە ناوی ئەحمەدە، ئیدی مولازم ئەحمەد بە لەتیـفی گـوت: (ئەوانە دەڵێن ئێـمـە یەکـتـری ناناسین!!) ئەویش گـوتی: ( گەورەم قـابیلە بڵێن ئێـمـە ڕێکخـسـتنی پارتی بووین و پێکەوە پێشـمـەرگە بووین؟!!حەز دەکەم جەنابت دڵت گەورەبێت و لێیان ببووری چونکە ئێستا خۆیان قـسە دەکەن و هەر بە ئۆتۆمبیلی خۆم دەیانبەمەوە بۆ مـاڵی خۆیان) مـولازم ئەحـمـەد گـوتی: (زۆر باشـە بڕۆ دەرەوە لەبەر دەرگـا ڕاوەسـتـە، باراسـتیـەکەم پێ بڵـێن هەر ئێـسـتـا بیـان بەرەوە بۆ مـاڵەوە!!) لەتیـفیش یەکـێک لەکـالەکەکـانی بۆ سـالار ڕاگـرت و گـوتی: (ها بگرە سـالار ئەو کالەکە بخۆ) سالاریش نەیکردە نامەردی و لەچاوترکاندنێکدا کالەکەکەی

لە لەتیف وەرگرت و بەهەموو هێزی دای بەدەم و چاوی لەتیفدا و پڕ بە قورگی هاواری کرد: (گەواد..بێ ئەخلاق شەرت بێ ئا ئەمەت بەسەرەوە نەچێت)... ئای لەو ئازازەیتیەی سالار.. ئای چ هەڵوێستێک بوو ئەو کوڕە نەبەردە لەو ژوورەدا نواندی، خۆزگە هەموو کەسێک کە بیری لەخیانەت دەکردەوە چاوی بەو هەڵوێستەی سالار بکەوتایە، من هەروام ناسیبوو دەمزانی قارەمانێکی کەموێنەیەو لەئاست دوژمنانیدا کێوێکی بەرزە، من نازانم ئێستاش بۆ هەر کەسێکی دەگێڕمەوە بەدەست خۆم نییە زمانم دەلەرزێ و دڵم پڕ دەبێ. سالار هەر بەوەوە نەوەستا کە هەموو گیانی لەتیفی کرد بەکاڵەکی تەپیوو دەیان جنێوی پێدا، بەڵکو هەڵمەتیشی بۆ بردو ویستی لێی بدات ئەو ژووره هاژا، من لەشوێنی خۆم هێندە جۆش و حەماس گرتمی دەستم کرد بەگریان، نەمتوانی منیش لەگەڵ سالاردا هێرش بۆ لەتیف بەرم چونکە ئەو، باشترین بەڵگەدەبوو کە ئێمە یەکتر دەناسین وقسەکانی لەتیف راستە ، شیرازەی ئەو ژووره تێکچوو مولازم ئەحمەد لەو هەڵوێستەی سالار حەپەسا ، بەڵام مفەوەز مەحمود پەلاماری سالاری داو کەوتە لێدانی بەشەق و زللە، لەو کاتەدا مولازم ئەحمەد زۆر توڕەبوو وەک بڵێی بەغەدرێکی گەورەی بزانێ هاواری کرد بەسەر مەحمود داو فەرمانی دا کە بەسە ئیتر لەسالار نەدات، مەحمود لەلێدانی سالار وەستاو لەتیفیش لەترسا هەناسە بڕکێی پێ کەوتبوو سەیرێکی سالاری کردو گوتی: ( شەرت بێ بە ئیعدام کردنتان بدەم) مولازم ئەحمەدیش بەتوڕەییەوە بە لەتیفی گوت : ( گوبخۆ بڕۆ دەرەوە لاچۆ لەبەر چاوم) لەتیف سەری خۆی شۆڕکرد چووە دەرەوە.. مولازم ئەحمەدیش بۆ ماوەی (٢-٣)دەقیقەو زیاتریش هەر لەدەم وچاوی سالار ورد دەبۆوە، جگەرەیەکی داگیرساندو گوتی: ( سالار وەرە جگەرە بکێشە) سالار گوتی: ( ناکێشم) لەو کاتەدا سالارم وەک شێرێکی نەبەزیو دەهاتە پێش چاو، حەزم دەکرد دەستی ماچ کەم و بیکەمە سەر شانم بەنێو شەقامەکانی سلێمانیدا بیگێڕم هاتمە سەر ئەو بڕوایەی ئەم میللەتە هەتا قارەمانی وەکو سالاری تێدابێت چۆک بۆ دوژمنانی دانادا و ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم کوردستانە تروسکایی ئازادی بەخۆیەوە دەبینێ و مەشخەڵی سەرفرازی هەڵدەکات. ئێستاش ناتوانم باس لەو خۆشیە بکەم، بەڵام لەهەمان کاتدا لەچارەنووسی سالار ترسام، دەمگوت ئێستا ئا

دەمێکی تر دەیبەنە خوارەوە فیشەک بارانی دەکەن بەهەر حاڵ مولازم ئەحمەد جگەرەی پێشکەش بەمنیش کرد هەرچەندە زۆر تامەزرۆی کێشانی جگەرەیەک بووم، بەڵام منیش گوتم ناکێشم، مولازم ئەحمەد بەسەر سامییەوە رووی کردەوە سالار و پێی گوت: ( سالار دەزانی پاش ئەوەی ئەو هەڵوێستەم لێ دیت زۆرم خۆش ویستی) ئینجا رووی کردە من وگوتی: ( ئەی تۆ بۆچی دەگریت؟) منیش بەهەنسکی گریانەوە گوتم: ( بۆ حاڵی خۆم دەگریم، هەرگیز بەو زەلیلی و بێ دەسەڵاتیە خۆمم نەدیوە) دەستم کردەوە بەگریانێکی بەکوڵ بەهیچ ژێر نەدبوومەوە هەندێ جار خۆمم بەلاوازی دەبینی و هەندێ جاریش لەخۆشیدا دەگریام، دیاربوو ئەو هەڵوێستە زۆر کاریگەری هەبوو بۆ سەر مولازم ئەحمەد بۆیە دووبارە رووی کردەوە سالارو بەعەرەبی گوتی: ( من زۆر سەرسامم بەکەسێتی و هەڵوێستی بەرزی تۆ، سالار تۆقارەمانێکی کەم وێنەی، بەڵام چی بکەم تۆ لەدیدی منەوە کەسێکی خائین و گێرە شێوێنی) ئەو قسانەی مولازم ئەحمەد زۆر دڵی خۆش کردم، هەستم کرد تەواو نەبەردی سالار چۆکی بەدوژمن داداو دوژمنان هەستیان بەشەرمەزاری کرد. لەوێوە ئیدی بۆم دەرکەوت کە لەم دام ودەزگا داپڵۆسێنەرەدا لەبەردەم زنجیرو کێبڵ و فەلاقەی ئەم گورگانەدا، مرۆڤ دەبێ ئازاو بەجەرگ و خۆ راگربێت ئەو هەڵوێستەی سالارو ئەو سەرسامیەی مولازم ئەحمەد و بودەڵەیی لەتیف کۆمەڵێ وانەی فێرکردم کە بەدرێژایی رۆژانی دە ساڵەی نێو ژوورو هۆڵە تاریکەکانی بەندیخانەکان سوودم لێ وەرگرت، بەهەر حاڵ مولازم ئەحمەد فەرمانی دا کە مەحمود دۆسیەی تایبەتیمان بۆ بکاتەوەو بکەوێتە پرسیارکردن لەبارەی خۆمان و کەسو کارو خێزان وبنەماڵەمان. ئینجا مفەوەز مەحمود کۆنووسی لێکۆڵینەوەکەی خستە بەردەمان و گوتی ئیمزای بکەن کە تەماشای لاپەڕەکەم کرد لەبەشی خوارەوەی نووسرابوو ( تم القاء القبض عليهم أثناء النوم، كانوا في بيوتهم نائمين، وتم الاعتراف عليهم من قبل المدعو (لطيف) كونا انهم قد التحقوا بصفوف العملاء والخونه والخارجين عن القانون! من جماعه البرزاني) ئەگەرچی ئەوان پێشمەرگەی کوردستان و شۆڕشی گوڵانی ئازادیخوازیان بەخیانەت و دەرچوون لەیاسا ناوزەد دەکرد، بەڵام هەمیشە شانازبووم بەوەی لەسەر ئەو شۆڕشە ئازار

بچێژم و خوێنم بڕژێت، چونکە بەراستی سەر بەرزیە بۆ مرۆڤ لەو پێناوەدا گیان لەدەست بدات. دوای ئەوە بەمفەوەز مەحمودی گوت: (ئەمانە ببەرە سەرەوە کەس دەستکاریان نەکات.. بیانبە بۆ ژووری مەحکەمە (تسفیرات).

## بەر لەژووری تەسفیرات

پێم وابێ مەحمود بەقسەی مولازم ئەحمەدی نەکرد، چونکە من و سالاری بردە ژوورێکەوە دوایی بۆمان دەرکەوت کە ئەوە ژووری تەسفیرات نەبوو، بەهەر حاڵ ئەو ژوورە لەنهۆمی سەرەوەی دائیرەکە بوو ئەو ژوورە (٢٠-٣٠)زیندانی تێدا بوو لەوانەی کەلە یادم مابێ (عومەری نوری بەگ، عەلیە سوور، فەرهادو فەرەیدون دوو برا جمکەکەی ناو حاویەکە، عەبدوڵڵا حیکمەت ئەویش هەر لەتیف بەگرتی دابوو، کامەرانی حەمە ئاغا، سێ منداڵکار ناویان نەبەزو دانا وزانا بوو، ئازادو ئاسۆ برابوون، عوسمانی ئامە قەرەج، مەحمود چوارباخی، کارزان چوارباخی، چەند کەسێکی ترکەداوای لێبوردن دەکەم ناویانم لەیاد نەماوە) هەریەک لەزیندانیەکان دەستێکی بەپلێتێکی زەویەکە دەبەسترایەوە. ئەو ژوورە رووبەری (٣×٤) مەتر دەبوو، دەرگاو پەنجەرەکان بۆیاخ کرابوون، کەمن وسالاریان بردە ژوورەکەوەو دەرگایان لێ داخستین، سلاومان کرد هەموویان وەڵامیان دایەوە، هێشتا دەستیان نەبەستبووینەوە، لەنێو زیندانیەکاندا عومەری نوری بەگم ناسیەوە بۆیە هێدی هێدی چوومەلایەوەو سلاوم لێ کردو گوتم: (ئەمرۆ گیراوم ئەوە سالارە برادەری منە، بەڵام لای کەس قسەمەکە چونکە دانمان بەهیچدا نەناوە) لەو ژوورەدا ڕۆژی سێ جار خواردنیان بۆ دەهێناین،بەڵام چۆن خواردنێک ! مەگەر تەنیا خەڵکی وەکو ئێمە ناچار زەوقی ئەوەی هەبوایە لێی بخوات، ژەمە خواردنی ئەوێ هەمیشە جگە لە (شۆربای نیسک و سەمونی ڕەقهەڵاتوو، برنج و شلەی تێکەڵاو و هیچی تر نەبوو) هەر لەو ژوورە ڕۆژانە سەعات (١٠)ی بەیانی شەوانە درەنگیش کاتی ئاودەستخانەبوو، هاوکات سەتڵێکی ئەلبانیشیان لەژوورەوە دانابوو بۆ کاتی تەنگاوی و میزکردن، هەموو ڕۆژێ کاتێ سەرە سەعاتی دەست بەئاوگەیاندنی دەرەوە بهاتایە یەکێک لەزیندانیەکان سەتڵە

میزەکەی دەبردە خوارەوە بەتاڵی دەکردو دەی شت و دەیهێنایە سەرەوە. لەو ژوورەدا تارادەیەک قسەکردن ئازادبوو، بەڵام هەر گوێمان لە تەپە تەپی پۆستاڵی پاسەوانەکان ببوایە بێ دەنگ دەبووین، ئەو ڕۆژە هاتن یەکە یەکە کەلەبچەکانی زیندانیەکانیان کردەوە نیو سەعاتیان بۆ دیاری کردین کە نان بخۆین، برنج و شلەی بەسەریەکدا ترشاویان دانا بۆمان و بەجێیان هێشتین، ئیدی تێکڕای زیندانیەکان چوونە دەوری سینیە خواردنەکە، سەرەتا من نەچوومە پێشەوە گوتم نان ناخۆم، بەڵام عومەری نوری بەگ گوتی: (وەرە پێشەوە ئەمە یەک ڕۆژو دوو ڕۆژ نییە خوا دەزانێ تاکەی لێرە دەبین) لەو ژوورەشدا بەوێنای ڕارەوەکەی پێشوو بڵندگۆ بەبنمیچی سەقفەکەوە هەڵواسرابوو، دەنگی هات و هاوارو ناڵەو گریانی ژووری ئەشکەنجەدانی بۆ زیندانیەکانی سەرەوە دەگواستەوە ڕۆژانە دەم نادەمێ پاسەوان دەهات ویەک دووکەسیان دەبرد بۆ لێدان و ئەشکەنجە، ئەو دوو برایەی لەگەڵماندا زیندانی بوون (ئاسۆو ئازاد) لەهەمووومان زیاتر لێیان دەدراو ئەشکەنجەیان دەچەشت بەتایبەتی ئاسۆی برا گەورە، ئەوەندەیان لێ دابوو شەکەتیان کردبوو جوڵەی پێ نەدەکرا تەنانەت کەلەبچەشیان نەکردبوو، چونکە دڵنیابوون کە ناتوانێ هیچ بکات، نزیکەی هەفتەیەکمان بەو شێوەیە بردە سەر، ڕۆژێکیان ئاسۆ ئەوەندە نەخۆش بوو بردیانە نەخۆشخانەو پاش چەند سەعاتێک هێنایانەوە لەناوماندا فڕێیان دا ئاسۆ جوڵەی پێ نەدەکرا، وەک لاشەیەکی شل و شۆڵی لێ هاتبوو پاسەوانەکان بەئازادی برایان گوت: (ئاگاداری بە نەیەڵی ئاو بخواتەوە، پزیشک دەیگوت هەر ئاو بخوات تووشی خوێنپژانی ناو سک دەبێت و دەمرێت) ئیدی لەو کاتەوە ئازاد بەردەوام ئاسۆی برای دەشێلاو دەگریا بەسەریدا، ئای کە ویژدان هەژێن بوو دیمەنی ئەو دووبرا بەستەزمانە، ئاسۆش بەردەوام سەری خۆی دەدا بەزەویداو دەپاڕایەوە ئاوی بدەنێ، ڕەنگی تەواو زەرد بوو بوو جەستەی وشک هەڵاتبوو ئازادی براشی فانیلەیەکی سپی خۆی تەڕ دەکردو زوو زوو دەیهێنا بەدەم و لێوی دا بۆ ئەوەی تینوێتی بشکێت، ئێمە هەمووومان چەندمان پێ بکرایە خزمەتی ئەو دوو برایەمان دەکرد، ئێوارەیەکی درەنگ سەرە سەعاتی چوونمان بۆ ئاو دەست بوو، سەتڵە کەی ژوورەوە پڕ کرابوو لەمیز، ئیدی هەمووومان چوینە خوارەوە بۆ ئاودەست

ویستمان ئاسۆش بەرین، کەچی گوتی: (من ناتوانم بێمە خوارەوە سەتڵەکەم بۆ بەجێ بێڵن لێرە میز دەکەم) ئیدی هەموو چووینە خوارەوەو ئاسۆمان بەجێ هێشت. کەچی وەختێ هاتینە سەرەوە، مەحمود چوارباخی ویستی سەتڵە میزەکە بەرێت بیرێژێ تەماشای کرد سەتڵەکە نیواو نیو بووە، مەحمود چوارباخی هاواری کرد: (کورینە وا بزانم ئاسۆ نیو سەتڵ میزی خواردۆتەوە) هەموو بڕوامان کرد چونکە کەچووین سەتڵەکە پڕ بوو، هاوکات ئاسۆش لەمێژبوو لەسەر بڕیاری پزیشک ئاوی نەخواردبۆوە یەکجار تینوو بوو، ئیدی ئازادی برای بەگریانەوە لێی پرسی:( ئاسۆ گیان ئەو سەتڵە میزە تۆ خواردوتەتەوە؟) ئاسۆ هیچ وەڵامی نەدایەوە ئیدی دڵنیابووین کە ئاسۆ میزەکەی خواردۆتەوە، ئینجا وەرە بزانم کێ بەرگەی ئەو کارەساتە دەگرێ، ئەوە یەکێک بوو لەشەوە ناخۆشەکانی ژیانی بەندیخانەم، دوای ئەوە بەدرێژایی ئەوشەوە ئازاد ئاسۆی دەشێلاو بە سەریدا دەگریا، سەعات (١٠)ی ئەو شەوە تەپە تەپی پۆستاڵ و پێڵاوێکی زۆر هات، دەرگا کرایەوەو بەڕێوەبەری ئەمنی سلێمانی و رائید تەها و مولازم ئەحمەد و کۆمەڵێ پاسەوان و جەلاد خۆیان کرد بەژوورا، ئینجا یەکە یەکە کەلەبچەکانیان کردینەوەو وتیان بڕۆنە پاڵ دیوارەکەو بەپێوە راوەستن، ئاسۆ بەتەنیا لەزەویدا کەوتبوو، بەڕێوەبەری ئەمن گوتی: (ئەوە چیە بۆ هەڵناستێتەوە سەر پێ؟) وتیان نەخۆشە، ئینجا کەمێک لێی چووە پێشێ و لەئاسۆی پرسی: ( چیتە بۆ ناتوانی هەستی؟) ئاسۆ هیچ وەڵامی نەدایەوە، بەڕێوەبەری ئەمن پرسی : (ئیعترافی کردووە؟!) رائید تەها گوتی: (نەخێر گەورەم) گوتی: ( باشە بیبەن بۆ نەخۆشخانە چارەسەری بکەن چونکە ئێمە لەوان شەریفترین) پاشان بەڕێوەبەری ئەمن سەیرێکی هەموومانی کردو گوتی: ( کێ لەئێوە عەرەبی باش دەزانێ؟) کەس وەڵامی نەدایەوە، لەو کاتەدا مولازم ئەحمەد هاتە پێشەوەو بەدەست ئاماژەی بۆ من کردو بەعەرەبی گوتی: (شێرزاد وەرە پێشەوە) چوومە بەردەم بەڕێوەبەری ئەمن و پرسی: (خەڵکی کوێیت؟) وتم:( سلێمانی) گوتی:( کوێی سلێمانی؟) گوتم:( سەرچنار) ئیدی لەو کاتەدا مولازم ئەحمەد گوتی:( گەورەم ئەوەمان زۆر ماندوو کردو زۆرمان لێ داوە) بەڕێوەبەری ئەمن سەیرێکی کردمەوەو گوتی: ( تۆ لەکوێ ئەم عەرەبیە فێر بوویت؟)

دیسان مولازم ئەحمەد هەڵی دایەو گوتی: ( گەورەم ئەوە مەسیحیە ).
بەڕێوەبەری ئەمن وەک زۆری سەیر لێ بێت و پێی تاوانێکی گەورە بێت کە مەسیحی لەبزاڤی ئازادیخوازی کوردیدا بەشداربێت، بەسەرسامی و و توڕەییەوە گوتی: ( چۆن چۆن مەسیحیت؟!، ئینجا تۆ کە مەسیحیت پێوەندیت بەمانەوە چیە، بابە ئێمە لەگەڵ ولاتێکی گەورەدا شەر دەکەین (مەبەستی ئێران بوو) ناترسین ئیدی گەجەر و گوجەرو منداڵی وەکو ئێوە چیە بمان ترسێنێت؟ ) لەوێدا منیش هاتمە قسەو گوتم: ( بڕوام پێ بکە من هیچم نەکردووە نازانم بۆچی گیراوم) بەڕێوەبەری ئەمن زۆر تووڕەبوو چاوی لێ بزکردمەوەو گوتی: (بێ دەنگ بە مەڵێ هیچم نەکردووە، بڵێ من هەڵە بووم،چونکە ئێمە غەدر لەکەس ناکەین) ئیدی وازی لەمن هێناو تەماشایەکی زیندانیەکانی کردو گوتی: ( ئێوە چیتان پێویستە؟،هیچ کەم و کورپتان نییە؟ ) سەرەتا کەس وەلامی نەدایەوە، پاشان هەندێ لەزیندانیەکان گوتیان ڕێگە بدەن جگەرەمان بۆ بێت، هەندێکیشان داوای ئەوەیان کرد ڕێگە بدەن کە کەس و کارمان خواردنمان بۆ بهێنن، ئەویش گوتی: (باشە گرفت نییە باخواردنتان بۆ بێت)، ئیدی هەموویان چوونە دەرەوە بەجییێیان هێشتین، پاش چەند دەقەیەک دوو پاسەوان هاتن ئاسۆیان بردە خوارەوە گوایە بۆ نەخۆشخانەی دەبەن، ئیدی گوێمان لێ بوو زۆریان لەئاسۆ دا، ئاسۆی بەستەزمانیش هەر هاواری دەکرد: (ئاخ..ئای.. نایەم.. نایەم لەگەڵتان.. بمبەنەوە بۆ لای ئازاد) ئیدی دەنگ و ناڵەی ئاسۆ دڵی هەموومانی پڕ کرد، پاش ماوەیەک دووبارە هێنایانە سەرەوەو لەناوەڕاستی ژوورەکەدا فڕێیان دا.

هێندەی تر ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو خەریک بوو ڕوحی دەردەچوو پێمان گوت: ( ئاسۆ گیان بۆ نەچوویت لەگەڵ ئەو پاسەوانانە ئەوانە دەیانبردی بۆ نەخۆشخانە چارەسەریان دەکردی) ئاسۆ بەدەم هات و هاواری ئازاری جەستەیەوە دەیگوت: ( بابە ئێوە دەڵێن چی ئەڵێی نایاننناسن، ئەوانە نەخۆش و مەخۆش نازانن، ئێستا فڕێم دەدەنە دەشتێکەوەو بەفیشەکێک دەم کوژن)شەو داهات هەمووومان لەرووی دەروونی و جەستەییەوە شەکەت و ماندووبووین، بەتایبەتی ئەوانەی براوونە ژووری ئەشکەنجە، دەوروبەری سەعات (١١-١٢)ی شەو خامۆشی باڵی گرت بەسەر ژوورەکەدا کەس

دەنگی نەدەهات جگە لە ئاخ و ئۆفی ئاسۆ.. وردەوردە تێکرای زیندانیەکان نغرۆی خەوبوون تەنیا ئازاد خەریکی شێلان و خزمەتکردنی ئاسۆی برای بوو، نزیک سەعات (٢)ی شەو بوو لەپڕ گریان و هاواری ئازاد لەخەو ڕای پەراندین، بەڵێ ئازاد دەنگی دەگەیشتە عەرشی ئاسمان وبەگریانەوە هاواری دەکرد: (هەستن ئاسۆی برام مرد) ئای لەوشەوە چ کارەساتێک بوو.. ئای لەدیمەنی لاشە بێ گیان و بێ جوڵەکەی ئاسۆی بەشمەینەت وخێر لەخۆنەدیوو، بەدرێژایی دەساڵ زیندانی چەندین شەوی ناخۆشی وەهام بەسەر برد، بەڵام مەحاڵە مەرگی ئاسۆو گریانە بەسۆکەی ئازادی برایم بیرچێتەوە، کە لەخەو هەستاین ئازاد جەستەیەکی شل و شەکەت و زەرد هەڵگەڕاو، سەری لەسەر رانی ئازادی برای بوو دەمی ئاسۆ کەف و خوێنی لێ دەهاتە دەرەوە ئازادیش هەر ماچی دەکردو هاواری دەکرد: ( ئاسۆ گیان برا خۆشەویستەکەم توخوا مەمرەو لەم ژوورە ترسناکەدا بەجێم مەهێڵە.. ئاسۆ گیان توخوا سەرهەڵبڕەو بەو سەگبابانە بڵێ من ماوم و نەمردوم. .باوکەڕۆ براڕۆ) هەر هەموومان بەکەلەبچە دەستمان بە پلێتەکەی بەسترابۆوە نەمان دەتوانی بچین بەدەنگ گریانە بەکوڵەکەی ئازادەوە..بۆیە هیچ دەسەڵاتمان نەبوو جگە لەوەی دەستمان کرد بەهاوار هاوار بۆ ئەوەی پاسەوانەکان بێن و ئەو ڕووداوە ببینن، ئەوەندەمان زانی تەپە تەپی پۆستاڵە نەفرەتیەکانی دەیان پاسەوان دەنگی راکێشانی میللی کلاشینکۆف بەرەو ژوورەکەمان هات، دەرگایان کردەوە گوتیان: (سەگبابینە ئەو دەنگە دەنگەتان لەچیە؟) ئیدی کە چاویان بەلاشەی ئاسۆ کەوت خێرا بەتانیەکیان تێوە پێچاو پڕیان پیاکردو بردیانە دەرەوە، ئیدی ئازادیش دەستێکی بە کەلەبچە بە بەزەویەوە بەسترابۆوە کەوتە هەڵمەت و هەڵە داوان، دەیویست لەگەڵ تەرمی ئاسۆی برایدا بیبەنە دەرەوە، بەڵام دەسەڵاتی نەبوو، بەڵێ ئەو شەوە ئاسۆ بەخواردنەوەی میزی ناو سەتڵەکە تووشی خوێنبەژانی ناوەکی بوو دواجار گیانی لەدەستدا. پاش نیو سەعاتێک پاسەوان و جەلادەکان هاتن وئازادیشیان برد بۆ زیندانی تاکە کەسی (انفرادی) و ئیدی دوای چوارڕۆژ هێنایانەوە بۆ ژوورەکەی ئێمە، ئازاد کە هاتەوە هێندە گریابوو چاوەکانی سوور دەر پەڕیبوو ،یەک دڵۆپ فرمێسکی پێ نەمابوو لەوڕۆژەوە واقی وڕمابوو بڕوای بەمەرگی ئاسۆی

برای نەدەکرد. بەهەرحاڵ یەک مانگی تەواوم لەو ژوورەدا لەگەڵ ئەو زیندانیانەدا بەسەر برد، ڕۆژانە گیراوی تازەیان دەهێنایە ناومان و هەڵندگۆی بنمیچی ژوورەکەش بەردەوام بوو لەگواستنەوەی دەنگ و هاوارو قیژەو گریانی زیندانیە گەنج و پیرو منداڵ و ئافرەتەکانی ژووری ئەشکەنجە تاوەکو ئەو ڕۆژەی گواستیانینەوە بۆ ژووری مەحکەمە (تسفیرات).

## ژووری تەسفیرات

ئەگەرچی ژووری تەسفیرات دەکەوتە بەشی سەرەوەی ئەو بینایەوە، بەڵام شێوەی لەژێر زەمین دەچوو تارادەیەک لەژوورەکانی تر باشتر بوو لەڕووی حەوانەوەی زیندانیەکان، دەنا ئەشکەنجەی جەستەیی ودەروونی لەوێشدا لە لوتکەدابوو بۆ خراپی، ڕووبەری ژوورەکە نزیکەی (٤-٥)م بوو ئاودەست و حەمام لەناو خودی هۆڵەکەدا بوو، بەڵام دەرگای ئاودەست تەنیا سەعات (٩)ی بەیانی و دوای نیوەڕۆیان و ئێواران دەکرایەوە، ئەگینا قفڵ درابوو هەر زیندانیەک و قاپ و کەوچکی لەنایلۆن دروستکراوی خۆی هەبوو، نزیکەی (٢٠)زیندانی لەو ژوورەدا بووین ئەوانەی لەیادم مابێت (سالاری هەڤاڵم ،وشیاری ڕابە، نەوزادی سەعە سوور، غەریب مەحمود مەعروف، دکتۆر دارا گەنجێکی خەڵکی قەڵادزێ بوو، دوو پیاوی پیری بەتەمەن کەلەسەر کوڕەکانیان گیرابوون.. ئیدی چەند کەسێکی دی کە ناویانم لەیاد نەماوە). نزیکەی دە ڕۆژ بوو لەو ژوورەدا بووم ڕۆژێک دوو پاسەوان هاتن بەشوێنمداو بردیانمە دەرەوە، سەرەتا وام زانی دەمبەن بۆ لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجە کەچی بردیانم بۆ ژووری رائید تەها، کە چوومە ژوورەوە تەماشا دەکەم باوکم و قەشەیەکی کەنیسە هاتبوون بۆ دیدەنیم ،تومەس باوکم واستەیەکی گەورەی کردووەو هەر چۆنێ بێت بەهۆی ئەو قەشەیەوە توانیویەتی بگاتە لام، بەر لەهەموو شت لەروخساری باوکم ورد بوومەوە چاوەکانی سوور هەڵگەرابوون ریشی سپی هێشتبۆوە، بەو مانگ و نیو زیندانیەی من، باوکم چەندین ساڵ تەمەنی بەرەو پیری چووبوو، زۆر بەزەییم پێدا هاتەوە، باوکیشم کەمنی بینی بەو وەزعەوە دایە پرمەی گریان هیچ قسەی پێ نەکرا باوەشی پێداکردم و گوتی:( کوڕی خۆم بۆ وات لەخۆت کرد؟)ئیدی لەوە بەدواوە غەیری گریان هیچ دەنگێک لەباوکمەوە

نەهات، چونکە گەنجێکی سیخوڕیان دانابوو بەدیارمانەوە کوردی و عەرەبی و سریانیشی دەزانی، نەمتوانی هیچ قسەیەک بکەم لەوە دەترسام ئازاری باوکم بدەن، قەشە دەستی هێنا بەسەرماو دوعای خوێند، پاشان قەشە بەهێواشی پێی گوتم: (مەترسە خودات لەگەڵدایە) ئیدی ڕووی کردە رائید تەها و پێی گوت: (منداڵە بەزەییتان پێدا بێتەوە تکایە ئەوەندە ئازاری مەدەن). ئەو دیدەنیە تەنیا دە دەقیقەی خایاند ئیدی جل وبەرگ و خواردنیان دامێ و ماڵئاواییان لێ کردم، کە گەڕامەوە ژوورەکەم حەپەسابووم خەمی دایک وباوکم ئازارێکی دەروونی زۆری دام، دەمزانی باوکم چەندە ماندوو بووەو چەند تەنازول و دەستی ماچ کردووە تا گەیشتۆتە ئەم شوێنەی من، بەهەر حاڵ وەک لەسەرەتا باسم کرد لەو ژوورەدا ئەشکەنجەی دەروونی زۆر بوو، هەردەم نادەمێ یەک دوو پاسەوان و جەلاد دەهاتنە ژوورەکەو یەک بەیەک دەیان پشکنین، پشکنینی ئەوانیش گەڕان بوو بۆ دەرزی و جگەرەو شقارتەو هەندێ شتی تر، زۆر دڵنیاش بوون لەوەی کە کەسمان ئەو شتانەمان پێ نییە!!، بەڵام ئەو پشکنینانە تەنیا ئازار دانی دەوونی بوو بەس، ئەگینا هیچ ئامانجێکی لەپشتەوە نەبوو، جار ناجارێ دوو جەلاد دەهاتنە بەردەرگای ژوورەکەو ناوی زیندانیەکیان دەخوێندەوە و پێیان دەگوت: ( ئەوە دایکت و خوشکەکانت لەخوارەوەن وا خەریکین لێیان دەیەین نایەیت بەچاوی خۆت بیانبینی!!) لە پڕ جەلادەکەی تر دەیگوت:( نا نا قەدەغەیە چۆن دەبێ بیبەین!!) ئەمەش بەشێک بوو لە ئەشکەنجەی دەروونی، نزیکەی (٢٠)ڕۆژێک دەبوو لەو ژوورەدا بووین پاسەوانێک بەجل وبەرگی مغاویرییەوە هاتە بەردەرگا، ئەو پاسەوانە عەرەب بوو خەڵکی ڕوومادی بوو،سەرەتا هاواری کرد: (شێرزاد لەکوێیە؟!) ئینجا کۆمەڵێ جنێوو قسەی ناشرینی کرد، تاوەکو هاتمە وەڵام گوتم:( فەرموو چیت دەوێ؟) ئیدی گوتی: (ئەوە باوکت گیراوەو وا لەژووری ئەشکەنجەیە، بۆچی ئیعتیراف ناکەیت وئەو پیاوە هەژارە بەتەمەنە لەو هەموو ئازارو لێدانە رزگار کەیت؟) من بڕوام پێ کرد. وەختە بوو لەتاو باوکم شێت و هاربم، بەپاسەوانەکەم گوت: ( ئینجا بۆچی نایەن لەمن بدەن بۆچی ئازاری ئەو دەدەن ئەو تاوانی چییە؟) کەچی پاسەوانێکی تر لەدواوە گوتی: ( ئەوە دایکیشیان هێناوە وا لێی دەدەن،

دایکی ئافرەتێکی ئازایە هیچ قسە ناکات)پاسەوانێکی تر دەیگوت (کوڕە ئازای چی ئەوە عەرەبی نازانێ)ئیدی دەرگایان کردەوەو چوومە ئەو دیوەوە بۆ لایان، کە بۆنم کرد هەموویان کهولیان خواردبۆوەو سەرخۆش بوون، هاتبوون سوکایەتیم پێ بکەن، بەهەرسێکیان بەشەق و زللە و بۆکس کەوتنە لێدانم، ئیدی بەدەم لێدانەوە قەشمەرییان پێ دەکردم یەکێکیان دەیگوت: ( بیرە ناخۆیتەوە بۆت بهێنین؟) یەکێکی دی بەپێکەنینەوە دەیگوت: ( ئافرەتێکی جوانی زیندانیت بۆ بهێنین لەگەڵیا رادەبوێری؟) پاسەوانەکەی تر دەمانچەکەی لاقەدی خۆی دەردەهێناو دەیگوت: (ها بێ غیرەت بەو دەمانچەیە خۆت بکوژە) ئەوەندەیان لێ دام خوێن لەدەم و لوتمەوە پژا، لەوکاتەدا تەپەی پێ هات خێرا بەپاڵ کردیانمە ژوورەوە دیاربوو سەربەخۆ بەبێ پرسی لێپرسراوەکانیان لێیان دەدام، کە دەنگی پۆستاڵەکان نزیک بۆوە بینیم (عەلی تەعیس) هات ئەو عەلیە بە عەلاوی ناسرابوو بەهەردوولادا دەشەلی وفەرماندەی پاسەوانەکان بوو، کە چوومە ژوورەوە لوتم خوێنی پیادەهاتە خوارێ، زیندانیەکان بەزەییان پێمدا هاتەوە پیاوێکی پیری بەتەمەنی زیندانی هاتە لامەوەو باوەشی پێدا کردم گوتی: ( کوڕی خۆم هیچ خەمت نەبێ خودا رزگارمان دەکات لەمانە) ئیدی ئەو پیاوە پیرە دەستی کرد بەگریان ومنیش بەدوایدا، لەوکاتەدا زۆر خۆم بە بێ دەسەڵات دەزانی، ئیدی کە عەلی تەعیس هاتەژوورەوە هەموومان هەستاینەوە سەر پێ بەرلەوەی بێتەژوورەوە عەلی زۆر جنێوی دا بە پاسەوانەکان دەی نەڕاند بەسەریاندا (بۆچی دەرگاتان کردبۆوە، کێتان دەرهێنابوو؟!) ئنجا عەلی لەئێمەی پرسی: ( ئەو سەگبابانە کێیان هێنابووە دەرەوە؟) پیاوە ریشسپیەکە حەماس گرتی و بەتوڕەییەوە بەعەرەبی بەعەلی گوت: ( خۆ ئەوە یەکەمجار نییە دەرگامان لێ دەکەنەوە ڕۆژ تا ئێوارەو شەو تابەیانی نایەڵن بحەوێینەوە، بڕوانە بزانە ئەو کوڕە قوڕبەسەرەیان چی لێ کردووە، ئەوە بەلای خۆیەوە لێکۆڵینەوەشی تەواو بووە) ئاماژەی بۆ من کرد، ئینجا عەلی ڕووی کردە من و گوتی: (چییان پێ گوتی و چییان لێ کردیت؟) منیش هەموو ڕووداوەکەم وەکو خۆی گێڕایەوە، عەلی پێی گوتم: (زۆرباشە سبەی دەتبەمە لای بەڕێوەبەرو شکاتیان لێ بکە، بەڵام وەڵاهی شکاتیان لێ نەکەیت لەمەودا خۆم هەموو

ڕۆژێک دێمە ئێرەو بەشەق دەت توێێنم) ئیدی دەرگای داخست و بۆ یەکەمین جار لەوەتەی زیندانی بووین گوێمان لێ بوو پێی گوتین: ( شەوتان شاد). هەموو جارێ کە دەرگا ئاسنەکەی ئەو ژوورە دادەخرا دەنگی هێندە پرسام و ترسناک بوو وام دەزانی دەرگای هەموو دنیام لێ دادەخرێ، ئەو شەوە زۆر لەخۆم و لەو ژیانەم بێزار بووم، خەمباری سیماو روخساری رەش داگیرساندبووم، زیندانیەکان دڵنەواییان دەدامەوە، بەتایبەتی نەوزادی سەعە سوورو پیاوە بەتەمەنەکە کە زووزوو دەیگوت: ( کوڕی خۆم گوێ مەدەرێ خوا لەسوڵتان مەحمود گەورەترە) نەوزاد و غەریب وەرزشوان بوون، دەم نادەمێ وەرزش و شناویان دەکرد ئەوشەوە مەلابانگدان خەوم لێ کەوت بەیانی زوو عەلی تەعیس دەرگای کردەوەو دیسان بۆیەکەمین جار بوو پێی گوتین:

( بەیانیتان باش) ئەو عەلیەش یەکێک بوو لەو پیاوانەی ئەو دەزگایە کە سۆز لەدڵی دا هەبوو ،بۆ مێژوو دەیڵێم لەچاو مەترسی ئەو شوێنەدا خزمەتێکی زۆری ئێمەی کرد من ئامادەبووم شکات لە پاسەوانەکانی شەوی رابردوو بکەم، بەڵام عەلی هیچ قسەی نەکردو منیش هیچم نەگوت. هەموو کاتی ژەمێک زیندانیەک دەچوو خواردنی بۆ دەهێناین، بەڵام بەزۆری (حەمە جەیشی شەعبی) دەچوو، ئەم حەمەیە یەکێک بوو لەپیاوە هەرە دڵسۆزەکانی حزبی بەعس دیاربوو خزمەتێکی زۆریشی کردبوون، بەڵام ئێستاش نەمزانی لەسەرچی گیراوەو خراوەتە ئەو ژوورەی ئێمەوە، ئەو حەمەیە نەک هەرلای ئێمە بەڵکو پاسەوانان و جەلادەکانی ناو ئەو دائیرەیەش زۆر سوکایەتیان پێ دەکردو زۆرجار تێیان هەڵدەدا لەبەرچاوی ئێمەدا، حەمە جەیشی شەعبی هاواری دەکرد: (من پیاوێکی نیشتمانپەروەرم من بەعسییم بۆ ئازارم دەدەن؟) لەنێو زیندانیەکاندا پیاوێکی سووک و ریسوابوو،کەسمان نەدەماندواندو نەرێزمان لێ دەگرت، تەنانەت ڕۆژێکیان بەڕێوەبەری بەندیخانە هاتە ناو ژوورەکەوە بۆ لامان کەچی حەمە جەیشی شەعبی لە بەرچاوی هەمووماندا بەبێ ئەوەی شەرمان لێ بکات بە بەڕێوەبەری گوت: ( گەورەم من مرۆڤێکی نیشتمانپەروەرم، بۆچی لەگەڵ ئەم خائین و ناپاکانەدا منت داناوە؟ بەخودا ڕۆژێک دەمکوژن ئەمانە ڕقیان لەمنە) مولازم ئەحمەدی بەڕێوەبەری بەندیخانەش پێی گوت:

( بەلای ئێمەوە تۆ هیچ جیاوازیەکت نییە لەگەڵ ئەواندا) ئیدی حەمە ئەو زیندانەی لای ئێمە کردبوو بەدوو زیندان، ڕۆژانە باسی خیانەتەکانی خۆی بۆ دەکرین و شانازی پێوە دەکرد، پرتەو بۆڵەی زۆربوو زۆرجار شکاتی لێ دەکردین و بەلێدانی دەدەیان، بەتەواوی بێزاری کردبووین، هەرجارەی شوێنێکی هەڵدەبژارد بۆ خەوتن. نزیکەی (٤٠)شەو بوو لەو ژوورە خەفەتمان لەو حەمەیە دەخوارد، ئەو بەیانیە کە خواردنمان بۆ هات عەلی تەعیس دەرگای لێ داخستین و بەنهێنی بەیەک دوو برادەری خۆمانی گوتبوو: ( ئەمڕۆ پێنج شەممەیە ئەفسەرەکان وبەرپرسەکانی دائیرە دەڕۆنەوە، من زوو دەرگای حەمامەکەتان بۆ دەکەمەوە بە ئارەزووی خۆتان جل و بەرگەکانتان بشۆن وخۆتان خاوێن بکەنەوە تایت و سابونیشتان بۆ دەهێنم) ئیدی نیوەڕۆ داهات، ئەسپێ لەبنباڵی دابووین، زۆر چڵکن بووین داوای گوێزانمان لە عەلی تەعیس کرد، ئەویش یەک لەت گوێزانی بۆ هەمووومان هێنا بۆ ئەوەی بنباڵی پێ بتاشین، گوێزان لەبەندیخانەدا زۆر قەدەغە بوو لەوە دەترسان زیندانیەکان خۆیانی پێ بکوژن، ئەو نیوەڕۆیە بەهاوکاری عەلی تەعیس خۆمان پاک و خاوێن کردەوە، وەختێکمان زانی حەمە جەیشی شەعبی دەستی کرد بە جنێودان و بۆڵەبۆڵ بیانووی ئەوەی پێ دەگرتین کە ئاوی بۆنەماوەتەوە جل بشوات، درۆشی دەکرد ئەو دەنگە دەنگەی لەبەر ئەوەبوو کە یەکێک وەڵامی بداتەوەو ئەمیش شکاتی لێ بکات و لێی بدەن. مرۆڤی واناپاکم هەرگیز نەدیبوو لەو وەزعە ناخۆشەی خۆیدا هێشتا دەیویست هەمووومان مەرایی بۆ بکەین و لێی بپارێینەوە، نانی ئێوارەشمان خوارد کە بریتی بوو لەتەماتەو پیازو سەمونی ڕەق و وشکهەڵاتوو سەمونەکان زۆر ڕەقبوون کە دەتدا بەزەویدا دەنگی وەکو بەرد دەهات، شەو درەنگ داهات و حەمە جەیشی شەعبی لەبۆڵە بۆڵ وجنێودانی بەردەوام بوو، دەیویست بیانووی ترمان پێ بگرێت، ئاگاداربووم نەوزادی سەعە سوورو سالاری برادەرم و زۆرانی تر لەزیندانیەکان داخی حەمە لەکەلەی دابوون، هەستم دەکرد تەواو پڕ بوون لێی ئەوشەوە ئێمە دانیشتبووین بە دەنکە خورما دوو دوو سێ سێ دامەمان دەکرد، حەمە جەیشی شەعبی لەخۆڕا بە بێ موناسەبەت دەستی کرد بەجنێودان بەسەرکردەکانی شۆڕشی کورد، ئیدی چیتر بەرگەی ئەو قسانەمان نەگرت،

هێشتا ئێمە بۆی هەڵنەستابووین، وەختێکمان زانی حەمە پڕ بەژوورەکە هاواری کرد: (ئاخ!) کە ئاوڕمان دایەوە تەماشا دەکەین نەوزادی سەعە سوور حەمەی خستۆتە ژێر خۆیەوە بەشەق و بۆکس هەموو گیانی حەمەی شکاند، لەولاوە سالاریش هەستا بۆی و ئەویش بەشەق کەوتە گیانی حەمە، ئێمەش لەبەر ئەوەی تەنیا نەوزاد و سالار تووش نەبن هەر هەموومان پێکەوە کەوتینە گیانی حەمە، ئیدی تێکڕای زیندانییەکان لەحەمە جەیشی شەعبیان هەڵدەداو ئەویش هەر نەڕە نەڕو ئاخۆ ئۆفی بوو هێشتا هەڕەشەی لێ دەکردین ودەیگوت: (خۆم دەزانم چیتان لێ دەکەم!!) ئیدی پاش ئەوەی حەمەمان شل وشەکەت کرد، خۆمان دامان لەدەرگاکەو هاوار هاوارمان کرد، ئێمە پشتمان بەوە قایم بوو کە بەرپرسەکان لەوێ نین وتەنیا عەلی تەعیسی لێیە.

ئەوەبوو عەلی هات و دەرگای ژوورەکەی کردەوە یەکسەر سەیری حەمەی کردو لێی پرسی: (بۆچی وات لێ هاتووە؟) حەمە گوتی: (گەورەم نەمگوت ئەو خائینانە دەمکوژن با لێرەدا نەبم!) عەلی ڕووی کردە هەمووماں و گوتی: (کێ لێی داوە؟) ئیدی سالار گوتی من و نەوزاد گوتی من و منیشم گوتم من لێم داوە، هەموو زیندانییەکان هاواریان کرد ئێمە لێمان داوە حەمە دیسان ڕێزی خۆی نەگرت و دەستی کردەوە بە جنێودان بەهەمووماں، ئەوەبوو نەوزاد دووبارە لەبەرچاوی عەلی تەعیسدا کەوتەوە لێدانی حەمە جەیشی شەعبی، عەلی ئەوەی قبوڵ نەکردو بەهەموو هێزی خۆی زللەیەکی لەنەوزاد دا، کەچی نەوزاد هێندە بەداخ بوو لەحەمە ڕووی کردە عەلی و بەکوردی گوتی: (قەیناکە تۆ لێم دە، لێدانی تۆ خۆشە) حەمە دەستبەجێ بە درۆقسەکەی نەوزادی بۆ عەلی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی وگوتی: (گەورەم ئەوە دەڵێ تۆ دوژمنمی قەیناکە لێم دە لێدانی تۆ خۆشە) عەلی زانی قسەکانی حەمە زۆرتربوو لەوەی نەوزاد بۆیە بڕوای پێ نەکرد، ئینجا حەمە کەوتە هەڕەشەکردن لەعەلی تەعیس و گوتی: (عەلی ئەگەر ئەمڕۆ هەر هەموویان سزا نەدەیت سبەی لای بەڕێوەبەری بەندیخانە شکاتت لێ دەکەم). ئیدی عەلی تەواو پەست وتوڕەبوو نەوزاد و حەمەی بەقژ ڕاکێشایە دەرەوەو فەلاقەی بۆ هێنان، سەرەتا نەوزادی فەلاقە کرد بەکێبڵ لەبنی پێی دەداو خوێنی لەنینۆکەکانی

قاچی پژان، نەوزادیش هەر هاواری دەکرد:( لێم دە لێدانی تۆ خۆشە) ئێمە زۆر پێمان ناخۆشبوو، تەنانەت پیاوە پیرەکەی ناومان چووە پێشێ و دەستی عەلی گرت و گوتی:( دەستم دامێنت واز لەو کوڕە بێنەو وەرە لەجیاتی ئەولەمن بدە) عەلی گوتی:( حاجی من حەدم نییە لەتۆ بدەم تۆ وەکو باوکم وایت، بەڵام ئەمانە حەقی لێدانیان هەیە چونکە من ڕێزیان دەگرم و ئەوان ئاژاوە دەگێڕن) پاش ئەوە وازی لە نەوزاد هێناو پاشان حەمەی فەلاقە کرد، ئینجا عەلی تەعیس بەخۆی و دوو پاسەوانی تر لەبنی پێی حەمەیان دەداو حەمەش هەر هاواری دەکرد:( تۆ ناتوانی لەمن بدەیت من پیاوێکی بەعسیم و وەکوئەوان خائین نیم) ئەو قسانە سوودی نەبوو، پاش چەند ساتێک حەمە کەوتە پاڕانەوەو هاواری دەکرد:( بیکە بە خاتری سەرۆکی فەرماندە) مەبەستی سەدام حوسێن بوو.

دوای ئەوە عەلی فەرمانی دا بەپاسەوانەکان کە حەمە جەیش شەعبی بەموحاجەرەی دەرەوە ببەستنەوە، ئیدی گوێمان لەگریان و هات و هاواری حەمە بوو وامان لێهات بەزەییمان پێدا بێتەوە وەختێکمان زانی عەلی هاتەوەو بۆ لای و پێی گوت: (سەگی کوڕی سەگ ئەمجارە گوێم لەدەنگت بێت ئەو پۆستاڵە دەخەمە دەمتەوە) دوای ئەوە عەلی جارێکی تر هاتە ژوورەوەو پیاوە پیرەکەی بانگ کردو چاومان لێ بوو بەنهێنی دەنکە حەبێکی دا بەحاجی و ئەویش خواردی، تووشی حاجی نەخۆشی فشاری خوێنی هەیەو عەلی هەموو جارێ بەنهێنی حەبی بۆ دەهێنێ.

پاش تکاو ڕجایەکی زۆری ئەو پیاوە بەتەمەنە کە بەداخەوە ئێستا ناویم لەیادنەماوە، عەلی فەرمانی دا حەمە بهێننەوە بۆ ژوورەکە، پاش ئەوە عەلی تەعیس بۆیەکەمین جار رازی دڵی خۆی بۆ بەیان کردین وگوتی:( ئێوە خەڵکێکی باشن من هەرگیز حەزم نەدەکرد لەم شوێنەدا یەکتری بناسین، بەڵام پشت بەخودا هەمووتان بەسەلامەتی دەرۆنەوە نێو ماڵی خۆتان، ئێمە برای یەکترین) دوای ئەوە حەمەیان هێنایە ژوورەوەو عەلی بەحەمەی گوت: (وەرە سەگی کوڕی سەگ برۆ دەستی حاجی ماچ بکە) پاشان عەلی ڕووی کردە حاجی و گوتی: (حاجی چاوەکەم گلەیی لێ مەکە ئەوە تەربێت نەدراوە) ئیدی حەمە هاتەوە ژوورەوەو ئەوشەوە تا بەیانی سەری دەدا بەدیوارەکەداو لە پەشیمانی دا دەگریا.

## ئەو شەوەی پێشمەرگە هات

چەند ڕۆژێک دوای ئەوە هێشتا لەدائیرەی تەواری چوارباخدا بووین ولەهەمان ژووری مەحکەمە (تسفیرات)دا مابوینەوە، ئەو ماوەیە بەردەوام گیراوی تازەیان دەهێنا بۆ ناو زیندانە ترسناکەکانی هەموو دەزگا سەرکوتکەرەکان، شەوێک لەوشەوانە گوێمان لەتەقەیەکی زۆر بوو ئەودەنگە تادەهات نزیک دەبۆوە لەبەندیخانەکە، وردە وردە دەنگی (RBG) و (BKC)تێکەوت، خۆشی کەوتە ناومانەوە، زیندانیەکان روخساریان گەش بۆوە،لەو باوەڕەدا بووین ئێستا نا دەمێکی تر پێشمەرگە ئەو دائیرەیە دەگرێت ئازاد دەبین، دەنگی تەقە و گرمو وڕی قازیفە زۆر نزیکم بۆوە لەوە دەترساین بەرلەوەی رزگارمان بێت بمانکوژن. دەرگاو پەنجەرەی ژوورەکەمان لەگەڵ دەنگی (BKC) دەلەریەوە بەسووکی گوێمان هەڵخست دەنگی فڕکان فڕکانی ئۆتۆمبیل ئەو ناوەی تەنی، هەستمان کرد لۆری و ئۆتۆمبیلی گەورە دەهاتنە حەوشەی بەندیخانەکەوە وردە وردە هێزێکی زۆری چەکداری تەواری وئەمن بەنێو هۆڵ و ڕاڕەوو بن دەرگاکانی بەندیخانەکەدا بلاوبوونەوە، گوێمان لێ بوو یەکێک بەئامێری بێ تەل بەعەرەبی هاواری دەکرد: (گەورەم پێکدادانەکە زۆر بەهێزە، ناوچەکە بڕبووە لەیاخی بووان) مەبەستی هێزی پێشمەرگە بوو، ئیدی لەوەوە بۆمان دەرکەوت کە هێزی پێشمەرگە هێرشی هێناوەتە سەر ئەو بەندیخانەیە هاتبووینە سەر ئەو بڕوایەی کە ئەوشەوە یادەمرین یاخود بۆ هەتا هەتاییی رزگارمان دەبێت، بەلام هێشتا بەئاشکرا نەماندەوێرا پێکەوە قسە بکەین، ئەویش تەنیا لەبەر ئەوەبوو کەمتمانەمان بەحەمە جەیشی شەعبی نەبوو، دۆشکەی سەربانی بەندیخانەکە بەردەوام تەقەی دەکرد ئەو تەق تەق و توق و گرمە گرمە پتر لەدوو سەعاتی خایاند، بەلام ئەوەی بێ ئومێدی کردین دوورکەوتنەوەی دەنگی تەقەکان بوو لەپڕێکدا دەرگای ژوورەکەیان کردەوەو هەر هەموومانیان کەلەبچەکردو لەڕاڕەوەکەدا لەسەردەم پالیان خستین، فەرماندەی پاسەوانەکان هاواری دەکرد: (هەر کامێکیان سەری بەرزکردەوە بیکوژن) وردە وردە دەنگی تەقە نەماو لورە لوری ئۆتۆمبیلی فریاکەوتن دەهاتە بەرگوێمان فەرماندەکە کەمێک وەزعی ئاسایی بۆوەو ترسی لا نەما ئینجا کەوتە قسەکردن بۆمان و دەیگوت: (

دەزانن ئەوانە کێ بوون؟! ئەوانە کۆمەڵێ خەڵکی خۆفرۆش و ترسنۆک و سەگ بوون، هەموویان کوژران) لەدڵی خۆمدا دەمگوت: (دەک دەمت شکێ، توخوا پێشمەرگەیەک لەچیاکانەوە بەم شەوە هێرش بهێنێتە سەر ئێوەو ئاوها بتانترسێنێت، ترسنۆک و خۆ فرۆشە؟!!) ئیدی دوای ئەوە دەستیان کردینەوەو بەپاڵ بردیانینەوە ژوورەوە، هەرچەندە ئەوشەوە زۆر بێ ئومێد بووین، بەڵام دوای ئەوە ورەمان زۆر بەرز بۆوە خۆزگەمان دەخواست ئێمەش لەوکاتەدا پێشمەرگە بوینایە نەک زیندانیەکی پەلبەستراوو بێ دەسەڵات، بەهەرحاڵ هەر بۆبەیانی زوو پاسەوانێک هات و ناوی من و نەوزاد و سالاری خوێندەوە، ئیدی چاویان بەستینەوەو کەلەبچەیان کردین و بەپێپلیکانەکەدا هێنایانینە خوارەوە، ئەو ڕۆژە زۆر ترسام چونکە مەزەندەم دەکرد بمانبەن بۆ کوشتن، بەڵام چونکە سالارم لەگەڵدا بوو لەخۆمەوە هەستم بەدڵنیاییەک دەکرد ئەگەرچی دڵنیابووم لەوەی کە سالاریش وەک من پەلبەستەو چاوبەستەو بێ دەسەڵاتە، بەهەرحاڵ بە پاڵ وبە ڕاکێش ڕاکێش بردیانینە حەوشە و لەوێ چل ناویان خوێندەوە، ناوی نەوزادی تێدا نەبوو بۆیە دووبارە گێڕایانەوە بۆ ژووری تەسفیرات، پاش خوێندنەوەی ناوەکان، هەر چل کەسەکەمان خراینە ناو ئۆتۆمبیلێکی داخراو (بۆکس) ی بچووکەوە ئیدی بەسەر یەکدا ترشاین شوێنەکە هێندە تەسک و تەزیق بوو، هەندێ لەزیندانیەکان بەسەریەکتردا ڕشانەوە، ئیدی شەقام بەشەقام بردیانین نەمانزانی بۆ کوێمان دەبەن، پاش ماوەیەک دەرگا کرایەوەو ئۆتۆمبیلەکە چووە حەوشەیەکەوە یەکێک لەزیندانیەکان کە دیاربوو ئەوە دووەم جاری بوو دەستگیر کرابوو پێی گوتین: (کوڕینە من شارەزام و ئێستا ئێمە لەناو دائیرەی ئەمنی سلێمانیداین).

# له دائیرەی ئەمنی سلێمانی دا!!

ئەوەبوو لەوێش بەهەمان شێوە بەپاڵ دایانبەزاندین و ئەو چل کەسەیان بەسەردوو ژووردا دابەش کرد هەر ژووری (٢٠)کەس، هێشتا سێ ڕۆژمان لەوێ تەواو نەکردبوو، سەرتاشیان هێناو سەری هەر هەموومانیان سفر کرد.

ئیدی لەوێ هەموو ڕۆژێ لێدان و ئەشکەنجە و ئازاردانی دەروونی بەردەوام بوو، لەوێ بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ تاکەی لەم بەندیخانەیەدا دەمێنینەوە، تۆ بڵێی بمرین یان ڕۆژێک دادێ وبەسەرفرازی دەچینەوە ناوکەس و کاری خۆمان، بەهەر حاڵ چوارەم ڕۆژی ژوورەکەی ناو دائیرەی ئەمنی سلێمانیمان بوو، پاسەوانێک هات و ناوی من و سالاری خوێندەوەو بردیانینە ژوورێکی نیمچە تاریکەوە، ئەوە ژووری لێکۆڵینەوەو لێدان و ئیعتراف کردن بوو، کورسیەک دانرابوو بەرامبەر کورسیەکەش کامێرایەکی ڤیدیۆ ئیشی دەکردو لەپشت کامێراکەوە پارچە وەرەقەیەکی گەورەو درێژ بەخەتێکی گەورە بەماجیک بەعەرەبی دەقی ئیعتیرافەکە نووسرابوو: (انی المتهم..... هتد) دەبوایە زیندانی بیخوێنێتەوەو دان بەوەدا بنێ کە تاوانێکی ئەنجام داوە.

هەر کەسێکیش بەهەڵە وەرەقەکەی بخوێندایەتەوە کامێرایان دەکوژاندەوە و بەردەبوونە گیانی و لێیان دەداو پاش کەمێک دووبارە پێیان دەخوێندەوە، لەپێشا منیان بەرامبەر کامێرا داناو وتیان بخوێنەوە، چەند دێڕێکی یەکەمم خوێندەوە تەماشا دەکەم لەبەشێکی دا بەعەرەبی نووسراوە (من لەنێو پارێزگای سلێمانیدا، هەستام بە چەند کارێکی تیرۆریستی و دەستدرێژیم کردە سەر هاووڵاتیان و بەپارە هاوکاری گێرە شێوێنانم کردووە)

کە گەیشتمە سەر ئەو دێڕانە، نەم خوێندەوەو گوتم: (من هیچم نەکردووەو ئەوە هەرگیز نابێتە ئیفادەی من)، هەرلەگەڵ وام گوت، جەلادێک کامێرەکەی کوژاندەوەو دوانی تر کەوتنە گیانم بەشەق و بۆکس ئیدی زۆریان لێ دام وزۆر ئازاریان دام چەندە هاوارم کردو گوتم: ( ئاخر من کاری وەهام ئەنجام نەداوە!!) هیچ سوودی نەبوو پاش ئەوە دەکەوتنە معامەلە لەگەڵماندا، دەبوایە دانت بەیەکێک لەوتاوانانەدا هەربنایە، من ئینکاریم زۆر کرد، بۆیە گوتیان تۆ تەنها بڵێ(پارەم داوە بەگێرە شێوێنەکان و هاوکاریم کردون) ئیدی ناچاربووم نەمگوتایە دەیانکوشتم، بەڕای خۆم ئەوە تاوانێکی زۆر گەورەنەبوو لەدیدی بەعسیەکانەوە، پاش ئەوەی دەقی دانپێدانانەکەیان پێ ئیمزا کردم بێگومان خوێندمەوە ئینجا ئیمزام کرد، ئینجا منیان بردە ئەو لاوەو سالاریان بەپاڵ هێنایە سەر کورسیەکەو دەمانچەیەکی بێ فیشەکیان دایە دەستی وگوتیان: ( دەی بەدەمی خۆت بڵێ من بەم دەمانچەیە رەفیق فلانم کوشتووە) سالار دەمانچەکەی وەرنەگرت و سەری باداو گوتی: ( من کاری وام نەکردووەو نایڵێم) جەلادەکە بەزمانی هەڕەشەوە گوتی: ( ئەگەر ئەوە نەکەیت هەر ئێستا دەتکوژم، شەرت بێ وەکو براکەت ئیعدامت دەکەم) منیش ویستم زۆر ئازاری سالار نەدەن پێم گوت: (سالار تۆش وەکو من بڵێ بە پارە هاوکاری گێرەشێوێنانم کردووە) جەلادەکە کۆمەڵێ جنێوی پێدام و بەتوڕەییەوە پێی گوتم: ( نا..نا ئەوە تاوانی گەورەتری کردووە ئەوە پیاوی کوشتووە دەبێ سزای خۆی وەربگرێت). بێگومان ئەم لێکۆڵینەوەو بەزۆر ئیعتیراف کردنە لەبەردەم کامێراو بەئیمزای خۆیان، زیاتر بۆ ڕازی کردنی گەورەکانیان بوو، دەنا ئەوان لەو ژوورە تاریکەدا دەیانتوانی بە ئارەزووی خۆیان لەوە زیاتر تاوانت بخەنە پاڵ و پێت ئیمزا بکەن، بەبێ ئەوەی رێگە بدەن دەقی دانپیانانەکەت بخوێنیتەوە. بەهەر حاڵ پاش ئەوەی سالار هیچی نەدرکاندو دانی نەنا بەوەی گوایە پیاوی کوشتووە، جەلادەکان کەوتنەوە گیانمان و هەتا توانیان لێیان داین، ئینجا بەرپرسەکەیان فەرمانی دا سالار ببرێتە ژووری تاکە کەسی (انفرادی) ئیدی چاویان بەستەوەو بردیان، منیشیان چاوبەست کردەوەو بردیانەوە ژوورەکەی خۆمان وەک باسم کرد ئەو ژوورە پێشتر بەمن و سالارەوە (٢٠) کەسی تێدابوو،

ئەوانەی لەیادم مابن: (عومەری نوری بەگ و مەحمود چوارباخی، ئەبەز چوارباخی، نزارو هەژار دووبرا بوون خەڵکی گەڕەکی ماموستایانی سلێمانی بوون لەگەڵ چەند زیندانیەکی تر) کە چوومە ژوورەکە زیندانیەکان لێم کۆبوونەوەو باسی چۆنێتی لێکۆڵینەوەکەم بۆ کردن و پێم گوتن سالاریان بردە ژووری تاکە کەسی و تاوانی کوشتنیان دایە پاڵ.

هەندێ ئامۆژگاریم کردن و پێم گوتن: (هەتا دەتوانن و بەرگەی لێدان دەگرن دان بەهیچ شتێکدا مەنێن خۆ ئەگەر هەر لەتواناتاندا نەما، دان بەتاوانێکدا بنێن کە سێدارەدانی لەسەر نەبێ)، لەو مانگەدا واتە مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٥ حکومەت ڕەشبگیرییەکی یەکجار بەرفراوانی لەنێو شاری سلێمانیدا ئەنجام دا، ڕۆژانە چەندین گیراوی نوێیان دەهێنا بۆ دائیرەی ئەمنی سلێمانی لەو ساڵەدا هەزاران پیروگەنج و خێزان و بنەماڵەی شۆڕشگێڕو نیشتمانپەروەر خرانە زیندانە تاریکەکانی حزبی بەعسەوە، لەو گیراوە تازانەی هێنایاننە ناو ژوورەکەی ئێمە: (مام نەسرەدین و ئامانجە ڕەش و عەلی عەبەکۆڵ) بوون بەرلەوەی بیانهێنن بۆ لای ئێمە زۆر زیندانی تر دەهاتن باسی قارەمانێتی و ئازایەتی و بەجەرگی ئەو سێ کەسەیان دەگێڕایەوە دەیانگوت لە بەندیخانەی تەواری چوارباخ پیاوانی ڕژێم و جەلادو ئەمنەکانیان بەچۆکدا هێنابوو، چەندین ڕۆژ لێیان دراوەو ئێستاش هیچیان نەدرکاندووە، مام نەسرەدین پیاوێکی بەهەیبەت و روخۆشی تەمەن (٥٥) ساڵ بوو سەربەرێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو باسی ئازایەتی ئەویان زۆر دەکرد، تەنانەت ئەوشەوەی هاتنە ژوورەکەی ئێمە رزگار کە چەند ڕۆژێک بەر لە ئەوان هاتبووە ژوورەکەمان ئاماژەی بۆ مام نەسرەدین کردو گوتی: (ئاگاداربن ڕێز لەو پیاوە زۆر بگرن، ئەوە مام نەسرەدینە یەکێکە لە زیندانیە هەرە قارەمانەکان)، شەو رزگار باسی یەکێک لەهەڵوێستە بەرزەکانی مام نەسرەدینی بۆ کردین و بەم شێوەیە گێڕایەوە: (مام نەسرەدین لەتەواری چوارباخ لەژووری ئێمەدا زیندانی بوو، نەقیب میدحەت هەبوو جەلادێکی خوێنرێژو پیاوکوژ بوو، شەوێکیان هاتە ژوورەوەو تەماشایەکی مام نەسرەدینی کرد گوتی: ( حاجی عەیب نییە بۆ تۆ گێرەشێوێنی دەکەیت؟ ڕەفیقی تۆ ئێستا بۆ خۆی لەماڵەوەدانیشتووە خواپەرستی دەکات!).

کەچی مام نەسرەدین لەوەڵامدا گوتی: ( مرۆڤ ئەگەر لەپێناو گەل و وڵاتدا خەبات بکات ئەوەش بەشێکە لەخواپەرستی).ئیدی لەسەر ئەم وەڵامە ئەشکەنجەی زۆر درابوو.

## شەوی جەژن و کوشتنی ئاسۆی قومری

بەردەوام گیراوی تازەیان دەهێنایە بەندیخانەی دائیرەی ئەمنی سلێمانی لەوانەوە زانیمان ئەو رۆژە عارفەیەو بۆ سبەی جەژنی موسڵمانانە، ئەوشەوە هەر زیندانی نوێ بوو بەشەق و لێدان و هاوار هاوار دەیانهێنا بۆ ناو بەندیخانەکان وبەسەر ژوورەکاندا دابەشیان دەکردن. جگە لەوانەی کە دەیانهێنایە ژووری ئێمە ئیدی نەماندەزانی کێن ئەوانەی بەو شەوە دەگیرێن، هەڵمەتە رەشبگیرییەکانی حکومەت لەنێو کوردستاندا هەمیشە لەو کاتانەدا بوو کە کەس مەزەندەی نەدەکرد، شەوانی سەری ساڵ و رۆژانی عارفە و جەژن باشترین کات بوو بۆ ئەوان، لەو دیو دەرگای ژوورەکەوە هاوارو ناڵەناڵ وگریان و قریشک و ورِی لێدانی زیندانیە نوێکان دەگەیشتە عەرشی ئاسمان، لەخودامان دەویست دەرگامان لێ نەکەنەوە بۆ ئەوەی چاومان لەئەشکەنجەو ئازاری ئەوانی دیکە نەبێت، هەر ئەو شەوە لەپرێکدا لەو دیوەوە نەفەرێکیان دا بەدەرگای ژوورەکەی ئێمەدا دەنگی بەقەد هاوانێک هات و رای چڵەکاندین، کورێکی منداڵکارمان لەگەڵدا بوو ناوی عەتا بوو کە گوێی لەرمبەی دەرگاکەبوو وەکو بڵێی تووشی حاڵەتێکی لەشێوەی هیستریا بووبێت پڕ بەو ژووره هاواری کرد (ئای.. ئای)، بەڵام کە دوایی تەماشای ئێمەی کرد هەستی بەشەرمەزاری کردو یەک دووجار بەشەرمەوە گوتی:(وام زانی ئەو دەنگە تەقینەوە بوو) خەریک بوو شێت بێ لەترسا، پاش چەند ساتێک دەرگای ژوورەکە کرایەوە،پاسەوانێک بەجل و بەرگی مەدەنیەوە پانتۆڵێکی رەش و کراسێکی سپی لەبەردابوو، بەڵام تاخم وجوعبەی فیشەکی بەستبوو کلاشینکۆفیشی بەدەستەوەبوو، لەپشت پاسەوانەکەوە پیاوێکی ئەمنی تەمەن ( ٤٠ )ساڵ وەستابوو، ئەو پیاوە ناوی حاجی شاکر بوو وەک خۆی باسی دەکرد پێشتر بەرپرسی ئەمنی فرۆکەخانەی سەدامی نێودەوڵەتی بوو، پاسەوانە هەرزەکارەکە ئاورێکی دایەوە بۆ دواوەو بەعەرەبی بەحاجی

شاكری گوت: (گەورەم گولله بارانیان بكەم؟!) حاجی شاكر گوتی: (نانا وازیان لێ بێنه) زۆر له زیندانیەكانی ناو ژوورەكەی ئێمه هەر سەرەتاتكێ و مله قوتێیان بوو،دەیانویست بزانن لەو دیو دەرگاكەوه كێ گیراوەو لێی دەدەن، دەیانویست بزانن گیراوه تازەكان كێن، كوڕێكی مەجید بەگیمان لابوو لەپڕ هاواری:( كرد ئەرەوەڵا ئەوه یاسین مەجید بەگیه گیراوه دەیناسم) چەند كەسێكی دیكەیان لێ ناسرا لەوانه (ئارام، هیوا، سەردار) ئینجا حاجی شاكر زۆرتر هاته ناو ژوورەكەوەو یەكه یەكه ناوی لێ پرسین پاشان كەوته قسەكردن و بەحسابی خۆی وانەیەكی نیشتمانپەروەری داینێ!!، حاجی شاكر لەنێو قسەكانیدا گوتی: ( ئێوه بۆچی كاری وا هەڵه دەكەن وخۆتان تووشی ئەم ئازاره دەكەن؟) فەرەیدون كه برای فەرهاد بوو ئەو دوو برا جمكەی كه یەكەمین ڕۆژی زیندانم لەنێو حاویەی خۆڵەكەدا ناسیمن وەڵامی حاجی شاكری دایەوه گوتی:( ئێ باشه ئازادمان كەن ئەمجاره كاری وا ناكەین) حاجی لەوەڵامدا گوتی:( پشت بەخودا.. پشت بەخودا) دیاربوو حاجی شاكر كەمێك بەزەیی پێماندا هاتەوه بۆیه كه دەرگاكەی داخست لەپەنجەرەكەوه تەماشایەكی كردین وجگەرەیەكی داگیرساند دووباره دەرگاكەی كردەوه گوتی: ( سبەی جەژنه پیرۆزبایتان لێ دەكەم خۆزگەم دەخواست ئێوەش لەنێو كەسو كاری خۆتاندا جەژنتان بەسەر ببردایه، من تاوەكو دوای جەژن ناگەڕێمەوه، ڕەنگه هەتا من دێمەوه ئێوه ئازاد كرابن، هەمووساڵێكتان بەخۆشی) ئیتر دەرگای داخست و بەجێی هێشتین، ئەو قسانەی حاجی شاكر كەمێك دڵخۆشی كردین، بەڵام كه گوێمان له هاوارو ناڵه ناڵی گیراوه تازەكان دەبوو، یەك تۆزقاڵ ئومێدو هیوای ئازادبوونمان لانەدەما، سەعاتێك دوای ئەوه دووگەنجی عەرەبی قۆزو تولازیان بەپاڵ و جنێودان كرد بەژووردا هەریەكەیان جانتایەكی بچووكی شانیان پێ بوو جل و بەرگ و پێویستی تێدابوو، بەشان و شەوكەت و قەدو بالآیاندا دیاربوو كه وەرزشوان بوون، دوایی دەركەوت یەكێكیان ناوی كەریمەو یاریزانی بۆكسێنه، ئەوی دیكه ناوی قەیس بوو پاڵەوانی زۆرانبازی بوو، هاوكات یەكێك بوو لەدەرچووانی كۆلیژی پەروەردەی وەرزش لەزانكۆی بەغدا، سەرەتا كەس لەزیندانیەكان قسەی لەگەڵ نەكردن ئەوانیش نەیاندەوێرا كەس بدوێنن، لەسوچێكی ژوورەكەدا

دانیشتن و پاش کەمێک دەنگی گیراوی تازە دەهات و لێدان و ئەشکەنجەو هات و هاواری زیندانیەکان دەستی پێ کردەوە ئیدی تابەرەبەیان بەردەوام بوو. ڕۆژ بۆوەو لەدوورەوە دەنگی (الله اکبر.. الله اکبر)ی نوێژی بەیانی جەژن دەهات و وردە وردە هاتوچۆی ئۆتۆمبیل دەستی پێ کردەوەو زانیمان ڕۆژ بۆتەوەو یەکەمین ڕۆژی جەژنە، هەندێک لە زیندانیە موسڵمانەکانی ناو ژوورەکەو، هەردوو گەنجە عەربەکە کەشیعە بوون هەستان پێکەوە نوێژی بەیانیان دابەست،یەکێک لە پاسەوانەکان هاتە ژوورەوەو خواردنی بۆ هێناین، بۆ یەکەمین جاربوو لەو ڕۆژەی کە گیرابووین سەمون و هێلکەیان داینێ ویەکی کوپێکی نایلۆنیان داینێ و دوو قوری چای بۆ داناین، ئینجا گوتی: جەژنتان پیرۆز بێ! هێشتا دەستمان نەکردبوو بەنان خواردن ئەشکەنجەو لێدانی زیندانیەکانی دەرەوە دەستی پێ کردەوە، گوێمان لێ بوو یەکێک لەجەلادەکان پڕ بەدەنگی هاواری دەکرد بەسەر زیندانیەکداو دەیگوت:( قسە بکە.. پێمان بڵێ چۆن حاجی ئاسۆت کوشت؟) یەکێکی تر لە جەلادەکان گوتی: ( نا.. نەکەی نانیان نەدەیتێ هەتا ئیعتیراف نەکەن!) ئیدی ئەو بەیانیە پێم وا بێ زۆر لە خێزانانی شاری سلێمانی نەیانزانیبوو تام وچێژی جەژن و جەژنانە چییە، چونکە ئەوەی ئێمە ناگاداربووین بەدرێژایی ئەوشەوە هەر گەنج و پیرو منداڵ و ئافرەتیان کرد بەژوورا بۆ نێو بەندیخانە تاریکەکان. تەنانەت بەدرێژایی یەکەمین ڕۆژی جەژن ئەو بارودۆخە ناهەموارە بەردەوام بوو شەو داهات و (١٠)گیراوی تازەیان بە پاڵ فرێ دایە ژووری ئێمەوە، لەوانەی لەیادم ماون( ئارام قوتابی کۆلیژی یاسا بوو، هیوا، سەردار، یاسین مەجید بەگی) ئیدی کەوتمە پرسیار کردن لەو زیندانیە نوێیانە(ناوت چیە وخەڵکی کوێیت و ئیشت چیەو لەسەر چی گیراوی؟) ئارام بەبێ ترس گوتی: ئەفسەری ئەمنی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیر وجەماوەریمان کوشتووە، هیوا دەیگوت:( ئەگەر لەژیاندا ماین ڕۆژێ لە ڕۆژان حەقی خۆمان دەسێنینەوە، یاسین مەجید بەگ گەنجێکی قسە خۆش و ورە بەرزبوو هەمیشە دەیگوت: ( کوڕینە ئەگەر ئازاد کراین ئەوە سەربەرز دەژین،ئەگەر ئیعدامیشیان کردین ئەوە با قوربانی سلێمانی بین) لە لەو گفتوگۆو قسانەدابووین سالاری برادەرمیان هێنایەوە ژوورەوە، وەک سەرەتا بۆم باس کردن سالار هەتا ئەو

ڕۆژەی لەیەکتر جیابووینەوە برایەکی دڵسۆزو خۆشەویستم بوو. چوار ڕۆژبوو لە ژووری تاکەکەسیدا کە ڕووبەرەکەی بەقەد بەرمیلێکی نەوت دەبوو پەلبەست کرابوو دەستبەجێ هەستامە سەرپێ و باوەشم پێدا کردو جەژنە پیرۆزەم لێ کرد ئینجا بەزیندانیە تازەکانم ناساند. ئیتر دوای ئەوە یاسین باسی بارودۆخی سلێمانی بۆ کردین و دەیگوت: (چۆن نەتان بیستووە؟! دوێنێ ئاسۆی قومری کوژراوە،ئەم هەمووخەڵکەیان لەسەر ئەو گرتووە پیاوانی ڕژێم لەترساندا تۆقیون، شار شڵەژاوە و ژیانی تێدا ئاستەمە). ئاسۆی قومری یەکێک بوو لەپیاوە دڵسۆزەکانی حزبی بەعس و دەزگای ئەمنی ڕژێم لەسلێمانیدا، ڕۆژانە دەیان گەنجی کوردی دەگرت و سوکایەتی زۆری بەخێزانە شۆڕشگێڕو نیشتمانپەروەرەکان دەکرد، ئەو کات ڕژێم لەنێو شاری سلێمانیدا پشتی تەواوی بەو پیاوە بەستبوو.

دوای ئەو قسەیە بۆ یەکەمین جار لە دوو گەنجە عەرەبەکەم پرسی لەسەرچی گیراون؟ لەوەڵامدا گوتی: ( هیچمان نەکردووە،هاتبوین بۆ گەشتوگوزار، بەڵام پاسپۆرتی سەفەرمان پێ بوو، ئیدی لە ئوتێلێکی سلێمانیدا گیراین بەو تاوانەی گوایە بەنیازین بچینە ئێران)، ئینجا قەیس لەمنی پرسی:( ئەدی ئێوە ئەم هەمووە لەسەر چی گیراون؟) منیش گوتم:( گوایە لەحکومەت یاخی بووین!!) ئیدی ئەو دووگەنجە عەرەبە زۆر خۆشیان ویستین،ئەو بارودۆخە ڕۆژ بەڕۆژ ناخۆشتر دەبوو ڕۆژانە خەڵکیان لێ دەبردین بۆ لێدان و ئەشکەنجە تەنانەت زۆر لەو زیندانیە گەنجانەیان لەسێدارە دەدا یاخود گوللە باران و قەنارەیان دەکردن، بەهەر حاڵ ئەوانەی تازە دەگیران دەیانگوت سلێمانی یەک پارچە پرسەبارەو زۆربەی خەڵک رەشپۆشە. بێگومان ژیانی نێو ئەو بەندیخانانە وابوو چەند زۆرتر تیایدا بمایتایەتەوە فێری شتی باشتر دەبوویت و پتر ورەت بەرزدەبۆوەو متمانەت بەخۆت زیاتر دەبوو ئەو ماوەیە من و هەندێ لە برا زیندانیەکانی ترم زۆر ناسرابووین بەحسابی خۆمان لە زیندانیە کۆنەکان بووین!! لەماوەیەکی کەمدا دووجاری تر سالاریان برد بۆ لێدان و ئەشکەنجە بەمەبەستی ئەوەی دان بەو تاوانەدا بنێ کە دەیانویست بیخەنە پاڵی، ئەودوو جارە زۆر زۆریان لێ دا شل و شەکەتیان کرد، سالار ڕۆژ بەڕۆژ لاواز ترو بێ هێزتر دەبوو کە لە لێدان و ئەشکەنجە دەیان هێنایەوە من هەر دەمشێلاو خزمەتم

دەکرد، دەستم بۆ هەر شوێنێکی جەستەی دەبرد لەئازارا دەینالآند، سالار هەر بەخۆراگری مابۆوەو دانی بەهیچ شتێکدا نەدەناو ئەوانیش لەئازاردانی کۆڵیان نەدەدا شەوێکیان سێ جەلاد هاتن و سالاریان برد پتر لە سەعاتێک لێیان داو هیچی نەگوت، وەختێ سالاریان فڕێ دایەوە ژوورەوە حاڵی زۆر شڕبوو ئاوباڵای خوێن وشوێن کێبڵ و لێدان بوو، توانای قسەکردن وئاخ و ئۆفیشی نەمابوو،ئەوشەوە هەموومان بۆ سالار دەگریاین بەتایبەتی من، چونکە دەمزانی سالار ئەگەر لەزیندان و لەبەردەم ئەم گورگانەدا نەبێت کوڕێکی چەند قارەمان و ئازاو بەجەرگە، تەنانەت کەریم ئەو کوڕە عەرەبەی لەگەڵ برادەرکەیدا گیرابوو سەری سالاری خستە باوەشی خۆیەوە هەتا درەنگی شەو بۆ سالار گریا، من زۆرم بەسالار دەگوت: (سالار گیان دەشتێک بڵێ با ئیعدامت نەکەن) سالار بەئازارەوە دەیگوت: ( شێرە گیان ئەوانە دەیانەوێ کوشتنی پیاوێکم بەسەرا ساغ بکەنەوە ئیدی شتی چی بڵێم؟) ئیدی کەریم بەردەوام بوو لەشێلانی سالار لەو کاتەدا پاسەوانێک چاوی لێ بوو کە خزمەتی سالارمان دەکرد لەپەنجەرەکەوە بەعەرەبی هاواری کرد: (هەندێک ئامۆژگاری بکەن با ئیعتیراف بکات،ئەگینا بەرگەی جارێکی تری لێدان و ئەشکەنجە ناگرێت بە خودا دەمرێت)ئیدی سالار ئازاری زۆربوو بەتایبەتی هاواری سەری دەکرد، لەوکاتەدا کەریم گەنجە عەرەبەکە بەپاسەوانەکەی گوت: ( ئەرێ حەبێکی سەر ئێشەت نییە بیدەینێ ئازاری زۆرە؟) کەچی پاسەوانەکە گوتی: ( چی؟!! حەبی سەر ئێشە!! دەتەوێ بە ئیعدام کردنم بدەیت؟!). ئیتر نزیکەی دوو مانگ لەو ژوورە لەنێو بەندیخانەی دائیرەی ئەمنی سلێمانی ماینەوە، شەوێکیان من و کەریمە عەرەبەکە قسەمان زۆر کرد، ئەوشەوە بۆیەکەمین جار راستیەکەی بۆ درکاندم کە ئەوان بەنیازبوون برۆنە ئێران، تاوەکو بەرەبەیان دانیشتین کەریم باسی وەرزشی بۆکسێن و پاڵەوانێتییە وەرزشیەکانی خۆی بۆ دەکردم، لەپڕ دەنگ و هاڕەیەکی زۆری ئۆتۆمبیل هات دەرگای هۆڵەکەی بەرامبەر ژوورەکەمان کرایەوە، خێرا هەستامە سەر پێ ولەپەنجەرەکەوە سەیرم کرد تەماشا دەکەم نزیکەی ( ٥٠ )گیراوی گەنجی تازەیان بەجل وبەرگی خەوتنەوە بەپاڵ کرد بە هۆڵەکەدا هەموویان چاویان بەسترابۆوەو دەست بەدەست پێکەوە کەلەبچە کرابوون ،کەریم بانگ کردو

دیمەنەکەم پیشان دا کەریم لەبەرخۆیەوە بەعەرەبی گوتی: (خودایە هاوارئەمەیان چییە؟!)ئینجا کردیاننە ژوورەکانی ترەوەو زیندانیەکانی ژوورەکانی دیکەیان هێنایە ژووری ئێمەوە بەو شێوەیە ژوورەکەمان تەواو قەرەباڵغ بوو، ئیدی چەند پاسەوان و جەلادێک لیستێکیان بەدەستەوە بوو کەوتنە ناوخوێندنەوە بەهەموو ژوووورەکان (١٠٠)ناویان خوێندەوە و لەژووری ئێمە (٢٥)کەسی بەرکەوت و سێهەم ناو من بووم و یانزەهەم ناو سالار بوو،بۆ هەر شوێنێک ناوی سالاریان لەگەڵ ناوی مندا بخوێندایەتەوە جۆرە دڵنیاییەک ئاسوودەی دەکردم، حەزم دەکرد ئەگەر مردنیش بێت پێکەوە بمرین ویەک چارەنووسمان هەبێت ئینجا پاسەوانەکە گوتی: (خۆتان ئامادەبکەن پاش چارەکێکی تر دەتانگوازینەوە) نەماندەزانی بەرەوکوێمان دەبەن،بەڵام خودا حافیزی و ماڵئاواییمان لەهەموو زیندانییەکان کرد بەتایبەتی لەدووگەنجە عەرەبەکە (قەیس وکەریم) ئەو ماوەیە قسەی زۆرم بۆ کردن دەربارەی رەوایی کێشەی کوردو ستەم و مەینەتی خەڵکی کوردستان و زوڵم و زۆرداری رژێمی عێراق، کە ئەملاو ئەولام ماچ کردن کەریم گوتی: ( شێرزاد ئەم جێیە زۆر ناخۆش بوو کە یەکتریان تێدا ناسی، پشت بەخودا لەئایندەدا لەشوێنێکی خۆشتر یەکتری دەبینینەوە، من ئەم ماوەیە ئێوەم زۆر خۆشویست و زۆر راستیمان بۆ روون بۆوە لەسەر کێشەی ئێوە کە جاران لێی بێ ئاگابووین) کە گوتم لەو قسانەبوو بەدەست خۆم نەبوو هەستم بەگەورەیی خۆمان دەکرد، پاش چارەکێک پاسەوانەکان هاتن ودوو دوو بەکەلەبچە پێکەوەیان بەستینەوەو بەلەفافی سپی هەموومانیان چاو بەست کرد.

پێم وابێ ئەو رۆژە لەناوەراست بەرەو کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٥ بوو، دیسان لەحەوشەی بەندیخانە ناوی هەر (١٠٠)زیندانیەکەیان خوێندەوەو چوار ئۆتۆمبیلی بۆکسی داخراویان هێناو هەرئۆتۆمبێلێک و (٢٥)زیندانیان تێ کرد، لەکاتێکدا ئەو ئۆتۆمبیلانە هەریەکەیان ئەگەر زۆری لێ بکرابە ئەو پەری جێگای (١٠)کەسی تێدا دەبۆوە، بەڵام ئێمەیان ترشاند بەسەر یەکتردا.

پاش ئەوەی (٢)سەعات زیاتر لەنێو ئەو ئۆتۆمبیلانەدا ئێمەیان لەوحەوشەیە راگرت ئینجا ئۆتۆمبیلەکان جوڵەیان کرد، لەو کاتەدا بیری

گەنجەکانی سەرچنارم کەوتبۆوە ( جەزای شێخ محەمەدی وەزن و شادمانی شێخ عوسمان و..هتد) کە بەر لە ئێمە گیران و ویستیان بە ئۆتۆمبیل لە سلێمانیەوە بیان گوازنەوە بۆ بەندیخانەکانی بەغدا کەچی لەرێگا تووشی رووداوی هاتوچۆ بوون وهەموویان شەهید بوون، ئێمە لە ئۆتۆمبیلەکەدا چاومان لەهیچ نەبوو،بەڵام بە پێی رێگاکان وئاراستەی رۆیشتنی ئۆتۆمبیلەکان زانیمان لەسلێمانی دەرچووین. ئیدی کە لەناوشار دوور کەوتینەوە گوێمان لەدەنگی فرۆکەی کۆپتەر بوو بەسەرمانەوە ئەوانیش بەئاسمانەوە پاسەوانی ئۆتۆمبیلەکانیان دەکرد.

بەهەر حاڵ ئۆتۆمبیلەکان زۆر بەخێرایی دەرۆیشتن و ئێمەش بەشێوەیەکی وەها بەسەر سەروگوێلاک و پەلوپۆی یەکتریدا کەوتبووین هەر زیندانی بوو لە ژێرەوە هاوارو ئاخ و ئۆفی بوو، ناو ئۆتۆمبیلەکە یەکجار گەرم بوو، بۆنی عارەقە و چڵک و چەوری لەشمان زۆر ناخۆش بوو، ئاخر هەر بەدەم خۆشە (٢٥)کەس بەدەست وچاوبەستراوی لەنێو ئۆتۆمبیلێکی داخراودا بەسەریەکدا کەوتبن، هەردەم نادەمێ پاسەوانەکەمان کە لەپێشەوەی ئۆتۆمبیلەکە دانیشتبوو لە پەنجەرە بچووکەکەی قەمەرەی ئوتومبیلە بۆکسەکەوە تەماشای ئێمەی دەکردو هاواری دەکرد: (کەس قسە نەکات، ئەوەی دەنگی بێت...م) زۆربەمان رشاینەوە بۆنی رشانەوەش زیاتر هەراسانی کردین، زیندانی وا هەبوو میزی دەکرد بەخۆیدا، رێگاکە دوورو درێژو ماوەکە یەکجار زۆربوو هەر نەدەبرایەوەو نەدەگەیشتینە جێ قاچ و قوڵمان سڕ بوو بوو،ئیدی بەو شێوەیە نزیکەی (١١-١٢) سەعات بەرێوەبووین هەستمان کرد گەلێ لە سلێمانی دوورخراوینەتەوە، بەڵام نەماندەزانی لەکوێین! ئیدی باش بوو دواجار گەیشتینە جێیەک و ئۆتۆمبیلەکان وەستان، دەنگی پۆستاڵ و بلاوبونەوەی هێزەکان بەچواردەورماندا بە ئاسانی هەستی پێ دەکرا، ئینجا دەرگای ئۆتۆمبیلەکانیان کردەوەو یەکە یەکە دەریان دەهێناین، ئای چ هەوایەکی پاک بوو لەدەرەوەی ئۆتۆمبیلەکە، روحی کردینەوە بە بەرا،بەڵام پەل و پۆمان هەمووی سڕ بوو بوو بۆیە هەرلە ئۆتۆمبیل دەیانهێنایە دەرەوە یەکسەر دەکەوتین بەزەویداو پاش ئەوەی ئەو هەواپاکەمان هەڵدەمژی وردە وردە جوڵەو چالاکیمان تێ دەکەوتەوە، بەدرێژایی ئەو (١١-١٢)سەعات

ڕێیە ئەو عەزاب و ئازارەی لەنێو ئۆتۆمبیلەکەدا بینیمان بەقەد هەموو ڕۆژانی زیندانی لەسلێمانی ئازاری داین.

## گرتوخانەی فزەیلّیە

گرتوخانەی فزەیلّیە یەکێکە لەبەندیخانە گەورەکانی بەغداو دەکەوێتە ناوچەی فزەیلّیەو بەئوتومبیل نزیکەی ٤٥ دەقیقە تاوەکو سەعاتێک لەسەنتەری شارەوە دوورە.

ئەو ڕۆژەی گەیشتینە ئەوێ سەرەتا نزیکەی نیو سەعاتێک بەچاوبەستراوی وکەلەبچە کراوی لەحەوشەی گرتوخانەکەدا رایان گرتین و ناویان خوێندینەوەو سەر ژمێریان کردین،ئینجا کەلەبچەکانی دەستیان کردینەوەو لەفافە سپیەکانی سەرچاومانیان لابردو خراینە هۆڵێکی یەکجار گەورەوە کە ڕووبەرەکەی بەقەد گۆرەپانێکی یاریی تۆپی سەبەتە دەبوو،هەر لەنێو ئەو هۆڵە گەورەبەدا لەگۆشەیەکییەوە ژوورێکی گەورە هەبوو، ئیدی خستیانینە ناو ئەو ژوورەوە، سەقفی ژوورەکە یەکجار بەرزبوو، بە بنمیچی سەقفەکەوە پەنجەرەیەکی باریک و درێژ هەبوو وەک پەنجەرەی ژێرزەمین ئەو پەنجەرەیە والابوو جار جار شنەبایەکی فێنکی دەکرد بەژوورەکەدا، سالار و عومەر ومەحمود و زۆر لەبرادەرانم لەگەڵ بوون، هەموومان بەختەوەر بووین کە لەناو ژوورە ترسناک و پڕ ئازارەکانی دائیرەی ئەمنی سلێمانیدا نەمابووین،چونکە لەوێ خەمێکی زۆرمان خواردو ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆرمان چەشت، جەلادەکانی ئەوێ هەموو خوێنرێژو لەسۆز شۆراوەبوون، زۆربەیان خەڵکانێکی ناکەس بەچەو بێ ئەسڵ و فەسڵ بوون، بێگومان نەمان دەزانی پیاوانی ئەم گرتوخانە نوێیە کێن وچۆن رەفتار دەکەن، بەڵام هێندە لەدەم و چاوەکانی ئەمنی سلێمانی بێزار بوو بووین، پێمان خۆشبوو هەر چۆنێ بێت ئەو دەم وچاوانە بگۆڕین چونکە لەوێ وەختەبوو لەڕووی دەروونیەوە تەواو شکست بهێنین و دارِوخێین، بەهەر حاڵ یەکێک لەو دیمەنانەی کە کەمێک دڵخۆشی کردین بینینی چەند پۆلیسێک بوو،چونکە پیاوانی ئەمن و جەلادەکان هێندە رەزا قورس و پڕسام بوون ئێسکی پۆلیسیان لای ئێمە سووک کردبوو، وامان لێ هاتبوو پۆلیسمان بەکەسێکی روح شیرین دەهاتە پێش چاو، هەر چۆنێ بوو

ئێمەیان لەو ژوورەی گۆشەکەی هۆڵە گەورەکەی گرتوخانەی فزەیلیە بەجێ هێشت ودەرگایان لەسەر داخستین ئیدی هەموومان واقمان وڕمابوو بێ دەنگی بۆ ساتێک باڵی بەسەر ژووره تازەکەماندا کێشا نزیکەی نیو سەعات دوای ئەوە لە پەنجەرە باریکەکەی بنمیچی سەقفەکەوە یەک گلۆز جگەرەی سۆمەریان بۆ فڕێ داین، زۆرمان جگەرکێش بووین کە چاومان بەکلۆزە جگەرەکە کەوت لەخۆشیا وامان زانی لە ئاسمانەوە فریشتەکان بۆیان فڕێ داوین، عەلیە سور کە زیندانی بوو لەناوماندا خێرا گلۆزە جگەرەکەی هەڵگرتەوەوەو گوتی: ( ئەرێ ئەمە کێ فڕێیدایە ئەم ژوورەوە، بەشەرەفم وەکو بڕیاری لێبوردنی گشتی وایە!) جگەرەمان بۆ هاتە ژووری بەڵام کەسمان شقارتەمان پێ نەبوو، سەیری پەنجەرەکەمان دەکرد ئاسمان دیاربوو نەمان دەزانی ئەو دیو پەنجەرەکە چیەو کێی لێیە هەموو لەسۆراخی شقارتەدا بووین لەپڕ عەلیە سور هاواری کرد: (شقارتە.. شقارتە) دە دەقیقەی بەسەردا تێپەڕی ئەوەندەمان زانی سێ شقارتەیان لەپەنجەرەکەوە بۆ فڕێ داین ،ئیدی دەستمان کرد بەجگەرەکێشان شەو داهات و دنیا تاریک بوو لەپەنجەرەکەوە سەیری ئاسمانمان دەکرد یەکەمین جار بوو لەوەتەی گیرابووین ئەستێرەمان بەئاسمانەوە دی هەموو لەبەر خۆمانەوە دەمانگوت: (ئەلا.. ئەستێرە چەندجوانە!) ئیدی بەر پەنجەرەکەمان بەرنەدەدا بەدیەنی ئاسمان زۆر سەرسام بووین، ئاخر زۆرە بۆ مرۆڤ کە بۆماوەی (٣-٤)مانگ خۆرو ئەستێرە و ئاسمان نەبینێت بەتایبەتی مرۆڤی ئەم وڵاتە کە هەمیشە دیەنی ئاسمان ئاسوودەیی پێ بەخشیوە. لەو تەماشا کردنەدا بووین دەرگای ژوورەکە کرایەوەو پۆلیسێکی گەنج و روح سووک هاتە ژوورەوە بۆ لامان. ئەو پۆلیسە ناوی (فلەیح) بوو زیندانیەکان هەرگیز فێری ناوی نەدەبوون بۆیە پێیان دەگوت: (فەلاوییح) کوڕێکی بێ وەی بوو حەزی بەخراپە نەدەکرد، لەدەرگاکەوە بەخێرهاتنی کردین و پێی گوتین: (چاوەڕێ بن ئێستا خواردنتان بۆ دێت) پاش چەند دەقیقەیەک چەند پۆلیسێک، چوارسینی گەورە گۆشتی قیمەی سوورەوە کراویان هێناو سەوزەو تەماتەو پیازو سەمونیشی لەگەڵدا بوو، چوار سەتڵی گەورەی ئاوی ساردی بەفراویان بۆ هێناین لەو ڕۆژەوەی کە گیرابووین ئاوی ساردمان نەخواردبۆوە، پتر لە هەموو شتێک تامەزرۆی بەفراوەکە بووین،

بەراستی خوانێکی تێروپڕ بوو هەرگیز لەسفرەی ناو بەندیخانەکانی عێراق نەدەچوو بۆیە ئەو کاتەی دەشمان خوارد بڕوامان نەدەکرد، هەندێکمان وای دەزانی خەون دەبینێ قاپ و کاسەو کەوچکی زۆر پاک وخاوێن بوو بەراستی لەخوانێکی تێروتەسەلی پیاوێکی سەخی تەبیعەت دەچوو.

وەختێکمان زانی پیاوێکی ریشسپی روح شیرینی نورانی و پاک و خاوێن دزداشەیەکی سپی لەبەرو کلاوێکی سپی لەسەرابوو بەدوای فلەیحدا خۆی کرد بەژوورا، زۆر بەسۆزو بەزەییەوە تەماشای دەکردین چاوەکانی لەژێر چاویلکەکەوە سوور هەڵگەڕا، لەبەرخۆیەوە بەعەرەبی دەیگوت: ( منداڵن.. زۆر منداڵن!!) فلەیحیش دیاربوو دەترسا بۆیە بەهێواشی بەهێمنی زوو زوو پێی دەگوت: ( حاجی بۆ خاتری خودا بڕۆ دەرەوە تووشی تەنگ وچەڵەمەمان مەکە) کە پیاوە بەتەمەنەکە بەجێی هێشتین مرەیح پێی گوتین: ( ئەو پیاوە پیاوێکی خانەدان و پارەدارە، بەڵام زۆر لەمێژە لەم گرتوخانەیە دەست بەسەرا گیراوە، ئەو خواردنەش کە بۆم هێنان ئەو پیاوە بۆی کڕیبوون) بەرلەوەی پاسەوان دەرگا دابخات یەک یەک چووین بۆ حەمام و ئاودەست، تەماشای هۆڵەکەم کرد کە بە تەلبەند پەرژین کرابوو بەراستی پاک و خاوێن بوو کۆمەڵێک زیندانی زۆر لەحەوشە پاڵکەوتبوون ودەمەتەقێ و گفتوگۆیان دەکرد ئەو گرتوخانەیە لەچاو دائیرەی ئەمنی سلێمانیدا بەهیچ شێوەیەک بەراورد نەدەکرا، ئەو دەمە پێمان وابوو هاتوینەتە گەشتوسەیران لەچاو ئازاری ئەمنی سلێمانیدا، ئیدی شەوێکی خۆشمان بەسەر برد زۆربەمان جگەرەمان دەکێشا دوکەڵی جگەرەکە ئەوژوورەی تەنیبوو یەکێک لەکونی دەرگاکەوە هاواری کرد: ( هێندە دوکەڵی جگەرە بەبامەکەن، ئەگینا پاسەوانەکانی دەرەوە لەپەنجەرەکەی ژوورەکەتانەوە هەستی پێ دەکەن). بۆ سبەی سەعات (٥)ی بەیانی فلەیح دەرگای بۆ کردینەوە بۆ ئەوەی دەم وچاومان بشۆین و خێرا بمانکاتەوە ژوورەوە، چونکە ئەو ڕۆژە زیندانیەکانی ئەو گرتووخانەیە جگە لەئێمە، نۆرەی دیدەنیان بوو (مواجهە) ئیدی ئەو ڕۆژە خەڵکانێکی زۆر لەخزم وکەسوکارانی ئەو زیندانیانە دەهاتنە دیدەنی و سەردانی کەسوکاریان دەکردو خواردن و پێویستیان بۆ دەهێنان، ژمارەیەکی زۆری ئەو زیندانیانەی گرتوخانەی فزەیلیە کوردە فەیلیەکان بوون. بێگومان ئەو کات ڕژێمی

عێراقی دژایەتیەکی زۆری کوردە فەیلیەکانی دەکرد، ئەوەش کۆمەڵێ هۆکاری هەبوو. یەکێک لەوانە ئەوەبوو کە ئەو کوردە فەیلیانەی دانیشتووی بەغدای پایتەخت وشارەکانی باشووری عێراق بوون، خەڵکێکی کاسبکارو سەرمایەدار بوون وبەشێکی زۆری چالاکییە بازرگانییەکانی ئەو پارێزگایا ئەو بەتایبەتی ناو بەغدا بەدەست ئەوانەوە بوو، هاوکات لەبواری سیاسیشدا بەئاشکرا کوردایەتیان دەکردو کەسانێکی زۆر کورد پەروەربوون، بەشێوەیەک کوڕی زۆر لەو لەو خێزان و بنەماڵانە پێشمەرگەبوون، ئەمەش بێگومان مەترسی هەبوو بۆ حزبی بەعسی دەسەڵاتدار، لەلایەکی دیکەوە بەشێکی هەرە زۆریان بەمەزهەب شیعەبوون و لەو لایەنەشەوە دیسان حکومەتی عێراقی دژایەتی دەکردن چونکە ئەو کات لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێراندا جەنگ لەگەرمەیدا بوو، لێرەوە ئەوانەو زۆر لەهۆکاری دی وای کرد کە حکومەت نەک هەر دژایەتیان بکات و زۆریان لێ بگرێت بیانچەوسێنێتەوەو لەسێدارەیان بدات،بەڵکو بەوە تاوانباری دەکردن کە کوردە فەیلیەکان مافی رەگەزنامەی عێراقیان نیە بۆیە سەدان هەزار کوردی فەیلی لەسەرانسەری عێراقی ئەوکاتەدا بەرەو ئێران راگوێزران، بەهەر حاڵ ئەوڕۆژە هەموو یەکتریمان بەرز دەکردەوەو لەپەنجەرەکەوە تەماشای ئاپۆرای دیدەنکارانمان دەکرد، بەراستی ئیرەییم پێ دەبردن حەزم دەکرد ئێستا دایک وباوک وکەسوکاری منیش بهاتنایە دیدەنیم، بەئاواتەوە بووم هەموو خوشک وبراکانم بێن بۆ لام و باسی ئەو ڕۆژانەیان بۆ بکەم، باسی ئازایەتی ئەو هەموو کوڕە کوردانەیان بۆ بکەم کە لەژێر زەبری دزێوترین شێوازی ئازارو ئەشکەنجەداندا ئامادەنەبوون دڵی جەلادەکان خۆش بکەن و تاکە وشەیەک بدرکێنن، بەهەر حاڵ ئەو ڕۆژە خواردنی زۆر خۆش وبەتام و بەچێژمان بۆ هات، ئەو زیندانیانەی ئەو دیو هەرچی خواردنێکیان لەکەس و کاریانەوە پێ گەیشتبوو لەگەڵ ئێمەدا برابەشیان کرد: ( شفتە، کوبە یاپراخ،کەباب، کفتە ) هەموو ئەم خواردنە بەتامانەمان بۆ هات کە زۆر لەمێژبوو ئەمان خواردبوو، بۆ نیوەڕۆ فلەیح هات و قسەی بۆ کردین دەیویست هاوکاریمان بکات و راستیەکانمان تێ بگەیەنێت، بۆیە دەیگوت: ( ئێرە پێی دەڵێن گرتوخانەی فزەیلیە، ئەمە گرتوخانەی پۆلیسە، ئێوەش زیندانی دائیرەی ئەمنن واتە ئێوە زیندانی

ئێمەنین تەنیا بۆ ماوەیەکی کاتی لەئەستۆی ئێمەدان، ئینجا یارمەتیمان بدەن ئێمەش یارمەتیان دەدەین تکایە کەس هەوڵی راکردن و هەڵهاتن نەدات، باکێشەمان بۆ دروست نەبێ هەوڵ دەدەین بتانخەینە ناو زیندانیەکانی ترو بچنە حەوشە، بەڵام تکایە کەس کاری هەڵە ئەنجام نەدات).

لەو قسانەدا بوو بەڕێوەبەری گرتوخانەکە هات، پیاوێکی قەڵەوی تێکسمڕاو بوو کەمێک ڕووی خۆش بوو روتبەی عەقیدی بەستبوو، سەرەتا بەخێرهاتنی کردین و خۆی پێ ناساندین،ئینجا ڕێنماییەکانی ئەوێندەری بۆ ڕوون کردینەوەو لابەلا هەڕەشەشی لێ کردین.

بەهەر حاڵ ئەوە ڕۆژێکی خۆش بوو لەژیانی نێو بەندیخانەدا، شەو داهات و مرەبیح یەک فەردە نەعلی لاستیکی بۆ هێناین و گوتی: (ئەو نەعلانەش ئەو پیاوە پیرە خێرخوازە بۆی کڕیون و بۆ بەیانیەکەی دیسان هەریەکەمان فانیلەو دەرپێ و گوێزان و سابون و تایتی بۆ ناردین و فلەیح بۆی هێناینە ژوورەوە چوار ڕۆژمان بەو شێوەیە بردە سەر ئیدی لەوە بەدواوە ڕۆژانە مرەبیح دەهات لەسەعات (١٠-١٢)ی نیوەڕۆ دەرگای ژووری لێ دەکردینەوەو تێکەڵ بەزیندانیەکانی تری کردین، زۆر لەوانم ناسی زۆربەیان لەسەر کوڕیان گیرابوون کوردی فەیلی زۆر تێدابوو،بەشی هەرە زۆریان دەستبەسەراگیراوبوون، لە (١٥)هەمین ڕۆژەوە پاش تکاو رجایەکی زۆر بڕیاردرا لە سەعات (١٠)ی بەیانیەوە تاوەکو (٧)ئێوارە دەرگای ژوورەکەمان والابێت، ئەو ماوەیە زۆر خاوێن و دڵشادبووین ڕۆژانە لەحەمام خۆمان دەشت بێ هیچ گرفت و کێشەیەک، لە هەموو زیندایەکان زیاتر دووکەس زۆر تێکەڵمان دەبوون ئەوانیش پیاوێکی کامڵ بەناوی (ئەبو شەهید)ەوە لەگەڵ (ئەبو بوشرا) ئەبو شەهید پیاوێکی زۆر لەخواترس وئاینی پەروەرو هێمن بوو پێشتر لە ژێر ئازارو و ئەشکەنجە قۆڕیان کردبوو ئەویش بەهەڵواسینی بوتڵە غاز بە ئەندامی نێرینەیەوە، ئەبو بەشرا کوردی فەیلی بوو نزیکەی سێ چارەکی خێزان وبنەماڵەکەیان هەر لەو گرتوخانەیە زیندانی بوون، گوێچکەی زۆر گران بوو،کچێکی هەبوو قوتابی پۆلی شەشی ئامادەیی بوو ناوی بوشرابوو بەهۆی ئەو کچەیەوە بەئەبو بوشرا ناوزەدیان دەکرد، بێگومان بوشراو دایکی و منداڵەکانی تریشی لەهەمان

گرتوخانە، بەڵام لەبەشی ئافرەتان زیندانی بوون تاوانی ئەو خێزانەش تەنیا ئەوەبوو کە کوڕێکیان لەئێران بوو. نزیکەی (٢٠)ڕۆژێکمان لەو گرتوخانە یە بەو شێوەیە بەسەربرد، بەڕێوەبەرو پاسەوانانی ئەو گرتوخانەیە تارادەیەک شارەزامان بوون و زانیان کە هەوڵی راکردن و هەڵاتن نادەین. ڕۆژێکیان پۆلیسێک هات و پاش ئەوەی موحازەرەیەکی لەبارەی چۆنێتی رەفتار کردن لەو گرتوخانەیە پێ گوتینەوە ئینجا کەمێک بەشان و باڵی ئێمەدا هەڵی داو پاشان دەی ترساندین دەیگوت: (ئاگاداربن کەس هەوڵی هەڵاتن نەدات، چونکە دەوروبەری ئەم گرتوخانەیە دەشتێکی کاکی بەکاکی وپان وبەرینەو هەزاران گورگ و سەگی هاری لێیە!) دواجار پێی گوتین: (ئەگەر ئاوا ڕێک و پێک بن، بەڵێنتان دەدەمێ کە لەمەودا بۆ ئەوەی بێ تاقەت نەبن بە ئیش کردنەوە سەرقاڵتان بکەین) ئێمەش لەخودامان دەویست، گەرەکمان بووکەمێک هەوای پاک هەڵمژین و بڕێک بجووڵێین هەر هیچ نەبێت هەوایەکی شانمان بدەین، ئەوە بوو پاش سێ ڕۆژ پاسەوانێک هات گوتی: (کێ دەیەوێت ئیش بکات؟) دەستبەجێ من وسالارو دووکەسی تر کە ئێستا لەیادم نەماون هەستاینە سەر پێ و ناونوسی کردین و ئیدی بەدوای پاسەوانەکەدا چووینە سەربانی گرتوخانەکە، پاسەوانەکە پێی گوتین: (ئەو سەربانە پاک بکەنەوە) بەر لەوەی دەست بەکاربین لەسەربانەوە تەماشای دەرەوبەرم کرد دەشتێکی پان وبەرین بوو، شەقامێکی سەرەکی خێرا لە تەنیشت گرتوخانەکەوە بوو کۆمەڵێ دارو دەرەخت بەقەراغ شەقامەکەوە روابوون، چەند خانوویەک لە ژووررا دیار بوو لە پشت خانووەکانەوە کۆمەڵێ دارخورما و زەلکاوێک لەدوورەوە بریسکەی دەهات، خانویەکی گەورەش نزیکەی (٥٠)مەتریک لەپشت گرتوخانەکەوە بوو حەوشەیەکی گەورەو (٢٠-٣٠) دار خورمای تێدابوو، لەنێوان ئەو خانووەو گرتوخانەکەدا دیوارێک هەبوو بە نزیکەی (٦)مەتر بەرزی، هەردوو دیوی دیوارەکە زۆنگاو بوو سەردیوارەکەش بەتەلی دڕکاوی تەلبەند کرابوو لەنێو ئەو ماڵەوە دەنگی قازو مراوی دەهات، ئەوەش یەکێک بوو لەو دەنگانەی کەلەمێژ بوو گوێبیستی نەبووم بۆیە تارادەیەک دڵنەوایی و ئاسوودەیی و ئارامی پێ دەبەخشیم، ئیدی هێندە تەماشای ئەمبەرو ئەوبەرم کرد پاسەوانەکە بەتوڕەییەوە هاواری کرد: (تەماشا

مەکە..ئیشی خۆت بکە!) بەهەر حاڵ زۆر بەگورج و گۆڵی دەست بەکاربووین جلەکانمان داکەند بۆ ئەوەی تۆزاوی نەبن،ئەو گورج و گۆڵیەشمان لەبەر جوڵەو چالاکی جەستەی خۆمان بوو،چونکە زۆر لەمێژبوو سڕ بووبووین، نزیکەی سێ سەعات بەردەوام کارمان کرد سەربانەکە رووبەرێکی فراوانی هەبوو،پاسەوانەکەش لێ نەدەگەڕا بچینە ئەو سەری سەربان وپاکی بکەینەوە،چونکە لەو سەرەوە حەوشەی بەشی ئافرەتانی گرتوخانەکە دیاربوو نەدەبوایە ئێمە چاومان لێی بێت، بەرلەوەی دەست لەکارکردن هەڵگرین، بەڕێوەبەری بەندیخانە هاتە سەربان بۆ بەسەرکردنەوەی ئیش وکارەکانمان سەرەتا سڵاوو ماندوونەبوونی لێ کردین، بەوردی تەماشای پشتی من و سالاری کرد،بەتایبەتی پشتی سالار کە ئاسەواری لێدان وکێبڵەکانی دائیرەی ئەمنی سلێمانی و تەواری چوارباخی زۆر بەئاشکرا پێوە دیار بوو، هەندێ موجامەلەی سالاری کرد، ئینجا فەرمانی دا بەپاسەوانەکە کە چووینە خوارەوە رێگەمان بدات پاک خۆمان بشۆین، بەرلەوەی بچێتە خوارەوە بەدەنگی بەرز بەپاسەوانەکانی خۆی گوت: (ئەوانەش مرۆڤن و عێراقین وەکو ئێمە، منداڵن و تووشی هەڵەبوون) بێگومان مەبەستی بوو ئێمە گوێمان لەو قسانە بێت!!.

بەڕێوەبەر بەجێی هێشتین و پاش نیو سەعات ئێمەش چووینەوە خوارەوە، پاک خۆمان شت وئەوشەوە زۆر باش حەواینەوە،بەڵام بەیانی هەمووجەستەمان ڕەق هەڵاتبوو، سەعات (١٠)ی بەیانی ئەبو بوشرا بانگی کردمەلاوەو گوتی:( ئیشێکم بەتۆ هەیە... ئەگەر جارێکی تر چوون بۆ پاککردنەوەی سەربان هەوڵ بدە بەنهێنی ئەم نامەیەم بۆ بدەیتە دەست دایکی بوشرا هەر لەسەربانەوە بانگ بکە بوشرا، ئیدی خۆی دێت و نامەکەی بۆ هەڵدە خوارەوە) ئەگەرچی کارێکی گەورەوترسناک بوو، بەڵام نامەکەم لێ وەرگرت.. پاش دەمێک هەمان پاسەوانی ڕۆژی پێشتر هاتەوە ناوی (ئەبو عەباس)بوو حەزی دەکرد من دیسان لەوەجبەی نوێی کارکردندا هەبم چونکە عەرەبیەکی باشم دەزانی، ئەمجارەیان من و عەلیە سوورو کارزانی برای شەهید داناو عومەری نوری بەگ وعومەر چاوشینی برد بۆ پاکککردنەوەی سەربان، ئیدی چووینە سەربان و نامەکەی ئەبو بوشرام، لەگیرفاندا بوو، زۆر دوو دڵ بووم ئاگام لەئیش وکار نەمابوو دەمویست هەر

چۆنێ بێت خۆم بگەیەنمە ئەو سەری سەربانەکەو نامەکە هەڵدەم بۆ بوشرا وردەوردە بەپاساوی پاککردنەوەی سەربان بەرەو ئەوسەرڕۆیشتم بەچاوێک تەماشای پێش خۆمم دەکردو بەچاوێک سەرنجم لەپاسەوانەکە دەدا،لەو ساتەدا پاسەوانەکە دانیشتبوو جگەرەی دەکێشا، وردە وردە بەدەم پاککردنەوەوە خۆم گەیاندە ئەو ئاستەی بەتەواوی چاوم لە حەوشەی هۆڵی ئافرەت ومنداڵە زیندانیەکان بوو، کە تەماشا دەکەم قەرەباڵەغی ئەو دیویش چی لەمدیو کەمتر نییە دیمەنی ئەو بەشەی گرتوخانەکە لەسەرەوە وەک گەرەکە میللیەکان وابوو کۆمەڵێ ئافرەت و منداڵ و کچی گەنج و هەرزەکاری تێدابوو، ئافرەتێک لەگۆشەیەکدا خەریک شوشتنی منداڵەکەی بوو هەندێکی تر کۆمەڵ کۆمەڵ دانیشتبوون تەنیا دوو کچی گەنج لەدەوروبەری تەمەنی (١٧-١٨)ساڵ لەنێو ئافرەتەکاندا سەرنجیان ڕاکێشام، بەمەزەندەی عەقڵی خۆم وبەپێی ئەو وەسفەی ئەبو بوشرا بۆی کردم دەمگوت ڕەنگە یەکێک لەمانە بوشرا بێت، ئاوڕێکم بۆ پاسەوانەکە دایەوە بۆ ئەوەی بزانم ئاگای لەمنە یان نا کەچی لەو کاتەدا پاسەوان سەیری خوارەوەی گرتوخانەی کردو هاواری کرد: (گسک بێنن..گسک بێنن) منیش ئەوەم بەهەلێکی باش زانی و بەهێواش دووجار لەسەر یەک بانگم کرد: (بوشرا.. بوشرا) لەو سەری حەوشەکەوە کچێکی زۆر جوان و قەشەنگ ماکسیەکی پەمەیی لەبەرابوو، تەنیا یەک تاکە نەعلی لەپێدا بوو، بەراکردن هاتە بن سەربانەکەوە کە هاتە پێشەوە زیاتر بەجوانیەکەی ئاشنابووم، کچێکی خان و مان و سپی و ناسک جووتێ چاوی گەورەو کاڵ ومەنگ سەرپۆشێکی کوردەواری کراوەی دابوو بەسەریدا، پرچێکی ڕەش قەترانی درێژ لەژێر سەرپۆشەکەیەوە هاتبووە دەرەوە، ئیدی ئەو جوانیەی لەو کچەدا بەدیم کرد، ئێستاو ئەوسا نەم دیوەو نەهاتۆتەوە بەرچاوم تەمەنی دەوروبەری (١٨) ساڵێک دەبوو،ئافرەتەکانی تر هەموو تەماشایان دەکردم، بوشرا لەخوارەوە بەشێوەزاری خانەقینی گوتی: (چەس!!) منیش نامە پێچراوەکەم بۆ هەڵدایە خوارەوە گوتم: (ئەوە باوکت بۆی ناردویت) بوشرا نامەکەی هەڵ گرتەوە بەزەردە خەنەیەکەوە بەئاماژە سوپاسی کردم، منیش بەدەست سلاوم سەندەوە، هەر کەسەرم هەڵبڕیەوە بۆ ئەودیو پاسەوانەکە دیاربوو هەستی کرد بۆیە بەراکردن بەرەو رووم هات و دەشی گوت:( وەرە

وره ئەوە قسەت لەگەڵ کێ کرد؟!) منیش بۆ ئەوەی سەری لێ تێک بدەم ئاماژەم بۆ منداڵێک کردو گوتم: ( لەگەڵ ئەو منداڵە بچکۆلە جوانەی ئەو ماڵەدا) پاسەوانەکە بڕواڵ کردو بە پێکەنینەوە گوتی: ( ئەوە ماڵی کێیە؟) گوتم:( نازانم بەڵام ئەو منداڵەیان زۆر جوانە!!)ئینجا پێی گوتم: ( کوڕی خۆم ئەوە ماڵ نییە، ئەوانە خێزانی ئەو زیندانیە پیاوانەی ئێرەن، بەڵام قسەیان لەگەڵ مەکە چونکە قەدەغەیە) ئیدی ئەو تەوقەمان شکاندو بەکەماڵی ئیسراحەت سەربانی هۆڵی ئافرەتانیشمان پاککردەوە و بە ئارەزووی خۆمان تەماشای ئەودیومان دەکرد، وردە وردە پاسەوانەکە لەگەڵماندا رادەهات تەنانەت عەلی جگەرەیەکی پێشکەش کردو دەستی کرد بەسوعبەت کردن لەگەڵیدا، منیش بە پاسەوانەکەم گوت: (زیندانیەکانی ئێمە زۆر لێت رازین دەڵێن کوڕێکی باشە) ئاگام لێ بوو بوشرا هەرسەیری منی دەکرد، دەمزانی وەڵامی نامەکەی پێیەو دەیەوێ بمداتێ عەلیش هەستی بەوە کرد، بۆیە بە پاسەوانەکەی گوت: (ئەو کچە زۆر گوناحە بزانە چی دەوێت بەقسەی بکە) پاسەوانەکە گوتی: ( دەیناسم ئەوە باوکیشی لەم دیو زیندانیە) بوشرا بەپاسەوانەکەی گوت:( باوکم لەو دیوە بەڵکو ئەو نامەیەی بدەیتێ) پاسەوان حەزی دەکرد وەری بگرێت، بەڵام نەیدەوێرا بۆیە لەو لاوە بە بوشرام گوت:( بێنە.. بێن... نامەکەی دەدەمێ) ئیدی نامەکەی هەڵداو خستمە گیرفانەوە، پاسەوانەکە دوودڵ بوو دەترسا، بەمنی گوت: (خۆ برادەرەکانت شکاتم لێ ناکەن؟!) گوتم: (نانا هەرگیز لە ئێمە مەترسە، چونکە خۆمان لەسەر شکاتی خەڵک گیراوین) نامەکەم گەیاندو ئەوشەوە لەخەمی ئەو خێزانانە خەوم لێ نەکەوت، بیرم لەبوشرا دەکردەوە،بەراستی خۆشم ویست لەدڵی خۆمدا دەمگوت: (خوایە گیان ئەو کچە جوانە تاوانی چییە وا کەوتۆتە نێو ئەم سەگ و گورگانەوە؟!) هەندێ جار خەیاڵاتی سەیرو پێکەنیناوی و دوور لەواقیعم بۆ دەهات، خەیاڵ پڵاوی ئەوەم دەکردەوە کە وەک کوڕە ئازاو قارەمانەکانی نێو فیلمە سینەماییەکان، رۆژێک لەملی یەکەیەکەی پاسەوانەکان بدەم و لەسەربانەوە خۆم هەڵدەمە ئەودیوو بوشراو ئەندامانی خێزانی بوشرا بە ئوتۆمبیلێک لەو گرتوخانەیە رزگار بکەم، بۆ ئەوکاتەی من ئەم خەیاڵە خۆشا نە بەشێک بوو لەو ئاسوودەیی وکامەرانیە کاتیانەی کە جار ناجارێ

لەدەرگای مێشکی دەدام، بەهەر حاڵ نزیکەی (٢٥)ڕۆژێک دەبوو لەو گرتوخانەیەدا بووین، جارێکی دی ئەو پیاوە پیرەی یەکەم ڕۆژ خواردنی بۆ کڕین هاتەوەلامان، وەک زیندانیەکان باسیان دەکرد،پێشتر کوڕی ئەو پیاوە پیرە بەرپرسێکی باڵا بووە لە ئەنجوومەنی نیشتمانی عێراق، بەڵام دوایی لەلایەن حکومەتەوە لێ دراوەو ئیدی ئەم باوکە بەتەمەنەش دەستی بەسەراگیراوە، بەڵێ ئەو ڕۆژەش ئەو پیاوە دڵسۆزی و مرۆیی خۆی سەلماندەوەو بڕی (١٠٠)دیناری دا بەیەکێک لەزیندانیەکانی ژووری ئێمەو گوتی ئەگەر پاسەوانی حانوتەکە هات ئەو پارەیەی بدەنێ با سابون و تایت و گوێزان و پێداویستی ترتان بۆ بهێنێ، هەر هەمان ڕۆژ پارەکەمان ناردو پێویستیەکانمان بۆ هات، دوو ڕۆژ دوای ئەوە بەڕێوەبەری گرتوخانەکە هات و لێمان توورە بوو دەیگوت: (دەبێ پێم بڵێن کێ ئەو پارەیەی داوە بەئێوە) یەکێک لەزیندانیەکان کە هەندێ لەپارەکەی حاجی لامابوو،دەستی کرد بەگیرفانیاو بڕێک پارەی دەرهێنا گوتی: (ئێمە لە بەندیخانەی ئەمنی سلێمانی هەمیشە کەس و کارمان سەردانیان دەکردین و پارەشیان بۆ دەهێناین ئەوەتا ئێستاش پێمان ماوە).

## پزیشکێک خۆی کوشت

کات مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٥ بوو، بەیانیەک زوو دەوروبەری سەعات (٧) دەرگای ژورەکەمان کرابۆوە، هێشتا هەندێکمان لەخەو هەڵنەستابووین ئەوەندەمان زانی هاتو هاوارو دەنگە دەنگ و ڕاکە ڕاکی زیندانیەکان بەرەو لای حەمامەکە رایچڵەکاندین، ئێمەش هەموو بەرەو حەمامەکە چووین، سێ چوار کەس خۆیان دەدا بەدەرگای حەمامەکەدا دەیانویست بیشکێنن دەرگا شکاو چوونە ناو حەمامەکەوە وەختێکم زانی لاشەی پیاوێکی قژزی تەمەن (٤٢)ساڵیان دەرهێنا، بیجامەیەکی خەت خەت و فانیلەیەکی سپی لەبەردابوو، هەمووگیانی خوێن بوو، خوێن لەدەم و لوتیەوە وەک بەلوعە فیچقەی دەکرد، بەڵێ ئەو پیاوە ئەوبەیانیە خۆی کوشتبوو،بەڵام چۆن و بۆچی؟ ئەم پیاوە کێ بوو؟ وەڵامی ئەم پرسیارانەمان دوایی بۆ ڕوون بۆوە... ئەو پیاوە پزیشکێکی بەناوبانگی هەناوبوو،کوڕی یەکێک لەخێزانە دەوڵەمەندەکانی شاری بەغدا بوو، بەڵام بەر لە سێ ساڵ

یەکێک لەبراکانی ڕۆیشتبووە ئێران ئیدی حکومەتی بەعسیش ئەم پزیشکەو برایەکی دیکەی گرتبوو سێ ساڵی ڕێک بوو ئەم دووبرایە لەم گرتوخانەیە دا دەستیان بەسەراگیرابوو ، بەبێ ئەوەی کەس لێیان بپرسێ و لێکۆڵینەوەیەکیان لەگەڵ بکەن،ئیدی نزیکەی ساڵێک بوو ئەم پزیشکە لەخەم و حەسرەت و خەفەتدا تووشی خەمۆکییەکی وەها بوو بوو قسەی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەدەکرد، بەڵام شەوی رابردوو لای براکەی گوتبووی سبەی خۆم دەکوژم، بۆیە ئەو بەیانیە خەمۆکی گەیشتە لوتکەو لەنێو ئەو حەمامەدا (٤-٥) پارچە گوێزانی بەساغی قوت دابوو، ئیدی خوێنبژانێکی وای گرت تاوەکو هەناسەی لەبەربڕابوو،براکەی هەردەگریا بەسەریا و لەخۆی دەدا، دیمەنی ئەو دوو برایەی بەندیخانەی تەواری چوار باخم وەبیرهاتەوە ئاسۆو ئازاد ئەوشەوەی ئاسۆ مرد و ئازادی برای دەگریا بەسەریا، بەهەر حاڵ پاسەوانەکان هاتن و تەرمی ئەو پزیشکەیان لەبەتانیەکەوە پێچاو بردیان براکەشی هەر دەگریاو لەخۆی دەدا، دوای خۆکوشتنی ئەو پزیشکە بێ ئومێدی و رەشبینی وخەمۆکی باڵی بەسەر هەموو زیندانیەکاندا کێشا، براکەی بەهیچ ژێر نەدەبۆوە لەو حەلەدا بەڕێوەبەری گرتوخانە هاتەوە ناو هۆڵەکەو باسی ئەو پزیشکەی بۆکردین دەیگوت:( حەق نەبوو وابکات، ئەوە زیانی لەخۆی دا) هەمان ڕۆژ دەوروبەری سەعات (٤)ی عەسر پاسەوانەکان هاتن ئێمەیان بەپەلە کردەوە ژوورەکەی خۆمان و دەرگایان لێ داخستین، توومەس لیژنەی لێکۆڵینەوە بەتایبەتی لە دائیرەی ئەمنی گشتییەوە هاتوون ولەبارەی ڕووداوی خۆکوشتنی ئەو پزیشکە لێکۆڵینەوەیان ئەنجام دەدا، تاقمێک بەشەق دەرگاکەی ئێمەیان کردەوەو بەرپرسەکەیان هاواری کرد:(کێ خۆی دەکوژێ باخۆی بکوژێت، هەردوو چاوی دەربێت و ملی بشکێ، ئەوە گرفتی ئێمەنیە، ئێمە تەنها ئەوەمان لەسەرە بینێژین) ئیدی وردە وردە لەو هات وهاوارە هێمن بۆوەو زمانی قسەکردنی نەرم تر کردو گوتی: (براینە لەم ماوەیەدا بڕیاری لێبووردنی گشتی بەڕێوەیەو پشت بەخوداکەستان لێرە نامێنن، ئیتر ئەو گرفت و کێشەیە بۆ دروست دەکەن؟!)پاشان ڕووی کردە بەڕێوەبەری گرتوخانەو گوتی: ( دەرگا لەم زیندانیانە دەکەنەوە؟!)بەڕێوەبەر بەترسەوە گوتی: ( گەورەم تەنیا بۆ ئاودەست وحەمام) پاشان داوایان کرد کە ڕێگە بدرێت

کەس و کارمان بێنە دیدەنیمان ، بەڵام پێی گوتین: ( ناتوانین، دیدەنی بۆ ئێوە قەدەغەیە چونکە ئێوە تاقمی تەق و تۆق وگێرە شێوێنەکانن با دادگایی بکرێن وحوکم بدرێن،ئەوکات ئیدی دەرگای سەردان و دیدەنی بۆ کەس وکارتان دەکرێتەوە). دوای ئەو ڕووداوە بەچەند ڕۆژێک بەهۆی خزمێکی ئەبو بوشرا و ئەبو عیسامەوە بە نهێنی نامەیەکم نارد بۆ باوکم لە سلێمانی و بۆم نووسیبوو کە ئاگاداری کەس و کاری زیندانیەکانی تریش بکاتەوە کە ئێمە لەگرتوخانەی فزەیلیەین، هەر دوو ڕۆژ دوای ئەوە دایکم وباوکم و قەیسی برام گەیشتبوونە بەردەرگای گرتوخانەکە، بەداخەوە هەرچەندە زۆرم بیر دەکردن،بەڵام بوار نەرەخسا بیانبینم، بۆ هاتنیشیان بەهۆی پیاوێکی بەسڕاوی کەناوی لەفتە بوو زانیم، لەفتە زیندانی بوو، بەڵام ڕۆژانە زبڵیان پێ فڕێ دەدایە دەرەوەی گرتوخانەکە ئیدی ئەویش دایکم وباوکم و قەیسی برامی لەبەردەرگا دیبوو کۆمەڵێ جل وبەرگ و پێداویستی وپارەیان بۆ هێنابووم لێی وەرگرتبوون و بۆی هێنام. لەکۆتایی مانگی تشرینی دووەمدا ڕۆژ وردە وردە کورت دەبۆوە، ڕۆژێکیان ئێمە لەژوورەکەدا بووین لەپڕێکدا قیژەو گریان و هاوار هاواری زیندانیەکان رایچڵەکاندین، لەپەنجەرەکەوە تەماشامان کرد وا زیندانیەکان هەموو جنێو بەپاسەوانەکان دەدەن ، ئیدی هۆسەو دەنگە دەنگێک بوو کەس کەسی لێ دیارنەبوو یەکێک لەزیندانییە دەستبەسەرا گیراوەکان هاتە لای پەنجەرەکەوەو پێی گوتین: (لەنێو بەندیخانەی ئافرەتاندا بوتڵە غازێک گڕی گرتووە) لەو کاتەدا هەر خەمی بوشرام بوو، بەدەست خۆم نەبوو لەو ڕۆژەی نامەکەی باوکیم دایە لەسەربانەوە، ئیدی سۆزو خۆشەویستی ئەو کچە لەدڵما دروست بوو بوو دەتگوت لەهەموو ژیانمدا ئافرەتم نەدیوە بوشرانەبێ، زۆرجار لەبەرخۆمەوە دەمگوت:( خۆزگە حکومەت رازی بوایە، لەجیاتی بوشرا منی زیندانی بکردایە، دەمگوت ئەگەر ( ١٠ )ساڵیش مەحکوم بێ چش لەو ( ١٠ )ساڵەو من دەچمە زیندانەوە با بوشرا ئازاد بکەن) بێگومان ئەم خەیاڵ پڵاویەم لەکاتێکدا بوو، کە هێشتا چارەنووسی خۆم دیارنەبوو نەمدەزانی ئاخۆ ئیعدام دەکرێم، دەمێنمەوەیان ئازاد دەکرێم، ئیدی ئەمە حەزو خەونێکی هەرزەکاری بوو چوزانم بۆ خۆم ( ١٠ ) ساڵ زیاتر زیندانی لەناوچەوانم نووسراوە،مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٥ کەشوهەوا هێدی هێدی

بەرەو ســاردی دەرۆیشت، بەتانی زیادەیان بەســەردا دابەش کــردین،بەڵام ژوورەکەی ئێمە لەبەر قەرەباڵغی و بچووکی هێشتا گەرم بوو لەسەرەتای ئەو مــانگەدا بووین، لەپڕ دەرگــای هۆڵی گــەورە کرایەوەو (١٠٠)نەفــەریان کرد بەژووردا ئەوانە زیندانی نوێ بوون، دیاربوو هەمــوویان لێــیــان درابوو جل و بەرگــیان شل و شێواوبوو ئەو (١٠٠)زیندانیە نوێیە هەر هەمــوویان عــەرەب بوون،بەڵام هیــچــیــان عــێــراقی نەبوون، بەڵکو پێکهــاتبــوون لە (میسری و ئوردونی و سودانی) پاسەوانەکە پێی گوتن: (جێگەی خۆتان لەم هۆڵەدا بکەنەوە، بەڵام نەچنە ئەو ژوورەوە تێکەڵی ئەو ســیــاســیــانە نەبن) مەبەستی ئێمە بوو.

ئەو عــەرەبانە زۆربەیان بەتۆمــەتی دزی و کــڕین وفــرۆشــتنی مــادە بیــهۆشکەرەکان گیرابوون،بەڵام هەموویان سوێندیان دەخوارد کەشتی وایان نەکردووە. دوو ئوردونی تێدابوو شوفێری لۆری بوون تاوانی قاچاخچێتیان درابووە پاڵ، ئیــــدی ڕۆژ هات و ڕۆی وردەوردە تێــکەڵیــــان بــووین، دەمانویست باسی کێشەی کوردو بزاڤی ئازادیخوازی خەڵکی کوردستان و شۆڕشەکەیان تێ بگەیەنین،بێگومان ئەوەشمان بەبەشێک لەخەباتی خۆمان دەزانی، بۆمــان دەرکــەوت چەند کــەســێک لەمــیــســرییــەکــان کــاتی خــۆی لەکوردستــان ژیابوون، زۆربەیان کەباسی سیاسەتمان بۆدەکردن:( دەیانگوت ڕەنگە ئێــوە ســەر بە شــۆڕشی مــەلا مــســتــەفــا بارزانی بن) یەکــێک لە میــســرییــەکــان ناوی مــوحــسین بوو خــەڵکی ئەسکەندەرییــەبوو، کــوڕێکی ڕۆشنبیــرو ئاگادار بوو لەبواری ســیــاســەتدا، تەنانەت ئاگاداری وردەکــاری شــۆڕشی ئەیلول و ڕێکەوتننامــەی (١١)ی ئاداری ســاڵی ١٩٧٠ بوو لەو مێژووەدا زۆر شارەزا بوو، بەڵام لەو مێژووە بەدواوە زۆر شــارەزا نەبوو بۆیە پتــر لەجــارێک دەیپــرسی: (باشــە بۆچی شــۆڕشتــان بەردەوامــە؟ خۆ ئێــوە حوکــمی زاتیــتــان وەرگــرتووە. ئەوەتا ســەرۆکی عــێــراقی شــەوانە بەجلی کــوردیەوە دێتــە ســەر تەلەفــزیۆن!!) دەمــزانی مــوحــسین گــەنجێــکی بێ ئاگــا نییە، بۆیە ئەو ماوەیە زۆر لێی نزیک بوومەوەو بەتەواوەتی بۆم ڕون کردەوە کــە بۆچی شــۆڕشی گــولانی ئازادیخــواز بەرپا بووەو هەمــوو ئەو زوڵم و ستەمەی ڕژێمی عێراقیم بۆ شیکردەوە کە دژ بەخەڵکی کوردستان ئەنجامی دەدا،موحسین یەکێک بوو لەوانەی کە بە سەرکردە مێژوویەکانی شۆڕشە

ئازادیخوازەکانی دونیا سەرسام بوو وەکو ئێمە بارزانیی نەمری خۆش دەویست بۆیە هەمیشە گوێی لێ دەگرتم دەیویست شتی زیاتر بزانێت و پتر راستیەکانی بۆ روون بێتەوە. بەهەر حاڵ رۆژی ١٥/١٢/١٩٨٥ بوو، بەیانی زوو پۆلیسێکی پاسەوان دەرگای هۆڵە گەورەکەی کردەوەو گوتی زیندانیە سیاسیەکانی ئەمن بچنەوە ژووری خۆیان زۆر بەپەلە، ئیدی هەریەکەمان پرسیارێکی لا دروست بوو،نەماندەزانی بەم بەیانییە زووەو بەم کاتی نانخواردنە ئەم بڕیارە چی بوو!! چوینە ژوورەوەو دەقیقەیەک چاوەڕێمان کرد، وەختێکمان زانی پیاوانی دائیرەی ئەمنی سلێمانی خۆیان کرد بەژوورا (مولازم ئەحمەد، مفەوەز مەحمود، نەقیب چەلوب، مفەوەز عەلا کە بە پیاوێکی خوێنرێژو تاوانباری دژ بەکورد ناسراو بوو). ئای لەودەم وچاوو روخسارە قێزەونانە هەموو لێدان و ئەشکەنجە وئازاری رۆژانی بەندیخانەکانی دائیرەی تەواری چوارباخ وئەمنی سلێمانیان بیرخستینەوە، بەتایبەتی بۆ من کە دوو بیرەوەری یەکجار تاڵ و دزێوم لەگەڵ دووانیاندا هەبوو، مفەوەز عەلا ئەوەی بەیانی زوو لەماڵەوە منی هێنایە دەرێ و گرتمی، مفەوەز مەحمودیش ئەو جەلادەی کە دەیان کێبلی بەپشتی من وسالاری برادەرمدا دا، دەمزانی هەموو زیندانیەکان وەک من هەست دەکەن، دەمزانی لەدڵی خۆیاندا دەڵێن: ( ئەرەوەڵا دووبارە لێدان ولێکۆڵینەوەو بەزۆر ئیعتیراف کردن دەستی پی کردەوە!!) لەمێژبوو لەوسەرو فەسالانە دووربووین و خەم و ئازارمان بیرچووبۆوە، بەڕاستی میوانێکی رەزا قورس وچارەڕەش بوون هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبووم جارێکی دی چاوم بەچارەیان بکەوێتەوە، هەموویان هەروەکو جاران گرژو مۆن وتوڕەبوون، تەنیا مولازم ئەحمەد زەردە خەنەیەک لەروخساریدا بوو، مفەوەز مەحمود وازی لەقسە رەق و بێ مەعناوتانەو تەشەرەکانی نەهێنابوو بەر لەهەموو شت تەماشایەکی عەلیە سووری کردو پێی گوت: (ئەوە هێشتا نەمردوویت.. حەز دەکەیت لەسێدارەت بدەین؟!) هەندێکمان لەوباوەڕەدا بووین کە ئازاد بکرێین!! بەهەر حاڵ لیستێکیان دەرهێناو پەنجا ناویان خوێندەوە من وسالاری تێدانەبووین، من هەمیشە لەخەمی ئەوەدابووم کە سالارم لێ جیابکەنەوە باش بووئەو بەیانیەش رووی نەدا ،ئەو ( ٥٠ ) زیندانیەیان کەلەبچە کردو بە ئۆتۆمبیل بردیانن، بەوشێوەیە لەو ( ١٠٠ )

کەسەی سلێمانی (٥٠) کەسمان لەگرتوخانەی فزەیلیە ماینەوە تەنانەت بواریان نەدا خواحافیزی و ماڵئاوایشیان لێ بکەین لەوە بەدواوە ماتەمینی گرتینی هەرچەندە بەندیخانە بوو، بەڵام ئەوچەند مانگە دەیان بیرەوەری شیرینمان پێکەوە هەبوو، هەموو وەک برامان لێ هاتبوو ئاخر پیرۆزترین هاوڕێیەتی و هەڤاڵێتی لەو ڕۆژە سەخت و ناخۆشانەدا دروست دەبێت، قسەی خۆش ونوکتە بەچێژەکانی ڕۆژانی رابردوومان نەما، هەر بیرمان لەچارەنووسی ئەو هەڤاڵانەمان دەکردەوە بۆ بەدبەختیمان ئەو ڕۆژە سالار لەهەموو کاتێ ماندووتر بوو زۆر نەخۆش بوو سەرما لێی دابوو گورچیلەی ئازارێکی زۆری هەبوو، قورگی هاتبووەوە یەک هەموو ئازای دەیناڵاند ئەوکورە قارەمانەم وەک هەڵۆیەکی باڵشکاو و بریندار دەهاتە پێش چاو، ئەو سالارەی کە سەدان کێبڵ و دەیان شەوی ئەشکەنجەوئازاری نێو ژوورە تاکە کەسیەکانی ئەو بەندیخانانە تاقە وشەیەکی بێ نەدرکاند،چووم بەنێو زیندانیەکانی تردا گەڕام بۆ ئەوەی حەبێکی ئازار بۆ سالار پەیدا بکەم زۆر گەڕام دەستم نەکەوت تا بەپاسەوانەکانم گوت و دەنکێ حەبی پاراستیۆلیان بۆ هێنا، ئەبو بوشرا هاتە لامان و سەری سالاری خستە سەر ڕانی خۆی وەک باوکێکی دڵسۆز قورگی دەشێلا، سالاریش لەتاو ئازار فرمێسک بەچاویدا دەهاتە خوارێ،بەڵام خوانەکات ئاخ و ئۆفی لەزار بێتەدەر، ئەوشەوە هەتا وەکو سەعات (٥ر٢)ی دوای نیوەشەو بەدیار سالارەوە دانیشتم دڵم نەدەهات بخەوم... بۆ بەیانی ١٦/١٢/١٩٨٥ هەمان تاقمەکەی ئەمنی سلێمانی بەبێ نەقیب چەلوب هاتنەوەو ناوی سێ کەسیان خوێندەوە ئەوانش (سالار و فەرەیدوون و فەرهاد دووبرا جمکەکە) بوون، ئەمە ئەو ڕۆژە بوو لێی دەترسام دواجار سالاریان لێ جیاکردمەوەو ئەو خەمە گەورەیە شیان خستە سەر خەرواری ئازارەکانی ئەو ڕۆژە ڕەشانە، سالارحسابی بۆ کەس نەکرد، پێش ئەوەی کەلەبچەی بکەن توند باوەشی پێداکردم، ئامێزی لەگەرمیدا وەک ئامێزی باوکم وابوو،ئێستاش ئەو بەیانیەم لەبیرە سالار نەخۆش و لاواز و بێ هێز جامانەکەی ئەبو بوشرای لەملدابوو لەبەر ئازاری قورگی، ئێستاش لەیادمە ئەوبەیانیە لەبەر چاوی ئەمنەکاندا پێی گوتم: ( شێرە گیان ئەگەر بەربووم دەچمە ماڵتان وهەواڵی تۆیان دەدەمێ، بەڵام هەرگیز باوەڕ ناکەم من ئازاد بکرێم، ڕەنگە تۆ

جارێکی تر دەرەوەی بەندیخانە ببینی،بەڵام من نە،) منیش لەبەرگریان یەک ووشەم بۆنەگوترا.گریام.. گریام ئەو ڕۆژە بەقەد هەموو ڕۆژانی تەمەنم گریام، لەو ڕۆژەدا تەنیا دوکەڵی جگەرەو دڵنەواییەکانی ئەبو بوشرا هاوڕێم بوون،سالاریان کەلەپچەکردو بردیان نەمزانی بۆ کوێی دەبەن، لەو ساتانەی کە سالار بەدەست ئەمنەکانەوە بوو ئاوڕی بۆ دەدامەوە، سیناریۆیەکی بەپەلەی هەموو ڕۆژە خۆش و ناخۆشەکانی ڕۆژانی هاوڕێیەتیمانم هاتەوە یاد.. هەموو دیمەنەکانم لەبەرچابوو شەوە تاریکەکانی گەڕەک و کۆڵانەکانی سلێمانی سالار کۆبوونەوەی حزبی پێ دەکردین، ڕاکەڕاک و دیوار نووسین وهەڵمەت و هەڵپەی شەوانی دەوروبەری قوتابخانە، ئازایەتیەکانی ناو خۆپیشاندانەکانی سلێمانی، ڕۆژانی پێشمەرگایەتی لەچاڵە خەزێنە، دانیشتنە نهێنیەکانی ناو سینەماکان.. ئەو ڕۆژانەی بەشەرواڵ و کراسە بۆیاخاویەکەیەوە لەسەر ئیشەوە دەهاتەلام بۆ دوکانەکەی شەقامی مەولەوی، ئەو ڕۆژەی لەبەرچاوی جەلادەکاندا کاڵەکەکەی دا بەدەم وچاوی(لەتیف)ی خائیندا، بێ دەنگی و خۆراگری لەئاست کێبڵ لێدانی جەلادانداا... خۆشەویستی دڵسۆزی هەموونەم دیمەنانەم ئێستاش لەبەرچاو ون نابێ.. ئیدی چۆن سالارم لەبیرچێتەوە، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە لەخوای خۆم دەپرسی: ( خوایەگیان دەبێ چی لەسالار بکەن وچارەنووسی بەکوێ بگات؟!!) ئەو شەوەشم بەگریان بەسەر بردو بۆ سبەی ١٩٨٥/١٢/١٧ سێ کەس لە دائیرەی ئەمنی گشتیەوە هاتن و من و عەبدوڵڵا حیکمەت و کامەران محەمەدیان کەلەپچە کردو بردیانینە گۆڕەپانی گرتوخانەکە، بەرلەوەی سواری ئۆتۆمبیلێکی لاندگرۆزەرمان کەن،یەکێک لەپیاوانی ئەمن فایلێکی دەرهێناو گوتی: (کامەران وعەبدوڵڵا بابگەڕێنەوە تەنیا شێرزاد سەربخەن) خستیانمە لاندگرۆزەرێکەوە، شوفێرەکەو یەکێکیان لەپێشەوە دانیشتن و یەکێکیش لە ئەمنەکان لەتەنیشتمەوە دانیشت و کەوتەڕێ بەرەو ناوشاری بەغدا، سەرەتا ویستیان چاوم ببەستنەوە،بەڵام ئەوەی پێشەوە گوتی: (نا با بەنا گوناحە باکەمێک دنیا ببینێ) کاسێتێکی گۆرانی بێژی عێراقی (یاس خدر) یان خستە سەر ریکۆردەکەو بە ڕێگایەکی دووردرێژدا کەئەمبەرو ئەوبەری بەدارخورما پەرژین کرابوو دەڕۆیشتین، گەیشتینە ناو

شاری بەغدا خەیاڵم رۆیشتبوو سەیری دیمەنەکانی ئەو شارەم دەکرد،ئەوسێ ئەمنەش کە لەگەڵما بوون چەند گەنجێکی هەرزەکار بوون،بە نێو شەقامەکانی بەغدادا هەر کچێکی جوانیان ببینیایە هۆرنیان بۆ لێ دەداو تانەو تەشەری منداڵانەیان تێ دەگرت!! ئەوەی تەنیشتم جار ناجارێ سەیرێکی دەکردم و دەیگوت: (باشە تۆ چیت کردووە،بۆ ئەوەندە بێ عەقڵی چۆن ئەم دنیا خۆشە لەکیس خۆت دەدەیت؟!).

ئۆتۆمبیلەکە چووە ناو بازاڕێکەوەو لای چێشتخانەیەکەوە راوەستا، یەکێک لە ئەمنەکان گوتی: (با ئەم خێرەش بکەین، هەرچەندە لەژیانماندا خێرمان نەکردووە!) وردە وردە ئەمنەکەی تەنیشتم زمانی خۆش دەبوو لەگەڵماو سوعبەتی لەگەڵ دەکردم،سەعات (٥ر٨)بەیانی بوو دەوروبەری چێشتخانەکە زۆر قەرەباڵغ بوو،منیش بیجامەیەک وکراسێکم لەبەرابوو لەگەڵ جووتێ نەعلی لاستیک لەپێمدا، خاولیەکی چلکنیشم لەملی خۆم ئاڵاندبوو. دوانەکەی پێشەوە دابەزین و نەفەرێک کەبابیان بۆهێنام و کەلەبچەکەی دەستمیان کردەوەو لەگەڵ ئەوەی تەنیشم دەستم کرد بەنان خواردن، ئای کە تامی ئەوکەبابە خۆشبوو، لەکاتی نان خواردندا ئەمنەکە پێی گوتم: (ئەگەر ئێستا ئازادت کەم بۆ کوێ رادەکەیت؟) وەڵامم نەدایەوە،ئینجا هەر خۆی گوتی: (دیارە دەزانی من سوعبەتت لەگەڵ دەکەم، بەڵام پشت بەخودا بەردەبی) دوایی ئامۆژگاری کردم وگوتی: (ئێمە ئێستا دەتبەین بۆ دادگا، بەڵام بایەک نەهێنیت پێ بڵێم و بەینی خۆمان بێت، ئەگەر دادوەر ترسانیتی و فشاری خستە سەرت و داوای لێ کردی ئیعتیراف کەیت لەسەر تاوانێک، تۆ هەر بڵێ هیچم نەکردووە، نەکەی خۆت بخەیتە ژێر باری هیچ تاوانێکەوە ها... بۆ ئەوەی حوکمەکەت سووک بێت) بەراستی قسەکانی دڵسۆزی پێوە دیاربوو بۆیە کەمێک ئاسوودەیی پێ بەخشیم، ئینجا چووە خوارەوەو بیبسیەکیشی بۆ هێنام و خواردمەوە و پاشان جگەرەیەکی ریمی پێشکەش کردم، هەستم کرد زۆر رێزم دەگرێت، بۆیە داوام لێ کرد رێگەم بدات بچمە ئاودەستی چێشتخانەکە، پاش مشتومڕێک لەنێوان خۆیاندا هەر بەهەمان جل و بەرگەوە چوومە ناو چێشتخانەکە سەرنجم لە دانیشتوان دا، یەک دوو خێزان دانیشتبوون ئاگام لێ بوو لەژێرەوە بەوردی سەرنجیان دەدام، پاشان سواری ئۆتۆمبیلەکەیان

کردمەوەو بەر لەوەی بکەوێتە ڕێ ئەوەی تەنیشتم گوتی: ( براینە گوناحە بارێگەی بدەین جگەرەیەکی تر بکێشێ..) ئیدی خوا هەڵناگرێ ئەو جگەرەیەشم کێشاو نزیکەی نیو سەعاتێک پیاسەی ناوشاری بەغداشیان پێ کردم، ئینجا ئۆتۆمبیلەکە خۆی کرد بەگۆڕەپانێکی گەورەدا لە ناوەڕاستی ئەو گۆڕەپانەدا باڵەخانەیەکی بەرز هەبوو، ئەو بینایە دادگای شۆڕش بوو!.

## چۆن دادگایی کرام؟!

لە ئۆتۆمبێلەکە دایانبەزاندم و بردیانمە ناو بینایەی دادگاوە، لەپرسگە یەکێک لەو ئەمنانەی لەگەڵمدا بوون، کەلەبچەکەی کردمەوەو دۆسیەکەی منی دایە دەست کارمەندی پرسگەو ئەویش پسوولەی وەرگرتنی داینێ و هەرسێکیان ماڵئاواییەکی گەرمیان لێ کردم، ئەوەی پێشتر لەئۆتۆمبیلە لاندگرۆزەرەکەدا لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو گەڕایەوە بۆ لام و خۆی پێ ناساندم گوتی: (من ناوم عادلە حەز دەکەم ئەو پاکەتە جگەرەیشم بدەم بە تۆ ) منیش لێم وەرگرت و سوپاسم کرد، هەستم کرد عادل سۆزێکی تایبەتی بەرامبەر من پەیدا کرد، چونکە لە ئۆتۆمبیلەکەشدا هەر ئامۆژگاری دەکردم کە خۆراگربم و لەدادگادا دان بەهیچ لەو تاوانانەدا نەنێم کە درابووە پاڵم، هەر لەگەڵ ڕۆیشتنی ئەواندا پاسەوانانی پرسگە بەشەق و زللە تێم کەوتن و پاکەتە جگەرەکەیان لێ سەندم و دووبارە هەردوو دەستمیان لەدواوە کەلەبچە کردەوە، ئینجا ڕایانکێشام بە پێپلیکانەیەکدا بۆ خوارەوە وکرام بەهۆڵێکدا، ئەو هۆڵە کە ژووری چاوەڕوانی دادگابوو، لەعیادەی پزیشک دەچوو چەند ڕەحلەیەکی قوتابخانەی تێدابوو نزیکەی (١٢)کچی عەرەبی جوانکیلە و منداڵکاری سەرپۆشبەسەر کەسەراپا جلی ڕەشیان لەبەردابوو دانیشتبوون، چەند گەنجێکی کوردیش لەسەر ڕەحلەکان دانیشتبوون دوانیانم ناسیەوە چونکە لەتەواری چوارباخ لەگەڵمابوون ئەو دووانە دکتۆر ئاراس و کاک عەونی بوون هەردووکیان خەڵکی قەڵادزێ بوون، لەڕاستیدا نەمن وێرام سڵاویان لێ بکەم و نەئەوانیش جورئەتیان کرد چونکە دوو جەلاد بەناو هۆڵەکەدا دەسوڕانەوە، جگە لەوانە پیاوێکی عەرەبی ریشسپی لەتەنیشت منەوە دانیشتبوو، پیاوێکی دیکەش

بەرامبەرمان دانیشتبوو قاچی خستبووە سەرقاچ، وەختێکم زانی یەکێک لەجەلادەکان یەک شەقی لەو پیاوە هەڵداو پێی گوت: (جوان دانیشە حەیوان!). ئیدی تاوەکو نیوەڕۆ هەرناویان دەخوێندەوەو چەند کەسێک دەچوونە ناو هۆڵی دادگاوە و هەندێکیان دەهاتنەوە ناو هۆڵی چاوەڕوانی دادەنیشتنەوەو هەندێکی تریان نەدەگەڕانەوە، بەراستی لەو کەین و بەینە تێ نەگەیشتم هەتا خۆمیان بانگ نەکرد، بەر لەوەی من بچمە ژوورەوە دوو پیاوە عەرەبەکەیان بانگ کرد ئینجا سەعات (١٢)ی نیوەڕۆ ناوی منیان خوێندەوەو بە پێپلیکانەیەکدا چوومە هۆڵی دادگاوە، هەر لەبەر دەرگای هۆڵەکەدا دوو جەلاد لەم بەرو ئەوبەر وەستابوون هۆڵی دادگا ژوورێکی لاکێشەی گەورە بوو ڕووبەرەکەی نزیکەی (٥-١٠) مەتر دەبوو، لەبن دیوارەکەدا دوو قەفەزی تەختەی تێدابوو مێزێک لەبەردەم دادوەردا هەبوو، کچێکی جوان وگەنج کە لێکۆڵەری دادبوو لەسەر کورسی ئەو مێزە دانیشتبوو شتی دەنووسی، لەتەنیشت ئەو کچە پیاوێکی کامڵ دانیشتبوو بەحساب پارێزەری دیفاع بوو لەسەریشەوە سێ کورسی و مێزێکی گەورە دانرابوو بۆ دادوەرو دەستەی دادگایی، لەو سەری ژوورەکە دوو دەرگای تر لەگۆشەی راست و لەگۆشەی چەپدا هەبوو، مێزێکی بچوکیش لەنزیک مێزی لێکۆڵەری دادەوە بوو سێ کتێبی ئاسمانی پیرۆزی لەسەر دانرابوو (قورئان و ئینجیل و تەورات) دوای ئەوەی من و دوو پیاوە عەرەبەکەیان خستە ناو قەفەزێکەوە (٦)کچی عەرەبیان هێنایە ناو قەفەزەکەی ترەوە، لە پڕێکدا دادوەر (عەواد ئەلبەندەر) هاتە هۆڵەکەوەو هەموو هەستانە سەر پێ و دانیشتنەوە، لەو ساتانەدا چاوەڕوانی چارەنووسی خۆمم دەکرد، بیرم لە ئامۆژگارییەکانی عادل دەکردەوە هەوڵم دەدا هێزو وزەو توانا بدەمە بەر خۆم قیروسیام لەخۆم کرد، حەزم دەکرد ئەو وەزعە ناخۆشەم بەلایەکدا بکەوێت و لەو ئازارو ئەشکەنجەیە رزگارم بێت، هەندێ قسەم لای خۆم ئامادەکردبوو دەمزانی ئیتر ئەوە دوا هەلە بۆ قسەکردن و بەرگری کردن لەخۆم، بەڵام لەوەش دڵنیابووم کە ئەم دادگایە ئەوپەڕی ناشەرعیەو تەنیا خەڵکانی ئازادیخوازو بێ تاوانی تێدا مەحکوم دەکرێت، دیاربوو حوکمی ئەو (٦)کچە عەرەبە پێشتر دواخرابوو ،بۆیە دەستبەجێ دادوەر دۆسیەی ئەوانی کردەوەو ناوی سێ کچی خوێندەوەو بڕیاردرا ئیعدام بکرێن و سێ

کچەکەی تریش زیندانی ئەبەدی (حوکمی موئەبەد) یان بۆ دەرچوو، ئای لەهەڵوێستی ئەو کچە قارەمانانە هەر کە گوێیان لەدەقی بڕیاری دادگا بوو، دەستیان کرد بەهەلهە لە لێدان و ئینجا بەگریانەوە باوەشیان کرد بەیەکدا لەدڵی خۆمدا دەمگوت: ( خوایە گیان ئاخر ئەم کچە گەنجە جوانانە ئەگەر بنە ئاگریش چی دەسوتێنن؟!!) بەهەر حاڵ هەڵوێستی ئەو کچانە زیاتر هێزی پێ بەخشیم و پتر سوور بووم لەسەر ئەوەی چیم لەدڵدایە بیڵێم، جەلادەکان هاتن و سێ کچە بەئیعدام مەحکوم کراوەکەیان لەدەرگای خوارەوە بردە دەرەوە، سێ کچەکەی تریان هەر لەدەرگا هاتنە ژوورەوە بردەدەرەوە، ئینجا ناوی پیاوە عەرەبە بەتەمەنەکەی خوێندەوەو پاش کۆمەڵێک پرسیار بەساڵێک زیندانی حوکمی داو پیاوەکەی تریش بە موئەبەد حوکم درا، وردە وردە لێدانی دڵم زیادی دەکرد، هەموو گیانم موچوڕکەی پێدا دەهات، هەردوو پیاوەکەیان بردە دەرەوەو تەنیا من لەنێو قەفەزەکاندا مامەوە.ئینجا دادوەر عەواد ئەلبەندەر کەوتە پرسیارکردن لێم ولەگەڵ هەر وەڵامێکی مندا تەماشایەکی دۆسیە تایبەتەکەمی دەکرد:

- ناوت چییە؟

* شێرزاد فەرمان یاقۆ

- مێژووی لەدایکبوونت؟

* ١٩٦٨

- تۆ مەسیحیت یان ئیسلام؟

* مەسیحی

- ماڵتان لەکوێیە؟

* سلێمانی

- تۆ بێ تاوانی یان تاوانبار؟

* بێ تاوانم

- بۆم بسەلمێنە کە بێ تاوانیت؟

* دانم بەهیچ شتێکدا نەناوە هەر شتێکیشم گوتبێت لەژێر زەبری لێدان و ئەشکەنجەدا گوتوومە (ئینجا کراسەکەمم لەبەر خۆم داکەندو شوێن کێبلەکانی پشتمم پیشانی دادوەرداو بنی پێیم هەڵبڕی) پاشان گوتم : سەرنج بدەن بزانە چۆن لێیان داوم.

لەو کاتەدا یەکسەر یەکێک لە پاسەوانانی بەردەرگا هاتە لامەوەو بەتوڕەییەوە پێی گوتم: ( خێرا کراسەکەت لەبەرکەرەوەو دەی ) ئینجا زیاتر جورئەت و هێزم دایە خۆم و بەدادەورم گوت: (من پەیوەندیم بەهیچ شتێکەوە نەبووەو زەلامێک ڕقی لێم بووە بەگرتنی داوم) لەپڕ پارێزەری دیفاع!! هەستایە سەر پێ و بەشەلەشەل هاتە بەردەم دادوەرو ڕاپۆرتی خۆی خوێندەوەو تیایدا گوتی: (جەنابی دادوەر ئەم تاوانبارە لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان کاری کردووەو بەشداری لەعەمەلیاتە تیرۆریستیەکانی ناو سلێمانی کردووە، بەڵام داوا لەدادگای بەڕێز دەکەین بەزەیی پێیدا بێتەوەو بەحوکمێکی سووک مەحکومی بکات، لەبەر ئەوەی تەمەنی بچووکەو بەهەڵەدا چووە) کە گوێم لە ڕاپۆرتی پارێزەری دیفاع بوو!! حەپەسام هیچم بۆ نەگوترا، زانیم تەواو ئیدی کار لەکارترازاوەو هەر حوکم دەدرێم، دادوەر لێی پرسیم: ( هیچ وتەیەکی ترت نییە؟ ) گوتم (نەخێر) ئینجا پاسەوانەکان بردیانمە دەرەوە بۆ ژووری چاوەڕوانی، لەوێ چەند کەسێکی تر هاتبوون لەوانە پیاوێک و سێ کوڕی کە لەتەمەنی منەوە نزیک بوون، خێزانێکی کوردی فەیلیشی لێ بوو کە پێک هاتبوون لەدایکێک و دوو کچی گەنج و دوو کیژۆڵەی منداڵی جوان و قشتیلە، کە هاتمەوە بارودۆخی ئەو هۆڵە کەمێک ئاسایی و هێمن بوو بۆوەوە، دەستبەجێ دکتۆر ئاراس لێی پرسیم: ( چی بوو چیان لێ پرسیت؟ ) منیش بەتەواوی بۆم گێڕایەوە، ئیدی دکتۆر ئاراس زۆر دڵی خۆش کردم، گوتی: ( ئافەرین چاکت وەڵام داوەتەوە ) دوای ئەوە پاسەوانەکە ناوی دکتۆر ئاراس و عەونی و دایک و دوو کچە گەنجەکەی خوێندەوەو دوو کیژۆڵە منداڵەکەیان لای من بەجێ هێشت. پاش نیو سەعات خێزانەکە هاتنە دەرەوەو هەریەکەیان بەدوو ساڵ زیندانی حوکم دران، دایکیان دەگریا، بەڵام دوو کچەکە ورەیان بەرز بوو چونکە هەرسێکیان ماوەی تەوقیفیان زۆر بوو بێ شک ئەو ماوەی تەوقیفە لەماوەی حوکمەکەیان دەردەکراو هیچی وای نەدەمایەوە، پاش کەمێک دکتۆر ئاراس هاتە دەرەوە هەردوو چاوی سوور دەرپەڕیبوو سەرەتا ترسام حوکمێکی قورسیان دابێ، بەڵام یەکسەر بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی: ( شێرە گیان من بێ تاوان دەرچووم و ئازاد کرام تۆش چیت پێویستە با خزمەتت بکەم) منیش ناونیشانی ماڵی باوکم

دایەو گوتم پێیـان بڵێ و وەزعی منیـان تێ بگەیەنە د. ئاراس بەر لەوەی بڕواتە دەرەوە، دە دیناری لەگیـرفانی دەرهێناو دایمێ گوتی: ( شێرە گیان تەنیا ئەوەندەم پێیە با بۆ تۆ بێت باشترە) دووجار ماچی کردم و ڕۆیشتە دەرەوە.

پاش چەند دەقیقەیەک ناویان خوێندمەوەو بانگیان کردمەوە بۆ ناو هۆڵی دادگاو دووبارە خرامە نێو قەفەزەکەوە، ئینجا بەبێ هیچ پێشەکیەک دەقی **بڕیاری دادگای بەعەرەبی خوێندەوە:**

قرار

حكمت المحكمة حضوريا على المتهم «شيرزاد فرمان ياقو» بتأريخ (١٩٨٥/١٢/١٧) وفق المادة (١٥٧) من قانون العقوبات، بتهمة تخريب شمال مادة(أ) بالسجن لمدة (١٥)عاما، لأنة قد التحق بصفوف المخربين في حالة حرب مع العدو.

کە بڕیاری دادگا خوێندرایەوە لەیەک کاتدا هەستم بە خۆشی و بەناخۆشی دەکـرد، بەخـۆشی لەبەر ئەوەی لەوباوەڕەدابووم چیـتـر لێـدان و ئازارو ئەشکەنجـەم نامێنێ و سوکایەتیم پێ ناکەن ولەئیعدام کردن ڕزگـارم بوو لەڕاستیـدا هەرگیـز لەمردن نەدەترسـام چونکە ئەو چەند مـانگە ئەوەندە ئازاری جەستەیی و دەروونیم چەشت مردنم بەلاوە شتێکی زۆر ئاسایی بوو، بەڵام خەمی دایکم وباوکم بوو،چونکە دەمزانی ئیعدام کردنی من کۆتایی هەمـووخـۆشی وخـەندەو بەختـەوەری ژیانی ئەوان بوو، لەلایەکی دیکەوە خـەمێکی گـەورەشم لا دروست بوو لەخۆمم دەپرسی: ( ئاخـر (١٥) ساڵ لەبەندیخانەدا چۆن تەواو دەبێت؟) بەڕاستیش ١٥ ساڵ زیندانی بۆ منێک کـەلەبەهاری تـەمـەنما بووم و هێـشـتـا شـتـە جوانەکـانی دنیـام بەتەواوی نەدیبوو، هێشتا ئەو خەونە گەورەیەی کە هەمیشە هەوڵی وەدیهێنانیم دەدا سەوز نەبوو بوو، ماوەیەکی زۆر بوو کە بیرم لێ دەکردەوە یەکجار زۆر بوو یەکسەر لای خۆم حسابم کرد من بە ١٧ ساڵی گیراوم (١٧+١٥=٣٢) کە واتە من بە (٣٢) ساڵی ئازاد دەکرێم، بەم پێیە هەموو تەمەنی گەنجێتیم کـوردسـتـان خۆش. ئەمـە ئەو دادگـایە بوو کـە ڕۆژانە دەیان و بگرە سـەدان کـەسی ئەو وڵاتە بە پیـرو گـەنج و جـوان و منداڵەوە، بەجیـاوازی ڕەگـەزو ئایین و چین و توێژو مـەزهەبەوەو، بەشێـوەی دادگـاییـەکـەی من و لەوەش

خراپتر ڕەوانەی ژوورە تاریکەکان و پەتی سێدارەو هۆڵە دۆزەخ ئاساکانی بەندیخانە دەکران. ئاخر کێ بەو دووعایە دەڵێ ئامین و کێ بەبڕیاری ئەو دادگایە دەڵێ عادل، ئێستاش نازانم بەو دادگاییە گاڵتەیان بەخۆیان دەکرد، یان قەناعەتیان بە ئێمە دەهێنا کە بەراستی یاسا سەروەرە لەو وڵاتەدا! بەهەر حاڵ بێ دەنگ بردیانمە دەرەوە لەسەروو هەموو شتێکەوە دڵم بەوە خۆشبوو کە لەمەودوا کەس و کارو خزمان و دۆستانم دێنە سەردان و دیدەنیم ئای، کە بیری خوشک وبراکانم دەکرد، حەزم دەکرد هەریەکەیان توند لە ئامێز بگرم و دەردی دووری و تامەزرۆیی خۆم لەو باوەشە گەرمانەی خۆشەویستانما بەتاڵ کەمەوە، دڵشاد بووم شوکر بۆ خوا سەری خۆم و خێزانەکەم بەرزە من لەسەر مەسەلەیەکی پیرۆزو ڕەوا زیندانی دەکرێم، لەخەیاڵی خۆمدا دەمگوت: (١٥ بێ و ٢٠ بێ و ٣٠ بێ ڕۆژێ لە ڕۆژان بەسەر بەرزی دەگەڕێمەوە شارەکەی خۆم و ئازایەتی و نەبەردی وقارەمانێتی ئەو هەموو گەنجە کوردستانیەو ئەو مرۆڤە هەڵوێست بەرزو جوامێرانە بەگوێی هەموو کەسێکدا دەدەم) بەهەر حاڵ نزیکەی چارەکە سەعاتێک لەژووری چاوەڕوانی لەم بیرکردنەوانەدا بووم و پاشان کەلەبچە نەفرەتیەکەیان کردەوە دەستم ودووبارە بێ ئومێدی لەناخمدا چەکەرەی کردەوە. ئۆتۆمبیلێکی بۆکسی سەرداخراویان هێناو من و خێزانە کوردە فەیلیەکەیان تێ کرد، ئۆتۆمبیل کەوتەڕێ و نزیکەی دوو سەعات بەڕێوەبووین پاشان لە شوێنێکدا ئۆتۆمبیلەکە وەستاو یەکێک لە پاسەوانان گوتی: (شێرزاد دابەزێن و بیبەن بۆ بەشی تایبەت) منیش ماڵئاواییم لەیەکەیەکەی ئەندامانی خێزانەکە کردو دابەزیم، ئەو شوێنەی کە منیان لێ دابەزاند زیندانی گەورەی ئەبو غرێب بوو.

# بەندیخانەی ئەبو غرێب

ئەبو غـرێب قـەزایەکی گـەورەو بەرفـراوانەو ناوچەیەکی کـشـتـوکـاڵـیـە، لەرۆژئاواوە نزیکەی ٢٥ کـیلۆمـەتر لەسـەنتـەری شـاری بەغـداوە دوورە، کارگەیەکی گەورەی ئەلبان و سەربازگەیەکی گەورەو کۆمەڵێک دام ودەزگای سـەربازی تێـدایە، ئەمـە جـیـا لەژمـارەیەکی زۆر خـانوو مـاڵ و باڵەخـانەی نیشتـەجێبوونی لەخۆ گرتووە، بەڵام لەهەمووی گرنگتر بەندیخانەی گەورەی ئەبو غـرێبە کە مـێژووی دروستـکردنی دەگەڕێتـەوە بۆ پتـر لە ٣٥ سـاڵ پێش ئێـستـا دەتـوانم بڵێم ئەبو غرێب نەک هەر گەورەترین بەندیخـانەیە، بەڵکو لەباری ئاسۆییدا گەورەترین باڵەخانەیە لەعێراقدا، کەم کەس هەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان لەعـێـراقـدا زیندانی بووبێت و بەندیخـانەی ئەبـو غـرێبی نەدیبـێت، شـوێنێکی ترسناکـە، لای هەمـوو خەڵـکی عـێراق وکـوردسـتـان بەتایبـەتی ووشەی ئەبو غـرێب مانای گرتن و زیندانی و ئازارو ئەشکەنجە دەگەیەنێت. ئەو بەندیخـانەیە هێندە گەورەیە کاتێ لەدوورەوە تەماشای شورای دەرەوەی دەکەیت ئەو سەری دیارنییـە، تەنیـا بەندیخـانەکـە هێندەی شـارۆچکەیەک دەبێت بەشـێـوەیەک لەنێـوان بەشـەکـانی ئەو بەندیخـانەیەدا شـەقـامی پان وبەرین و دووردرێژی قیرتاو هەبوو، بەلۆری وپاسی گەورە زیندانیـەکانیـان دەگـواسـتـەوە بەهەزاران هەرزەکـار وگـەنج و پیـری ئەووڵاتە لەو بەندیخـانەیە کۆتایی بەژیانیـان هاتووە، یاخـود بەشـێکی زۆری تەمـەنیـان تێـدا بەسـەر بردووە، بەندیخـانەی ئەبـو غـرێب لەپێنج بەشی سـەرەکی و بەشـێـکی تـایبـەت پێکهـاتووەو هەریەک لەو بەشـانە گـۆڕەپان و دیوارە پەرژینی تایبـەتی خۆی هەیە، بەشـەکانیش ئەمانەن ( ١- بەشی حـوکـمـە تایبـەتەکـان کـە هەر هەمـوو زیندانیـەکـانی سـیـاسی بوون بەجـیـاوازی

بیروبۆچوون وئایدۆلۆژیاو نەتەوەو ئایین و مەزهەبەوە، ٢- بەشی حوکمە قورسەکان بریتی بوون لەو زیندانیانەی کە بەتۆمەتی کوشتن و دزی و ریگری حوکم درابوون بێگومان لەکوشتندا سیاسیەکانیش دەگرێتەوە، ٣- بەشی حوکمە سوکەکان ئەوانەی لەخزمەتی سەربازی سەرپێچیان هەبوو لەگەڵ حوکمە ماوەکەمەکان، ٤- بەشی ئازاد کردن، ئەوانەی بەسێ ساڵ کەمتر زیندانی حوکم درابوون، ٥- بەشی ئازادکردنی بیانیەکان ئەوە تەنیا بۆ زیندانیە غەیرە عیراقیەکان بوو، ٦- بەشێکی تایبەت بوو پێیان دەگوت ژمارە (١)کارگە، ئەوانەی دەگرتەوە کە هێشتا لەتەوقیفدابوون بەتایبەتی پیاوانی هەواڵگری و سەربازی ئینجا سڤیل، بەڵام ئەوەی کە زۆر شارەزای بووم بەشی حوکمە تایبەتەکان بوو.

کاتێ منیان لەبەشی حوکمە تایبەتەکان دابەزاند لەدەرگایەکی ئاسنی گەورەوە بردیانمە ژوورەوە، دیوارەکەی یەکجار بەرزبوو بەسەکۆبەکی کۆنکرێتیدا رۆیشتین خۆمان کرد بەهۆڵێکی گەورەدا، ئەو هۆڵە ژمارەیەکی زۆر چەکداری تێدابوو دەستێ جلی زەیتونیان پۆشیبوو، وێنەیەکی گەورەی (سەدام حوسێن) بەدیوارێکی هۆڵەکەدا هەڵواسرابوو، ئەوە جگەلەوەی بەشەکانی دیکەی دیوارەکە سەرلەبەر بەدروشمی حزبی بەعس پڕ کرابۆوە، کەش و هەوای ئەو هۆڵە تەواو ساردو سڕ بوو، بۆ بەدبەختی ئێمە زستانی ئەوساڵە یەکجار تەڕوتوش وسەرما بوو، لەدەرگایەکی دیکەوە چووینە بەردەم ژوورێک کەبەشی خوارەوەی دیواری لەبخ کراوو بەشی سەرەوەی جامخانەبوو، ئەوە شوێنی ئەفسەری ئێشککر بوو، دەمژمێر (٣)ی عەسر بوو، هەمووکیانم لەسەرمانا هەڵدەلەرزی منیان بردە لای ئەفسەرەکە لەسەر دەرگای ئەو ژوورە نووسرابوو (قسم الاحکام الخاصە لاصلاح الکبار) ئەفسەرەکە بەوردی دۆسیەکەی خوێندەمەوەو بەپاسەوانەکانی گوت: ( ئەوە بەحسابی نەوجەوان حوکم دراوە لێرە وەرناگیرێت) یەکێک لە پاسەوانەکان هاتە وەڵام و گوتی: (قەیناکە لێرە دایبنێین تاوەکو دەنێرینەوە بەشوێنیدا دەبیەین) چەند چرکەیەک بێ دەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا ئەوەندەم زانی ئەفسەری ئیشککر بەبێ هیچ هۆیەک هەستایە سەرپێ و کەوتە لێدانم بەشەق و زللە هاواری کرد بەسەرما: ( ئاخر خوێڕییەکی وەکو تۆ چییە بەم منداڵییەوە دژایەتی حکومەت بکات!) پاشان فەرمانی

دا بمبەن بۆ ژووری پێشوازی. لەو کاتەدا بیرم لەوە دەکردەوە ناخۆ ئەم (١٥)ساڵەی لەرێمە چۆن تەواوی کەم تۆ بڵێی بەسەلامەتی لێی دەربچم ناخر ئەو شەق و زللانەی ئەفسەری ئیشکگر وەک بەخێرهاتنێک بوو هێشتا لەکوێمە؟!! ئینجا بەراڕەوێکدا بردیانم و کردیانم بەژوورێکی ڕووبەر (٢×٣) مەتردا ئەو ژوورە دووناوی هەبوو لەلایەک پێیان دەگوت (مەحجەر) بۆ زیندانیە هەمیشەییەکان کاتێ سزا دەدران لەنێو هۆڵە گەورەکاندا دەریان دەهێنان و بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک دەیاخستنە ئەم ژوورەوە، لەلایەکی دیکە پێیان دەگوت ژووری (پێشوازی) بۆ زیندانیە تازەکانی وەکو من، بەهەر حاڵ پاسەوانەکان بەپاڵ فڕێیان دامە ئەو ژوورەوە کە بینیم (٦-٧)کەسی زیندانی لەگۆشەی ژوورەکەدا دانیشتبوون کە دوایی یەکترمان ناسی ئەو زیندانیانە بریتی بوون لە (ئەبو ڕامی، سەمیر شەمعون مەسیحی بوو، عەبدولرەزاق سەعد حەرەج، نەشئەت فەرەج سەموعی مەسیحی بوو، قادر کەرکوکی، ستار موهەندیس، هادی ناسر، شەهید حەسەن نەجار) نەشئەت سەموعی مەسیحی شاری موسڵ بوو کاتی خۆی لەوڵاتی یوگسلافیا خەریکی خوێندن بوو بوو، ئیدی هەموو جارێ لەعێراقەوە نامەی بۆ دەهات و ئەمیش دەچوو لە باڵوێزخانەی عێراقی لەیوگسلافیا نامەکانی وەردەگرت، ساڵی(١٩٧٨) ڕۆژێکیان لەناو باڵوێزخانەی عێراقی دەرمانی خەویان بۆ خستبووە شەربەتێکی پرتەقاڵەوەو بۆیان هێنابوو نەشئەتیش دوای خواردنەوەی ئەو شەربەتە ئەو خەوەی لێی کەوتبوو خەبەری نەبوو بۆوە تا ئەو ساتەی لەنێو باڵەخانەی موخابەراتی عێراقیدا لەبەغدا خۆی بینیبۆوە، بەتۆمەتی لایەنگیری حزبی شیوعی عێراقی حوکم درابوو، قادر کەرکوکی ناسرابوو بەقادری سیانە ئەوەیان کوردبوو خەڵکی شاری کەرکوک بوو بەتۆمەتی سیخوڕی مەحکوم کرابوو، بەڵام ستار موهەندیس ئەندازیارێکی جیۆلۆجی زیرەک بوو عەرەب بوو لەکاتی لێدان وئەشکەنجەی دائیرەی ئەمندا عەقڵی لەدەست دابوو، هادی ناسریش شیوعی بوو، حەسەن نەجاریش (شەهید حەسەن نەجار) ئەوە سێیەمین جاری بوو بەتۆمەتی ئەندامێتی بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان وبەشداری کردن لەچالاکی سیاسیدا مەحکوم کرابوو،بەراستی حەسەن نەجار نمونەی مرۆڤێکی ئازاو هەڵوێست بەرزبوو بەدرێژایی ئەو

ساڵانەی کەلە بەندیخانەدا بووین پێکەوە. ئیدی بەو شێوەیە منیش بووم بەیەکێک لەمیوانانی ژووری پێشوازی، پاش سڵاوو چاک و خۆشی خۆم بەزیندانیەکان ناساندو ئەوانیش خۆیان پێناساندم یەکێک لەعەرەبەکان لێی پرسیم لەسەرچی گیراویت سەر بەکێیت؟! منیش گوتم: (پارتیم) دوو عەرەبە شیوعیەکە کە هەردووکیان جامانەی سووریان لەملدا بوو بەپێکەنینەوە تەماشای یەکدیان کردوو گوتیان: (جەماعەتی خۆمانە) بێگومان لەوێدا مەبەستیان جامانە سوورەکەی ملیان بوو،بەڵام حەسەن نەجار هەر کە گوێی لەووشەی پارتی بوو شاگەشکە بوو، زۆربەگەرمی دووبارە بەخێرهاتنەوەی کردم گوتی: ( من حەسەن نەجارم، منیش پارتیم) پاشان هەندێک ئامۆژگاری کردم و کورتە باسێکی بەندیخانەی ئەبو غرێب وچۆنێتی رەفتاری پاسەوانان و جەلادەکانی بۆ ڕوون کردمەوە، رێنمایی زۆری کردم، کە هەمیشە خۆراگربم، چونکە ئەم بەندیخانەیە کۆتایی لێدان و ئەشکەنجەنییە، بۆیە پێویستی بەمرۆڤی ئازاو بەجەرگ و نەبەرد هەیە، حەسەن نەجار خۆی بە (٢٠) ساڵ زیندانی حوکم درابوو، بەڵام زۆر دڵخۆشی دامەوەو ورەی بەرز کردمەوە، بەراستی زۆر دڵم پێی کرایەوە، حەسەن نەجار بە پێکەنینەوە گوتی: (شێرزاد گیان خەمت نەبێ، پاش کەمێکی تر دەتبەنە هۆڵە گەورەکانەوە، لەوێ کێت دەوێ دەیبینی هەموو کورد لێرە زیندانیە!).

سەعات (٦)ی ئەو ئێوارەیە دەرگا کرایەوەو چوارپێنج مریشکی کوڵاویان لەقزعەیەکدا خستە بەردەمان، پاش نان خواردن پاسەوانەکان گەنجێکی عەرەبیان بەپاڵ فڕێ دایە ژوورەکەوە، کە تەماشای قات و بوینباخ و جل و بەرگە رێکوپێکەکانیم کرد، زانیم ئەوە تازە گیراوەو وەک من میوانی ناوەختە!! ئەو گەنجە لەگەڵ دانیشتنی دەستی کرد بەگریانێکی بەکوڵ بەهیچ ژێرنەدەبۆوە، لەولاوە عەبدولرەزاق لێی پرسی:( چیە بۆ دەگریت دەڵێی حوکمی ئیعدامت بۆ دەرچووە؟!) گەنجەکە بەهەنسکی گریانەوە هاتە وەڵام و گوتی: ( نەخێر، بەڵام بە (٧)ساڵ زیانداني حوکم دراوم نازانم چۆن تەواوی کەم و چۆن بەرگە بگرم؟) کەوای گوت عەبدولرەزاق دەستی کرد بە پێکەنین و دەستی بۆ من راکێشاو بەگەنجەکەی گوت:( برای خۆم عەیبە مەگری ئەها تەماشای ئەو منداڵە بکە ئەوە (١٥)ساڵ حوکم دراوە

هەربەخەیاڵیشیدا نایەت).
بەهەر حاڵ لەم مشتومڕە بەردەوام بووین تاوەکو سەعات (١٠)ی شەو، مەفەوەزێکی ڕەش ڕوخسارو باریکەلەو ڕەزا گران و یەک دوو پاسەوان دەرگایان کردەوەو هاتنە ژوورەوە، دوایی زانیم ئەومفەوەزە ناوی سادقەو هەمیشە بەو شێوەیە قەمسەڵەیەکی عەسکەری بەسەر شانیەوەیەتی، سەرەتا ناویان خوێندینەوەو سەر ژمێریان کردین ئینجا لەخۆڕا وەک بڵێی هاتووە خۆی بەمن بناسێنێ و چاوترسێنم بکات لێم هاتە پێشەوەو پرسی: (لەسەرچی گیراوی؟) منیش گوتم: (پارتی) گوتی:( پارتی چییە؟!) ئینجا بەعەرەبی گوتم: (حزبی الدیموقراطی الکوردستانی) گوتی: ( حزبی دیموقراطی چیە پێم بڵێ جەماعەتی کێن؟!) گوتم: (مسعود البرزانی) هەر لەگەڵ وام گوت بەهەموو هێزی خۆی یەک زللەی لەپەناگوێم سرەواندو بەزەویدا کەوتم، پێم ناخۆش بوو هەستم بە سوکایەتیەکی گەورە کرد، بەڵام مرۆڤێکی وەکو من لە شوێنێکی وەکو بەندیخانەی ئەبو غرێب ولەنێو ئەو هەموو جەلادەدا دەسەلاتی چی بێت! بەهەر حاڵ هەستامەوەو چوومەوە لەگۆشەکەی خۆمدا دانیشتم کەچی دیسان بانگی کردمەوە گوتی: (وەرە،وەرە لەسەر کێ گیراویت؟!) منیش دڵم پڕ بوو گریەیەکی گەورە لەسەر سنگم کۆبوو بۆوەو وەختەبوو هەناسەم ببڕێت،دووبارە لەوەڵامدا گوتم: (مسعود البرزانی) چاوی لێ سوورکردمەوەو سەری هێنایە پێشێ بەتوڕەییەوە گوتی: (یەعنی تۆ سووری لەسەر ئەو قسەیە؟!) گوتم: ( ئاخر ئێوە لەسەر ئەوە منتان گرتووە) لەپڕ بەهەردوو دەست قژی گرتم و سەری خستمە ژێر پێ لەقەوەو چەندین شەقی تێ هەڵدام، لەو بگرەو بێنەو بەردەیەدا قەمسەڵە خاکیەکەی سەرشانی بەربۆوەو کەوتە سەر زەوی، منیش هەر ئاخ و ئۆفم بوو لەژێر پێ لەقەکانیدا، پاش چەند دەقیقەیەک دەستی لەلێدانم هەڵگرت و پێی گوتم:( هەستە قەمسەڵەکە بخەرەوە سەر شانم) منیش هێندە ئازارم گەیشت و هێندە لەڕووی دەروونیەوە ئەو لێدانەی دایڕوخاندم، دەستم لەخۆم شت و هەمووگیانم بوو بە ئازایەتی، بۆیە بەتوڕەییەوە گوتم:( قەمسەڵەت نادەمەوە دەست و چیشت لەدەست دێ بیکە) هێشتا خۆی نەهاتبووە وەڵام دوو پاسەوانەکەی پشتیەوە دووشەقیان تێ هەڵدام و گوتیان: ( هەستە خێرا قەمسەڵەکەی بدەرەوە

دەست) منیش هێندەی تر کەلەیی بووم گوتم:( شتی وا ناکەم و بەتەماش مەبن قەمسەڵە هەڵگرمەوە) بێگومان ئەم لێدان و زرمە زلێیە لەناو دەرگای ژوورەکەدا ڕوویدا، بۆیە بەشەق وشەقازلە کردیانمە ژوورەوەو مفەوەز سادق تەماشایەکی زیندانیەکانی دیکەی کردو پێی گوتن:(هەی بێ ڕەوشتینە ئەوە ئێوە فێری ئەو کەللە ڕەقییەتان کردووە؟) ئینجا بەتایبەتی ڕووی کردە حەسەن نەجار پێی گوت:(دەزانم ئەوە جەماعەتی تۆیە تۆ فێرت کردووە) لەولاوە یەکێک لەپاسەوانەکانی قەمسەڵەکەی دایەوە بەشانیداو گوتی:(گەورەم گوێ مەدەرێ ئەوە کوردە کەللەی وشکە!) خێسەیەکم لەپاسەوانەکە کرد ، دەمویست هەستم دەست بنێمە بینە قاقایی و پێی بڵێم: (تۆ کەللەت وشکە یان من؟) بەڵام حەزم نەدەکرد لەوە زیاتر ئازار بەخۆم بگەیەنم، پاش کەمێک لوتم خوێنی پژاو مفەوەز سادق فەرمانی دا بمبەنە بنکەی تەندروستی بەندیخانە بۆ تیمار کردن ئەوەبوو بردیانم، لەوێ تیمار سازێکی لێ بوو ، پیاوێکی بەتەمەن و ڕوح شیرین بوو ناوی (ئەبو مەحمود) بوو ئەو تیمار سازە وەک ئێمە زیندانی بوو،بەڵام بەتاوانی سیخوڕی حوکم درابوو، ئیدی زۆر بەدڵسۆزی تیماری کردم و پێی گوتم :( کوڕی خۆم ئینکارییان لەگەڵدا مەکە ئەگینا زۆر ئازارت دەدەن) منیش تەواوی ڕووداوەکەم وەکو خۆی بۆ گێڕایەوە لەبەرچاوی خۆمدا هیچی نەگوت، بەڵام وەک بیستمەوە دوایی چوو بوو لای زیندانیەکانی ناو هۆڵەکان ڕووداوەکەی بۆ گێڕابوونەوە گوتبووی (کوڕێکی زۆر بەغیرەت وئازایە) بەوشێوەیە باسی کردبووم، هەر چۆنێ بوو بردیانمەوە ژوورەکەی خۆمان ئاوبالای جەستەم لەئازاردا دەینالاند سەرم گێژی دەخوارد زۆرماندوو بێ تاقەت بووم، عەبدولرەزاق بەپێکەنینەوە دەیگوت:(ئاوات لێ دەکەن بەنیازی هەروا بەخۆڕایی مریشک بخۆیت؟!) حەسەن نەجار هەستا باوەشی پێدا کردم چەند جارێک ئەملاو ئەولای ماچ کردم ئینجا پێی گوتم: (ئافەرین شێرە گیان سەرم بەتۆوە بەرزە، هەمیشە شانازیت پێوە دەکەم) ئەو شەوە بەئازارەوە خەوتم، بەڵام ورەم بەرزبوو ، بۆ بەیانی پاش نان خواردن سەر ژمێریان پێ کردین ومن و زیندانیە تازەکەی تریان برد بۆ لای توێژەری کۆمەلایەتی توێژەرەکە ئافرەتێکی جوان و قەشەنگ بوو بەتەنیا لەژوورێکدا دانیشتبوو، ناوی (أم نور)بوو هەندێ

پرسیاری لێ کردین و مادەی حوکمەکەی لای خۆی نووسی،پاشان فەرمانی دا بمانبەنە ژووری قەڵەم، بەر لەوەی بڕۆمە دەرەوە بانگی کردمەوە گوتی: (جەماعەتی ئەمنەکان هەرشتێکیان پێ گوتی، بەقسەیان بکە، ئەوە بۆم نووسیویت ئیدی لە ڕۆژی (١/١/١٩٨٦)ەوە کەس و کارت دەتوانن بێن بۆ دیدارو دیدەنیت) ئینجا بردیانینەوە بۆ ژوورەکەی خۆمان. هەر ئەو ڕۆژە بۆ نیوەڕۆ عەبدوڵلا حیکمەتیان کرد بەژوورا، عەبدوڵلا ئەو گەنجە بوو لەگەڵ (١٠٠) کەسەکەدا لەگرتوخانەی فزەیلیە پێکەوە زیندانی بووین، ئیدی هەر بەگەیشتنی هاتە ژوورەوەو باوەشی پێداکردم ئینجا دەستی کرد بە قسەی خۆش و بە پێکەنینەوە گوتی: ( کوڕە خۆ لێدان و تەعزیب هەر ماوە!) دیار بوو بەر لەوەی بیهێنە ژوورەوە زۆریان لێ دابوو، حەسەن نەجار هەندێ ئامۆژگاری ئەوانیشی کرد، سەعات (١٢)ی شەوی هەمان ڕۆژ لەکاتێکدا کەمن چاوەڕوانی ڕۆژی سەری ساڵی نوێ و دیداری دایک و باوک و خوشک براکانم بووم، مفەوەز سادق وەک بایەقوشێک خۆی کرد بەژووراو بانگی کردم بە لێدان و پاڵ وپەلامار بردمیە یەکێک لە ژوورەکانی خۆیانەوە، ڕووبەری ئەو ژوورە نزیکەی (٣×٤)مەتر دەبوو کورسیەک و مێزێکی ڕەشی لێ دانرابوو لە پشت کورسیەکەوە پەنجەرەیەک دەیڕوانی بەسەر ڕاڕەوی هۆڵەکانی بەندیخانەدا، کتێبخانەیەک لای کورسی و مێزەکەوە بوو، بەڵام لەجیاتی کتێب وگۆڤارو ڕۆژنامە کۆمەڵێک کێبڵی کارەبایی لێدان وچەندین زنجیرو شوڵکەدارو کەلەبچەی تێدا بوو، ڕەفەی کتێبخانەکە هەموو جۆرو شێوازێکی کێبڵی تێدابوو (گەورە، بچووک، باریک، ئەستور کورت،درێژ) وێنەیەکی سەدام حوسێن بەسەرو کورسیەکەوە هەڵواسرابوو مفەوەز سادق بەر لەهەموو شت پێی گوتم: ( تەماشایەکی کتێبخانەکەمان بکە وبزانە کام کێبڵەت بەدڵە بابەوە لێت بدەم)، سەرێکم بۆ سوڕاندو گوتم: (بابە دڵی خۆت بێ) ئینجا دەستی دایە کێبڵێکی ئەستوور یەکەمین جار لێی پرسیم: (تۆ بەعسیت؟) گوتم:(نەخێر) دوای ئەو وەڵامە بۆ ماوەی چەند دەقەیەک بەکێبڵەکەی کەوتە لێدانم، ئینجا پاڵێکی پێوەنام و کەوتم بەزەویدا گوتی: (قاچت بەرز کەرەوە)، چەندین کێبڵیشی دا بەبنی پێمدا، ئینجا قاچێکی خستە سەرسنگم و پڕ بەگەرووی هاواری کرد:(ئیش دەکەیت لەگەڵمان یان نا؟) دەمزانی

مەبەستی چیە، دەیویست بمکاتە پیاوو سیخوڕی خۆیان و ڕۆژانە نهێنی زیندانیەکانی تری بۆ بگوزامەوە، بەڵام خۆم لەگێلی داو پێم گوت: (من پێویستیم بە ئیش کردن وپارە پەیدا کردن نییە،کەسوکارم دێنە لام و پارەم بۆ دەهێنن) بەو وەلامە هێندەی تر ڕق ئەستوورو دەمارگیر بوو، چیتر بەرگەی ئەو وەزعەی نەگرت بۆیە قیژاندی بەسەرما گوتی: (قەشمەر تۆ چیت؟ شەرت بێ نەڕێگە بدەم کەس وکارت ببینی و نە نانت بدەمێ، ئەبێ هەموو ڕۆژێک چینێکت تێ هەڵدەم) منیش گوتم: ( من پێویستم بەهیچ نییە،هاتووم (١٥) ساڵ حوکمی خۆم تەواوکەم و ئیدی بڕۆمە دەرەوە ژیانێکی ئاسایی بژیم) دوای ئەوە بەفەرمانی پاسەوانەکان بردیانمە بەردەرگاو تاوەکو سەعات (١)ی شەو لەو ڕاڕەوە کش و مات وبێ دەنگ وساردو سڕەدا بە پێوە ڕایان گرتم، وەختەبوو لەسەرما ڕەق بمەوە، شوێن کێبڵەکانی بنی پێم یەکجار ئازاری دەدام، مفەوەز سادق هاتە دەرەوە فەرمانی داو بردیانمەوە ژووری پێشوازی!! (مەحجەر) کە چوومەوە جگە لەستار هەموویان خەوتبوون، ستار تاکە زیندانیەک بوو کە ڕێگەیان پێ دەدا یاریی شەترەنج بکات، بۆیە ئەو شەوە بەشەترەنجەوە خەریک بوو، بێگومان ئەو ڕێگەپێدانەش لەبەر ئەوەبوو کە شیرازەی عەقڵی تێک چوو بوو،بەدەگمەن خەوی لێ دەکەوت هەمیشە بەخەبەر بوو،ستار عەقڵی پێ نەدەشکا نەیدەزانی تائەو درەنگی شەوە من لەژێر لێدان وئەشکەنجە دابووم بۆیە پێی گوتم: (بابە ئەوە تۆ لەکوێی بەم درەنگی شەوە، بنوو بابە بنوو!) حەسەن نەجار و برادەرانی تر لەدەنگی ستار لەخەو ڕابوون و حەسەن ئامۆژگاری کردم کە بەئاوی سارد قاچم بشۆم بۆ ئەوەی ئازاری تێدا نەمێنێ، بەهەر حاڵ ئەو شەوە شکستێکی تەواو ڕووی لەئازاو بەدەنم کرد، لەرزم لێهات بەهیچ شتێک گەرمم نەدەبۆوە، بەزەییم بەحاڵی خۆمدا دەهات فرمێسک بەچاواندا هاتە خوارێ حەسەن نەجار لەئامێزی گرتم ودڵنەوایی دەدامەوە، زیندانیە عەرەبەکان دەیانگوت: (گوێ مەدەرێ گرنگ ئەوەیە تۆ کوڕێکی قارەمان وپاڵەوانی) کاک حەسەن قەمسەڵەکەی خۆی دابەشاندا برادەرە عەرەبەکان دووبەتانیان پێدادام و دواجارخەوم لێ کەوت.

بەو شێوەیە (١٣)ڕۆژی تەواو لەو ژوورەدا بووم، ڕۆژانە زیندانی تازە

دەهات و کۆنەکانیان دەبرد بۆ لێدان و ئەشکەنجە.

## شەوی سەری ساڵ

شەوی سەری ساڵی نوێ بوو سەعات (٨)ی شەوی ١٩٨٦/١/١ پاسەوانەکان هەموومانیان لەو ژوورەدا هێنایە دەرەوەو لەڕاڕەوەکەدا ریزیان کردین نزیکەی (٦-٧)چاودێری بەشەکانی بەندیخانە بەسەرمانەوە وەستابوون،ئینجا دابەشیان کردین بەسەر ئەو چاودێرانەو من بەر گۆڕەپانی (م٣)کەوتم و بردیانم کە سەرم کرد بەهۆڵی (م٣)دا تەماشا دەکەم هۆڵێکی یەکجار گەورەیە ڕووبەرەکەی (١٥×٤٠)مەتر دەبێت سەری بەجەمەلۆن گیرابوو، کۆمەڵێک قەرەوێڵەی دوو قاتی تێدا ریزکرابوو،ئەو هۆڵە (٤٢٠)زیندانی حوکم دراوی تێدابوو، لەدوورەوە وەکو بازاڕێکی قەرەباڵغ دەهاتە بەرچاو، زیندانیەکان هەموو سەرقاڵی خۆخاوێن کردنەوەو ریش تاشین و خۆ جوان کردن بوون، تارادەیەک جۆرە ئاسوودەییەک لەرووخساریاندا دەبینرا، بێگومان هۆی ئەو دڵشادیەشیان ئەوەبوو کە سبەی دیدەنی کەس وکاریان (مواجە)یە هەموو تەماشایان دەکردم منیش لەراستیدا چاوم بۆ ناسیاوێک دەگێڕا، هەر چۆنێ بوو لەنێوان دوو قەرەوێڵەدا بەتانیەکیان داخست و گوتیان ئەمە جێگای تۆیە، هەرچاوم بەهۆڵەکەدا دەگێڕا، ئاخر (١٥)ساڵ گاڵتە نییە، هەر بەدەم خۆشە ئاخۆ چۆن لەم هۆڵانەدا تەواو بکرێت؟ لەوسەری هۆڵەکە تەلەفیزیۆنێکی گەورەی شاشە رەنگاورەنگ دانرابوو ئیشی دەکرد، بەڵام ئاخۆ چی پیشان بدات! ڕۆژ تا ئێوارە سرودو گۆرانی بەسەر سەدام حسێنداو جموجۆڵ و چالاکی ووتار خوێندنەوەکانی نیشان دەداو، دەبوایە زیندانیەکان تەماشای بکەن، بێگومان ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئەشکەنجەیەکی دەروونی بوو بۆ زیندانییەکان، نزیکەی یەک سەعات بەو شێوەیە لەدیمەنی هۆڵەکە رامام، کاتێکم زانی هەڤاڵانی زیندانیە پارتیەکان هاتن بۆ بەخێرهاتن و پێشوازیم ئەوەی لەیادم بێت بریتی بوون لە: (حەسەن نەجار، حەمەی مام عەلی، ئاسۆی عەلی نەجار، نزارە سەرسپی، ئەرسەلان قرگەیی، نەورۆز، ئازاد مەجید کەبەئازاد بۆتە ناسراوبوو،عەزیز لازار) بێگومان زۆر لەو هەڤاڵانەم پێشتر دەناسی و پێکەوە لە رێکخستنەکانی پارتیدا لە سلێمانی کارمان

دەکرد، عەزیز لازار مەسیحی بوو بەدار شەقەوە هاتە لام لەوێ قاچیان شکاندبوو. زۆر ڕێزیان لێ گرتم، نزارو نەوروز چوون جگەرەو فلچەی ددان و دۆشەک و بەتانی و سەرین و جل و بەرگیان بۆ هێنام، دەستبەجێ ئاویان بۆ گەرم کردم و پاشان پاک خۆم شت و جل وبەرگی خاوێنم لەبەر کرد، ئەوەبوو دوای خۆشتن نزیکەی دوو سەعات باسی چۆنێتی گیرانم بۆ کردن ئینجا خەومان لێ کەوت بەر لەوەی بخەوم بەدەم وەنەوزەو بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ سبەی کەس و کارم دێنە دیدەنیم یان هێشتا نەیانزانیوە، هەندێ جار دڵم خۆش بوو دەمگوت سبەی دایکم وباوکم دەبینم لەو هۆڵانەدا ڕۆژ سەعات (٦)ی بەیانی و نیوەڕۆیان سەعات (٢)و شەوانیش سەعات (١٢) سەرژمێریان دەکردین ویەکە یەکە ناوبان دەخوێندینەوە، ئەو ڕۆژە هەڤاڵانم شەرواڵ وکراسێکی تازەیان بۆ هێنام و لەبەرم کرد، بێگومان لەنێو زیندانیەکاندا وا باوبوو هەمیشە ڕۆژانی دیدەنی خۆبان بەجوانترین وخاوێنترین شێوە ڕوو پۆش دەکرد، ئەوەش بۆ ئەوەبوو کەکەس و کارو خزم ناسیاو زۆر خەمیان لێ نەخۆن، ئەو ڕۆژە لەنێو هۆڵەکەدا مابنەوەو چاوەڕوانی کەس و کارمم دەکرد، وردە وردە خەڵک دەهات ئافرەت و پیرو گەنج ومنداڵ دەستەدەستە پێداویستی وخواردن و مەنجەڵی گەورە گەورەیان دەهێنا بۆ کوڕو براو باوک و کەس وکاری زیندانیان، منیش لەسەر ئاگربووم هەرچاوم دەگێڕا بۆ کەسێکی ناسراو لەهاتنی کەس وکاری خۆم بێ ئومێدبووم دەمویست برادەرێ دراوسێیە ،ناسیاوێک ببینم، دڵم زۆر بەخۆم دەسوتا هەموو زیندانیەکان لە ئامێزی کەس و کاریاندا بوون هەموو هەڤاڵانم لەنێو دایک و باوک وخوشک و براکانی خۆیاندا دانیشتبوون، تەنها من بووم کە ئەو بەیانیە لەدۆزەخی چاوەڕوانیدا دەژیام، هێدی هێدی زیندانیەکانی تر هەستیان بەخەمی تەنیایی و بێ ساحێبی ئەو ڕۆژەی من کرد، ئەوەبوو هەریەکەیان بە شێوەیەک هەوڵیان دا هاریکاریم بکەن و دڵنەوایم بدەنەوە، ڕەمزی مەسیحی بوو خەڵکی کەرکوک بوو، بەدایکی خۆی گوت کە ڕۆیشتینەوە هەواڵی شێرزاد بەدایک وباوکی بگەیەنن لەسلێمانی، عەزیز برایەکی خۆی بانگ کردو گوتی دەنگوباس بگەیەنەرە ماڵی باوکی شێرە، ئیدی دایکی ئاسۆو زۆر لەبرادەرەکانی تر هاتن و گوتیان خەمت نەبێ بەکەس و کارماندا هەواڵی تۆمان ناردووە،

ئەو ڕۆژە تەواو، بەڵام چاوەڕوانیم هیچی لێ سەوزنەبوو، ڕۆژی ٦ی کانوونی دووەمیش دیسان دیدەنی هەبوو بەبۆنەی جەژنی دامەزراندنی سوپای عێراقیەوە، ئەوە بوو ئەو (٥-٦)ڕۆژە بەرنەدەکەوتم، هەرژەمەی لەلایەن برادەرێکمەوە بانگهێشتی خوان دەکرام، بەیانی زووی ڕۆژی (٦)ی کانوون ئامادەباشی تەواوم وەرگرت دڵنیابووم کە کەس و کارم دێنە لام، جلوبەرگی خاوێنم پۆشیبوو ئەوبەیانیە لەنێو قەرەباڵغی دیدەنکاراندا چاوم دەگێڕا، تا ئەو ساتەی قەیسی برا گەورەم لەدەرگای هۆڵەکەوە خۆی کرد بەژوورا، دەتگوت ئەو ڕۆژە لەدایکبووم لەخۆشیا نەمزانی چۆن هەستامە سەرپێ وبەرەو باوەشی قەیسی برام رامکرد، بۆ ماوەی (٣-٤)دەقە یەکتریمان بەرنەدا یەکتریمان ماچ باران کرد، ئیدی وردە وردە دایکم وباوکم و تێکڕای خوشک وبراکانم و ماڵی مامەکانم وخاڵوان وتەنانەت هەندێ لەدراوسێکانیشمان دەرکەوتن هەرهەموویان سەراپا جلی رەشیان پۆشیبوو رەنگ و روخساریان لەپرسەبار دەچوو، بەڵام دیمەنی کەسیان هێندەی باوکم ئازاری نەدام،باوکم ریشی نەتاشیبوو لەخۆشیدا فرمێسکی شادی دەڕشت زۆر لاوازو ماندوو خەفەتبار بوو، بەدرێژایی دانیشتنە کەمان دایکم چاوەکانی ووشک نەدەبۆوە دەم نادەمێ لەبەرخۆیەوە دەیگوت (بۆ خاتری خودا ئاخر ١٥ ساڵ زیندانی چۆن تەواو دەبێت!). ئەو ڕۆژە یەکەمین خوانی خێزانیم بوو دوای دەسگیرکردنم کەلەسەریەک سفرەی نان خواردن پێکەوە لەگەڵ خوشک وبراکامدا کۆبوینەوە، ئای چ تام و چێژێکی هەبوو چێشتە بەتام و خۆشەکەی دەستی دایکم، بەدرێژایی ئەو ڕۆژانە هەرکەسێ دەهاتە لام و دەمناسی هەواڵی سالارم لێ دەپرسی،بەداخەوە هیچ زانیارییەک نەبوو دەربارەی،بەتایبەتی سەرجەم ئەو (٥٣)کەسەی کە یەکەمین جار لەگرتوخانەی فزەیلیە لەناوماندا دەریان هێنان و تاوەکو ئێستاش کەس نەیزانی بەرەو کوێیان بردن!!

## تەلەفزیۆنی بەندیخانە

لەنێو زیندانیەکانی ئەو هۆڵانەی بەندیخانەکەدا کەسانێکی خراپەکاری تێدا بوو بەتایبەتی ئەوانەی سیخوڕیان بۆ ئەمنەکانی نێو ئەو بەندیخانەیە دەکرد،وای لێ هاتبوو لەترسی ئەوانە زۆربەی جار نەمان دەوێرا بەئاشکرا و

بەئازادی قسەو باسی خۆمان بکەین ، وەک سەرەتا باسم کرد هەریەک لەو هۆڵە گەورانە تەلەفزیۆنێکی شاشە گەورەی تێدابوو ، هەمووشەوێک سەعات (٨) کاتی خوێندنەوەی دەنگوباس بوو ، دەبوایە هەر هەموومان قنج و قیت بەدیار تەلەفزیۆنەوە دابنیشتینایە تەنانەت جوڵە جوڵ و باوێشک و وەنەوزو شان و مل تەقاندنیش قەدەغە بوو سزای توندی لەسەر بوو ، بەتایبەتی ئەو شەوانەی بەیاننامەی سەربازی دەربارەی جەنگی عێراق- ئێران بخوێندرایەتەوە ، دەبوایە جوان گوێمان بۆ شل بکردایەو ئەز بەرمان بکردایە ، ئەگینا شەوانە دەورووبەری سەعات (١٢-١)ی شەو لەخەو هەڵیان دەساندین پرسیاریان دەربارەی زانیارییەکانی ناو بەیاننامە سەربازیەکە دەکرد ، خۆ هەرکەسێک نەیزانیایە بێ شک لێدان و ژووری تاکە کەسی و ئەشکەنجەشی تێدابوو ، بۆیە هەمیشە لەبەرمان دەکرد ، بەڵام لەهەمووی ناخۆشترو جارستر ئەو شەوانە بووکە (سەدام حوسێن) لە تەلەفزیۆندا بۆ ماوەی یەک دوو سەعات قسەی دەکرد ، هەر کەسێ لەکاتی لێدوانەکانی سەرۆکدا! بەحاڵ بجووڵایەتەوە دەستبەجێ بەشەق دەیانبرد بۆ ژووری ئەشکەنجەو پاش سێ چوار رۆژ هەندێ جار زیاتریش لێدان ئەنجا دەیانهێنایەوە. نزیکەی دوو مانگێک دەبوو لەو هۆڵەدا واتا (م٣) مامەوە ، لەراستیدا هەڤاڵانم ئەوانەی لەرێکخستنەکانی پارتی کاریان کردبوو زۆر هاوکاریان دەکردم هەموویان لەهۆڵی دوو بوون (م٢) ، حەزمان دەکرد لەیەک هۆڵدا بوینایە ،بۆیە رۆژێکیان ئاسۆی عەلی نەجارو عەزیز لازار پارەیەکی زۆریان دا بەچاودێرێکی بەندیخانە وەک بەرتیل بۆ ئەوەی من بگوازێتەوە بۆ هۆڵی دووەم، ئەوەبوو پلانەکەمان سەری گرت و گوازرامەوە بۆ (م٢)هەر چەندە ئەو هۆڵە زۆر قەرەباڵغتر بوو ،بەڵام هەڤاڵانی پارتی زۆربەی هەرە زۆریان لەوێ بوون ،ئەگەرچی لەوێندەر هەموو خەڵکی خەباتگێرو نیشتمانپەروەرو دڵسۆزبوون وجیاوازی نەدەکرا ، چونکە هەموو لایەکمان بۆیەک مەبەست تووشی ئەو ئازارە بوو بووین ئەویش ئازادی نیشتمان و سەربەستی مرۆڤ بوو ، بەڵام بەراستی دڵم بەهەڤاڵانم دەکرایەوە ،چونکە دانیشتن و قسەو باس و کۆڕەکانی شەوانی زستانمان یەکجار خۆش وبەچێژ بوو ،لەوێ کۆمەڵێ خەڵکی دیکەی باش وهەمەرەنگ و هەمە بیروبۆچوونم ناسی پیاوێکی عەرەبی تێدابوو ناوی (مەعن

وهەیب)بوو پاش ئەوەی (١٨)ساڵ لەبەندیخانەدا ژیانی بەسەر برد ئینجا ئیعدامیان کرد، سەر بەحزبی بەعسی یەساری بوو،ئەمین ئیسماعیل، ئەبو زیاد، تەمەر شەمدین ئەوانە کوردبوون ولەسەر ئایینی ئێزیدی بوون، حەسەن عەلی خەنجەر،عەبدولڕەحمان رەسول، جەلال حەسەن ڕەشۆ، ئەحمەد سنجاری، تەها بەرواری، شێرزاد زادە، سەگڤان عەبدولحەمید، مامۆستا یونس خەڵکی تەوێڵە بوو، کاک نەجم، کاک رەمەزان، کەمالی حاجی حوسێن، کەمال محەمەد ئەمین، جەمال محەمەد ئەمین، ئەوانە هەموویان پارتی بوون، کاک نەورۆز و سەلامە سوور هەردووکیان سوسیالیست بوون، فوئاد تۆفیق، سەروەر چاوشین، سەلام ڕەووف، سامان عەلی مەعروف کەلەم دواییەدا لەرێگەی قاچاخ لەنێوان تورکیاو یۆنان گیانی لەدەست دا، رەحیم عارف، سەعدون حەمە غەریب، عومەر فەتاح ئەوانە هەر هەموویان شیوعی بوون، بێستونی حامدی، عومەرە سوور،کاک ئارام ئەوانەش یەکێتی بوون) لەراستیدا جیا لەوانە ژمارەیەکی یەکجار زۆر زیندانی لەو هۆڵەدا هەبوون، ئیدی هەموو نەتەوەو ئایین و مەزهەبێکی تێدابوو،بەڵام ئەوانەی ناوم هێنان زۆر برادەرم بوون و و هاوڕێیەتیم دەکردن، ماوەیەکی زۆرم لەو هۆڵەدا لەگەڵ ئەو برادەرە خۆشەویستانەمدا بردەسەر، ڕۆژانە کەدەیانخستینە گۆڕەپانەکەوە خۆمان بە یاریی تۆپی پێ و جۆرەکانی دیکەی گەمەی وەرزشیەوە خەریک دەکرد، هەر (١٥) ڕۆژ جارێک کەس و کارم دەهاتنە دیدەنیم و هەمووەنگ و باس وهەواڵەکانی سلێمانیان بۆ دەهێنام، زۆر بیری سەرچنارم دەکرد هەواڵی هەموو کەسێکم دەپرسی، دراوسێکان، خزمان، گەنجەکانی سەرچنار، منداڵان تەنانەت دوکاندارانی قەیسەری سەرچنار وکەناسەکان ودانیشتوانی چایخانەکەی بن دارتووەکانیش، وردەوردە ئازاری لێدان و ڕۆژانی ئەمنی سلێمانیمان لادەبووە یادگاری جەستەمان کەمێک حەوابۆوە،لەراستیدا لەچاو ژیانی نێو بەندیخانەدا ڕۆژانێکی خۆشی تەمەنم بوون، ئەو ماوەیە هەواڵم پێ گەیشت کە لەسەرچنار، کۆمەڵە گەنجێکی زۆر گیراون لەوانە نزار نوری مامۆستای پارتایەتی و هاوڕێ و هاودەم و هەڤاڵی خۆشەویستم هەردووبرا عیرفان و عوسمان، حەمەمینی کاک یاسین، هەردوو برا ئەحمەد و مەحمودی شێخ حوسێن، سامانی عەزیز کاکی کە دواجار هەر هەموویان

ئیعدام کران، بەداخەوە ئەوە یەکێک بوو لەکارەساتە گەورەکانی خەڵکی سەرچنار چونکە ئەوانە کۆمەڵە گەنجێکی ناسراو و روح سووک وقسە خۆش و نیشتمانپەروەر بوون بێگومان ناوە ناوەش لەتەواری و ئەمنی سلێمانییەوە زیندانیان دەهێناو هەریەکەیان بە (١٠-١٥-٢٠)ساڵ زیندانی حوکم درابوون، من بەردەوام بووم لەسۆراخی سالار هەمیشە لە زیندانیە کۆن ونوێکانم دەپرسی،بەلام کەس هیچی لەبارەیەوە نەدەزانی.
بەهەر حاڵ ئەو ماوەیە شەوانە بەقسەی خۆش و نوکتەو سەربردەی سەیر سەیر و ڕۆژانەش لەنێو گۆرەپانەکەدا بەوەرزش و فوتبۆڵێنەوە خەریک بووین، لەنێو گۆڕەپانی بەندیخانەکەدا (٦-٧)تیپی تۆپی پێمان پێکهێنابوو لەنێو خۆماندا ڕۆژانە تیپا و تیپمان دەکرد، من لەگروپێکدا بووم زۆربەیان خەڵکی کەرکوک وگەرمیان بوون وپارتی بوون لەوانە (ئازادە قەڵەوو قەیسی عەلیە سوور،قادرس بیکەیسی) هەروەها شێرزادو نەوزاد و فەرهاد وحەسەن خەڵکی کفری بوون تیپەکەشمان بەسەرپەرشتی ئازادە قەڵەو بوو، رزگار پۆڵۆنی کاپتنی گروپەکەمان بوو بێگومان وێرای ئەم بارودۆخەش هەندێ جار سیخوڕکانی ناو بەندیخانە خەڵکیان بەلێدان وئەشکەنجە دەگەیاندو لەبەرچاومدانا لەنێو گۆرەپانەکەدا تێیان هەڵ دەدان، هەمووومان دەبوایە لەکاتی دەوامدا جل و بەرگی رەنگ قاوەییمان لەبەردا بوایە، هەندێ جەر پەڵپ و بیانووی نارەوایان پێ دەگرتین تەنیا لەبەر ئەوەی سزامان بدەن،بەلام لەهەموومان زیاتر (ئاسۆی عەلی نەجارِ و حەسەن نەجارِ و حەمەی مام عەلی و عەبدولرەحمان سەرسپی و عەبدولرەزاق و نەشئەت و فورات و هادی ناسر) هەمیشە سزا دەدران و دەبران بۆ ئەشکەنجە چونکە ئەوانە کەسانێکی جەربەزە بوون. هەر لەو ساڵەدا لەنێو بەندیخانە دەنگۆی ئەوە بلاو بۆوە کە کۆمەڵێک کادیری بزووتنەوەی ئاشووری ئیعدام کراون، ژمارەیەکیشیان هێنا بۆ بەندیخانەی ئەبو غرێب لەوانەی لەیادم مابن (رەمزی عەما نوئیل، مەتی کە پێشتر لەنێوسوپای عێراقدا ئەفسەربوو) لەنێو ئەو هۆڵەی ئێمەدا زیندانیەکان بەچەندین مادە لەیاسای سزاکان حوکم درابوون،بەلام بەزۆری مادەی (١٧٥،١٥٧)تێکدانی باکور، (٢٢٥) جنێودان بەسەرۆک کۆماری عێراق، (٢٤٧)چاو پۆشین لە جنێودەران بەسەرۆک کۆمار، هەندێکی

تریان بەمـــادەکـــانی (١٥٨) و (١٥٩) و (١٦٣) و (١٦٤) تاوانی سیـــخـوڕی، مـاوەی زیندانیش لە (١٠)ســاڵ کـەمـتـری تێـدا نەبوو تاوەکوحوکمی زیندانی هەتا هەتایی،، کاتێ من چوومە ئەبو غرێب زیندانی تێدابوو سالانێک بوولەو هۆڵانەدا بوو، یەکێک لەوانە پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، بەناوی(ئەبو حەبیب)ەوە خەڵکی ناوچەی بەدرەو جەسان بوو بەتاوانی سیخوڕی حوکم درابوو،بەڵام زۆری پێ ناخۆش بوو بۆیە زۆرجار کە پێکەوە قسەمان دەکرد دەیگوت: (مەرج بێ پاش تەوابوونی حوکمەکەم هەموو موڵک و سامانی خۆم لەپێناو لابردنی ناوی (سیخوڕی) لەسەر خۆم خەرج بکەم)مام باخەوانێکی پارتی هەبوو هەمیشە بە پێکەنینەوە دەیگوت من لەوەتەی هەم لەبەندیخانەدام ئەفسەرێکی کۆنی سوپای عێراقمان لەگەڵدا بوو بەناوی (وەلید حەداد)ەوە بەغیابی سێ حوکمی ئیعدامی بۆ دەرچوو بوو بەتۆمەتی ئەوەی ئەو کاتەی لەگەڵ سوپادا بووە پەیوەندییەکی دۆستانەو پتەوی هەبووە لەگەڵ بارزانیی نەمر دا پاشان ساڵی ١٩٧٩ خۆی تەسلیم کردبۆوە و ئیدی بەزیندانی هەتاهەتایی حوکم درابوو تاوەکو ساڵی ١٩٩٥ ئینجا بەلێوردن ئازاد کرا پیاوێکی دڵسۆزو خاوێن بوو زۆر دۆستی ئێمە بوو یەکێک بوولەوانەی هەموو بەیانیەک ریشی دەتاشی و خۆی پۆشتەو پەرداخ دەکرد پیاوێکی نورانی بوو، لای کوردەکان دەیگوت:( شانازیە بۆ مرۆڤ خزمەتکاری سەرکردەیەکی وەکو بارزانیی نەمر بێت) ئیدی ئەو ماوەیە تەواو شارەزای ژیانی نێو بەندیخانەبوو بووم، دەمزانی چۆن وەخت بەسەردەبەم و ڕۆژان بەڕێ دەکەم، شانازیمان بەخۆمانەوە دەکرد، لەبەرئەوەی لەسەر کێشەیەکی ڕەوا گیرابووین.

## جەژنی لەدایک بوونی سەرۆک!

ڕۆژی ١٩٨٦/٤/٢٨بەبۆنەی لەدایکبوونی (سەدام حوسێن)ی سەرۆکی ڕژێمی بەعسەوە، بڕیاری لێبوردنێکی تایبەت درا، وەک لەراگەیاندنەکەدا باس کرا ئەو بڕیارە زۆربەی هەرە زۆرمانی دەگرتەوە،، بۆیە دڵخۆشبووین تا ئەو کاتەی زانیمان بڕیارەکە ژمارەیەکی زۆر کەمی لەزیندانیەکان گرتەوە، لەنێو هۆڵەکەی ئێمەدا (حەمەی مام عەلی وداناو زاناو ئیسحاق ئاشووری) و ژمارەیەکی زۆر لەئەندامانی بزوتنەوەی ئاشووری گرتەوە،

بەلآم بەداخەوە هێشتا ئەوانە نەگەیشتبوونە نێو کەس و کاری خۆیان، لەشارەکانی کوردستانەوە سەدان زیندانی تریان هێناو رەشبگیری دەستی پێ کردبۆوە وردە وردە لەتێکرای شارەکانی عێراقەوە زیندانیان دەهێنا وەک بلێی نەیان دەویست هۆلەکانی بەندیخانە چۆل بێت. زۆر لەئەندامانی پارتی گیران لەوانە (سدیقی بەهارات،حەمەی ساردی و سەلاح برابوون) هەروەها کەمالی عومەر هندی، لەلایەکی دیکەوە سێ کەسی تریان هێنا بەم ناوانە (د. دەرغام و ویسام برابوون، لەگەل گەنجێکی سوببی بەناوی سەلام مەدلول، د. دەرغام بەئەسل تورکمان بوو پێشتر ئەفسەر بوو بوو لەسوپای عێراقیدا،بەلآم دوای ئەوە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی بەعسی یەساری بوو، پاشان کە گەرابۆوە بۆ عێراق کرابوو بەسەفیری عێراق لە ئەلمانیای رۆژهەلاتی ئەوکات، پاشان حکومەت بانگی کردبۆوە .ژ عێراق و پۆستی سەفیریی لێ سەند بۆوە بۆیە د. دەرغام خۆی و ویسا ی برای وسەلام مەدلول ویستوبیان لەکوردستانەوە هەلبێن، بەلآم دەسگیرکرابوونو هەرسێکیان حوکمی ئیعدامیان بۆ دەرچوو بوو وەلێ پاش واسیتەیەکی ئاست بەرزو گەورە، حوکمەکەیان بۆ گۆرا بە زیندانی هەتا هەتایی، هەروەها گەنجێکی قەلەوی مەسیحیان هێنا کێشی پتر لە (١٠٠)کگم دەبوو، بەناوی ئۆدیشۆ کاکۆ وە ئۆدیشۆ خەلکی موسل بوو، بەتۆمەتی لایەنگیری حزبی کەتائیب حوکم درابوو، بەلآم لەکاتی لێکۆلینەوەدا هێندە لێیان دابوو عەقلیان تێکدابوو، یەکێک بوو لەتووشبوانی نەخۆشی (شیزۆفرینیا) هەر لەوسالەدا بەلآم لەیادم نییە دروست لەچ مانگێدا بوو. پیاوێکی تەمەن (٧٥)سال کە نەخۆشی رەبۆی هەبوو رۆژێکیان لەنێو هۆلەکەدا لەئەنجامی تەنگە نەفەسی گیانی لەدەست دا.

## لەژووری ئیعدامدا

هەرلەمانگی تشرینی یەکەمی هەمان سالدا کۆمەلێ زیندانی نوێیان لەگەنجانی سلێمانی هێنا، هەوالی سالارم لەهەموویان پرسی،بەلآم کەس نەیدەناسی هاوکات هەرلەنێو بەندیخانەدا هەوالی ئەوەمان بیست کەپتر لە (٧٠٠)کەسیان حەوالەی ژووری ئیعدام کردووە، ئەو زانیاریەشم زانی کە

لەنێو ئەو (٧٠٠)کەسەدا گەنجەکانی سەرچناری تێدایە لەوانە (نزاری نوری فاتە کوڕانی وعیرفان و عوسمان وحەمە مین و شیروان وئەحمەد مەحمەد)هەموو ئەوانە کوڕی سەرچنار بوون برادەری خۆشەویستی من بوون لەهەمووشیان زیاتر نزار کە هاوڕێ و هاودەم و هەڤاڵی هەرە خۆشەویستی کاری رێکخستنم بوو، بەراستی ئەو هەواڵەش خەمێکی گەورەی لادروست کردم لەدوورەوە دەمزانی ئەو ڕۆژانە چ خەم و تەمێکی گەورە ئاسمانی سەرچناری داپۆشیوە، لە ئێوارەیەکی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٦ دا باروودۆخێکی نا ئاسایی لەنێو بەندیخانەی ئەبوغرێبدا دروست بوو، پاسەوانان تێکڕا شڵەژاپوون بەرلەکاتی رەسمی خۆمان زۆر بەپەلە رەوانەی هۆڵەکانیان کردینەوە، هێزێکی زۆری چەکدار بەنێو کۆڕەپان و سەر دیوارو ئەملاولای بەندیخانەکەدا بلاوبوونەوە لەراستیدا زۆربەی هەرە زۆری زیندانەکان ترسیان لێ نیشت چونکە دەنگۆی ئەوە هەبوو گوایە بەنیازن کۆمەڵێک زیندانی لەسێدارەبدەن ئیدی هەر لەسۆراخدا بووین: (تۆ بڵێی ئەم دۆخە نائاساییە چی بێت؟!) ئەو ترسە نەڕەوی تا ئەوکاتەی بەبڵند گۆی نێو بەندیخانە ناوی (٣٠)کەسیان خوێندەوە،هەموو جۆرە حوکم و نەتەوە، ئایین و مەزهەب و رەگەزێکی تێدابوو، ئەوانەی لەیادم مابێت( فورات، عەبدولرەزاق سەعد حەرەج و کۆمەڵێک گەنجی کوردی خەڵکی ناوچەی بتوێن و پشدەر و چەندانی تری تێدابوو) بەداخەوە ئێستا ناویانم لەیاد نەماوە. ئەوەبوو هاتن و ئەو (٣)کەسەیان بردو دەرگایان لەسەر داخستین و ئیدی دوای ئەوە هۆڵی (م٢) کش و مات و بێ دەنگ و کپ بوو، هەموو لەیەک ڕادەماین وروخساری هەریەکێکیان دەیان پرسیار و نیشانەی سەر سوڕمانی تێدابوو، هەموو خەمی ئەو (٣٠)کەسەمان بوو ئاخۆ چارەنووسیان چی بێت و بەکوێ بگات؟! پاش سەعاتێک لەبێ دەنگی ئەو هۆڵە چەند پاسەوانێک دەرگایان کردەوە یاتاخ و دۆشەک و بەتانیەکانی (٣٠) کەسەکەیان بردو کەس نەیوێرا بپرسێ ئەو خەڵکە بۆ کوێ بران ولەکوێ توند کراون! هەر چۆنێ بوو ئەو شەوەمان بەسەدان پرسیاری بێ وەڵامەوە بەرێ کرد، ڕۆژ بۆوەو هەندێ لەزیندانیەکان بەدرێژایی شەوی رابردوو لەبەردوو دڵی و دڵە ڕاوکێ خەویان لێ نەکەوتبوو ئەو ڕۆژە هەندێ لەو زیندانیانەی نەخۆشی درێژ خایەنیان هەبوو

چوو بوون بۆ بنکەی تەندروستی بەشی قورس کەبەعەرەبی پێیان دەگوت (سجن الثقیله) لەو بەشەدا بەشێک هەبوو بۆ ئەوزیندانیانەی بە ئیعدام مەحکوم بوون لەگەڵ هەندێ زیندانی تایبەت، ئەوەبوو لەنیوەی ڕێگا کۆمەڵێ پاسەوان نەیانهێشتبوو نەخۆشەکان بڕۆنە ئەو بەشەوە بۆ بنکەی تەندروستی، کەهۆکارەکەیان پرسیبوو پاسەوانەکان گوتبویان قەدەغەیە چونکە شەوی رابردوو لێرە ڕووداوێکی گەورە قەوماوەو ئەو هێزە چەکدارەی ئەمن کە هاتبوون زۆرلە زیندانیەکانی ژووری ئیعدامیان کوشتووە. بەراستی دوای ئەو هەواڵە سەرانسەری بەندیخانە وەک پرسەی هەبێت وابوو، زیندانەکان جموجۆڵ و وەرزشی گۆرەپان و قسەی خۆشیان نەمابوو هەربەشێوەیەکی گشتی قسەکردن کەم بۆوەو بارودۆخی بەندیخانە زۆر نائاسایی بوو، لەلایەکەوە خەمی ئەو هەموو زیندانیەی کە کوژراون لەلایەکی دیکەوە خەمی ئەو (٣٠) کەسەی کە بردیانن ونەیانهێنابوونەوە، هەفتەیەک ئەو دۆخە بەو شێوەیە بەردەوام بوو تا ئەو ڕۆژەی گەنجێکی مەسیحی ناوچەوان بەلەفاف بەستراویان هێنا بۆ هۆڵەکەی ئێمە ئەو گەنجە ناوی (سەرکیس نوبا)بوو لەسوپای عێراقدا سەرباز بوو،بەڵام بەتۆمەتی تەجاوز یاخود سەرپێچی سنووربەزاندن حوکمی ئیعدامی بۆ دەرچوو بوو، سەرکیس تارادەیەک عەقڵی تێک چوو بوو، بەڕۆژ باشتر بوو دەیتوانی تێکەڵمان بێت وقسەمان بۆبکات، بەڵام شەوان دوژمنیشم بەحاڵی نەبێ، وەزعێکی هەبوو کەس خۆزگەی پێ نەدەخواست هستریا لێی دەداو تووشی نەخۆشیەکی دەروونی سەخت بوو بوو بەبێ حەب ودەرمانی خەو هەرگیز نەیدەتوانی بۆچرکەیەکیش بخەوێت. سەرکیس یەکێک بوو لەو کەسانەی کە ڕووداوەکانی ئەو شەوەی ژوورەکانی ئیعدامی لەنزیکەوە دیبوو، چونکە ئەو لەسەر ئەو نەخۆشیە حوکمەکەیان بۆ کردبوو بە هەتا هەتایی بۆیەکاتێ لەسەرکیسمان پرسی ئەوشەوە لەبەشی قورس چی ڕوویداو بۆ زیندانیەکان کوژران؟ بەم شێوەیە بۆی باس کردین: ( ماوەیەک بوو باری تەندروستی ئەو زیندانیانەی لەژووری ئیعدام دا بوون تەواو تێک چوو بوو، جۆرەها نەخۆشی کوشندە لەناویاندا بڵاو بوو بۆوە، بەتایبەتی ژمارەیەکی زۆریان تووشی نەخۆشی سیل بوو بوون، کوڕێکی کوردی خەڵکی سلێمانی هەبوو ناوی یاسین بوو (بێگومان مەبەستی یاسین مەجید بەگی بوو) ئەوکوڕە

نەک هەر نەخۆشی بەڵکو هستریای گرتبوو ،دەیویست چی زووە ئیعدامی بکەن و رزگاری بێت، ئەو شەوە کە بۆیەیانی دەبوایە حوکمی ئیعدامەکەی جێبەجێ بکرێت پاسەوانێک درزێکی دەرگاکەی کردەوەو قاپێک شۆربای بۆ کردینە ژوورەوە، کەچی یاسین مەجید بەگی هەستایە سەرپێ و مەچەکی پاسەوانەکەی گرت و قەمەی بەرپشتێنی پاسەوانەکەی دەرهێناو دەستی کرد بەهاوار هاوارو پتر لە (١٠)قەمەی لەجەستەی پاسەوانەکە داو کوشتی، ئینجا چووە ڕاڕەوەکەی ناوبەشەکەوەو قەمەکەی هەڵبڕی و پڕ بەدەنگی هاواری دەکرد و بە پاسەوان وجەلادەکانی دەگوت: ( وەرن بێ ڕەوشتینە... وەرنەپێشەوە ئەگەر ئازان) ئیدی ئەوەبوو سەرجەم پاسەوانەکان بۆی هاتن و ئەوەندەیان فیشەک پێوەناجەستەی ئەو گەنجە قارەمانەیان شل وکوت و شیتاڵ شیتاڵ کردو گیانی لەدەست دا، هاوکات هەموو زیندانیەکان لەداخی ئەو بارە ناهەموارو نا تەندروستەی خۆیان ولەژێر ئەو فشارە دەروونیەی کە لەسەر یان بوو، دەستیان کرد بەهاوار هاوارو لەناو ژوورەکانی خۆیانەوە خۆیشاندانیان دژی حکومەت و دەسەلاتدارانی ناوبەندیخانە سازدا، ئەوە بوو هێزی تەواری وپاسەوانان و ئەمنەکان هاتن بۆمان و لە پەنجەرەی ژوورەکانەوە قومبەلەو نارنجۆکیان فڕێ دەدایە ناو زیندانیەکان و ئینجا بەکلاشینکۆف دەستریژیان بەنێو ژوورەکاندا کردو ژمارەیەکی زۆریان لەزیندانیەکان کوشت و بەشێکیشیان کە بەزیندووی مانەوە هەر لەو ڕۆژانەدا حوکمی لە سێدارەدانیان جێبەجێ کرا من یەکێکی بووم لەوانەی دەرچووم منیش بەراستی دووپارچە نارنجۆک بەر ناوچەوانم کەوت،بەڵام خۆم لەژێر تەرمی زیندانیە کوژراوەکاندا حەشاردا بەرێکەوت بەزیندوویی مامەوە) ئەو سەرکیسەی کە ئەم ڕووداوەی گێڕایەوە تاوەکو ساڵی ١٩٩٤ هەر لەبەندیخانە دابوو، ڕۆژ بەڕۆژیش باری دەروونی و شیرازەی عەقڵی تێک دەچوو دواجار هەر لەو ساڵەدا ئازاد کرا، بەڵام چۆن ئازادیەک بەهیچ شێوەیەک کەڵکی ژیانی نەمابوو بەڵکو وەک شێتێکی تەواوی لێ هات و ناردیانەوە بۆ ماڵی خۆیان. ئەو (٣٠)کەسەش کە پێشتر بردیانن وکەس نەیدەزانی بۆ کوێیان بردن، پاش ئەوەی (٥٠)ڕۆژی تەواو لەژووری تاکەکەسیدا بەندیان کردبوون لەساڵی ئایندەدا گێڕایاننەوە بۆ ناو هۆڵەکان ئەگەرچی بەدرێژایی

ئەو (٥٠)ڕۆژە هەرچەند جارێ کەس و کاریان دەهاتن بۆ دیدەنیان نەیان دەتوانی بیان بینن وکەسیش پێی نەدەگوتن لەکوێن و چارەنووسیان بەکوێ گەیشتووە بۆیە ئەو کەس وکارە بەشیمەنتەیان بەگریان دەرۆیشتنەوە وایان دەزانی ئیعدام کراون

هەر چۆنێ بوو بەو شێوەیەو چەندین ڕووداوو بەسەر هاتی تر کە داوای لێبووردنم هەیە لەبیرچوونەوەیان ساڵی (١٩٨٦)م لەنێو هۆڵەکانی (م٣وم٢)ی بەندیخانەی ئەبوغرێبدا بەسەر برد.

## ساڵی ١٩٨٧ . . .
## مەرگی کاک ئیدریس و خەمێکی گەورە

هەرچەندە لەو ساڵەشدا حکومەتی عێراقی بڕیارێکی لێبوردنی تایبەتی دەرکرد، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو بڕیارە زۆر بەکەمی زیندانیە سیاسیەکانی بەشی حوکمە تایبەتەکانی گرتەوە، هۆڵەکانی بەندیخانە تادەهات قەرەباڵغتر دەبوو، هەر یەکەیان پتر لەیەک هەزار زیندانی تێدابوو، بەئاستەم جێمان دەبۆوە، لەو ساڵەدا زۆر ئەفسەرو پلەداری سەربازی دەگیران و دەهێنرانە ئەبو غرێب هاوکات خاوەن بڕوانامە بەرزەکانیش زۆر دەگیران، زۆربەی هەرە زۆریشیان بەتۆمەتی (جنێودان بەسەرۆک کۆماری عێراق) حوکم درابوون ئەوانەی لەو هۆڵەی ئێمەدا ئەو تاوانەیان درابووە پاڵ نزیکەی (٣٠٠-٤٠٠)زیندانی دەبوون هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە شەڕی عێراق و ئێران کلپەی سەندبوو، یەکجار خوێناوی بوو بوو، ڕێژەی کوشتار بێ شومار بوو بۆیە ئەفسەران و پلەدارانی سوپا نەک هەر تاقەتی شەڕیان نەمابوو، بەڵکو زۆر جنێویان دەدا بەو دەسەڵاتدارەی ئەم شەڕەی کردوون بەتووشەوە. ئەو ساڵە بۆمن هەواڵی گەلێ ناخۆش و جەرگ بڕ دەهاتە ژوورە تاریکەکانی بەندیخانەوە. بۆ نموونە هەر ڕۆژی ٦/ی کانوونی دووەمی ئەو ساڵە کاتێک باوک و دایکم و خوشک براکانم هاتنە دیدەنیم دەستبەجێ هەواڵی سالار وهەڤالانی ترم لێ پرسین، کەچی باوکم بە روخسارێکی خەماویەوە گوتی: (سالار تاوەکو ئێستا چارەنووسی دیارنییە، بەڵام چەند ڕۆژێک لەمەوبەر تەرمی نزاری نوری فاتە کوڕانی وهەڤالانی تر لەگەنجەکانی سەرچنار، گەیشتەوە سلێمانی) هێشتا باوکم قسەکانی تەواو نەکردبوو قوڵپەی گریانم دەریەڕی، ئەو جەژن و دیدەنییەشم لێ بوو بەشین و

گریان دەمزانی گەر نزار شەهید بکرێ (کوردستان کوڕێکی ئازاو بەجەرگی لەدەست دەچێت) ئەو هەواڵەش بەهەمان شێوە کورتە پانۆرامایەکی ڕۆژانی هاوڕێیەتی نزاری بەخێرایی هێنایە بەرچاوم، لەخەیاڵمدا نزارم دەبینی، نزار ئەو گەنجە قۆزەی گەڕەکی سەرچنار، کە کچان لەهەمووکوڕێک زیاتریان خۆشدەویست، نزار ئەو کوڕە قسەخۆش و نوکتەبازەی کە کلیلی دەرگای هەموو دڵێکی پێ بوو، پیاسەی شەوانی کۆڵانەکان و دانیشتنی شەوانی هاوینی بەر گلۆپی سەرشەقامەکان و ئازایەتی و هەڕەشە کردنی بەردەوام لەپیاوانی بەعس و جەیشی شەعبیەکان،ئەو شەوانەی چالاکیە نهێنیەکانی ئەنجام دەدا بەبێ ئەوەی منیش پێی بزانم... نزار ئەو گەنجەی لەهەموو شتێک دەگەیشت تەنیا مانای ترسی نەدەزانی، نزار ئەو کوڕە گەنجە پارتیەی کە دائیرەی ئەمن و بنکەی پۆلیسی سەرچناری هێنابووە زەلزەلە، نزار ئەو قوتابیە کورد پەروەرەی نەیهێشت قوتابیانی ناوەندی سەرچنار جل وبەرگی تەلائیعی!! وەربگرن، نزار ئەو هەڤاڵ و مامۆستا پارتیەم کەشەونەبوو هەواڵی نوێی پێشمەرگەی پێ نەبێت و ورەی ئێمەی پێ بەرزنەکاتەوە... ئای نزار گیان چۆن ئەم ڕۆژە شومانە نەیهێشت جارێکی تر بەیەکدی شادبینەوە، ئەوشەوە بۆ زۆربەی زیندانیەکانم باس کرد نزار چۆن کوڕێک بوو چەند ئازا بوو. بەهەر حاڵ کەسوکارم ڕۆیشتنەوەو منیان بۆ ئەو خەمە گەورەیە بەجێ هێشت دوای ئەوە یەکێک لەشەوە هەرە ناخۆشەکانی ناوبەندیخانەی ئەبوغرێب ئەو شەوە بوو کە تەلەفیزیۆنە گەورەکەی ناو هۆڵەکە هەواڵی مەرگی کاک ئیدریس بارزانی خوێندەوە، ئەو شەوە هەر لەسەعات (٥ر٧) ئێوارەوە پاسەوانەکان هاتن و بەزۆر بەدیار تەلەفزیۆنەوە دایان نیشاندین، ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم سەعات ٨ی ئێوارە بوو لەڕۆژی ١٩٨٧/١/٣١ دا بێژەرێکی تەلەفزیۆنی بەغدا بەعەرەبی لەلێدوانی قسەکەرێکی سەربازییەوە (بێگومان بەو شێوە داڕشتن و هەڵبەستنەی کە ڕاگەیاندنە چەواشەکارەکانی خۆیان پێی ناسرابوون) هەواڵی مەرگی کاک ئیدریسی خوێندەوە... ئای لەو ئێوارە کۆستەو لەو خەمە گەورەیەی کە لەتێکڕای ئەو هۆڵەدا دروست بوو، ئاخر شەهید ئیدریس یەکێک بوو لەو سەرکردانەی کەهەمیشە جێی ئومێدی هەموو کوردێکی دڵسۆزو نیشتمانپەروەر بوو، گریانێکی بەکوڵ لەناخماندا مۆڵی

خوارد بوو، فرمێسکەکان دەیانویست هەر چۆنێ بێ هەڵقوڵێن... ئەو ئێوارەیە خەم میوانی هەموو زیندانیەکان بوو بەجیاوازی نەتەوەو ئایین و مەزهەب و ئایدۆلۆژیاو بیروبۆچوونەوە ئەوانەی خەڵکی کوردستان بوون دەتگوت ئازیزترین ئازیزیان کۆچی دوایی کردووە هەر هەموومان پرسەبارو خەمباربووین، یەکێک لەو برا عەرەبانەی کە زۆر بەو هەواڵە تاسا وەلید حەداد بوو چونکە زۆر بەباشی کاک ئیدریسی هەمیشە زیندووی دەناسی، شەو درەنگانێ هاتەلامان و پێی گوتین: (کوڕینە گرنگ ئەوە نییە ئیدریس بارزانیی لەچ نەتەوەیەکە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە مرۆڤایەتی وئازادیخوازانی جیهان شۆڕشگێڕێکی کەم وێنەو ئازاو نەبەردیان لەدەست چوو) ئاخر دوای ماڵئاوایی بارزانیی نەمر، مەرگی کاک ئیدریس یەکێک بوو لە زیانە هەرە گەورەکان بۆ خەڵکی کوردستان... ئەو شەوە گریام زۆر گریام، گریانێک کە تروسکاییەک ئومێد لەناخمدا نەمابوو، تاکەشتێک کە جار ناجار دڵنەواییمان پێ دەهاتەوە، قسەی هەندێ لەزیندانیە عەرەبەکان بوو کەدەیانگوت: (رەنگە ئەو هەواڵە درۆبێت، وەک هەر درۆیەکی تری راگەیاندنەکانی حکومەتی عێراقی، ئەوە دەیانەوێ ورەی ئێوە دابەزێنن) بەهەر حاڵ ئەو هەواڵە لەناو بەندیخانە ئەژنۆی شکاندین.

## ئەو ڕۆژەی خوێنمان نەبەخشی

دەورووبەری سەعات (١٠)ی یەکێک لەشەوەکانی مانگی (٣)ی ساڵی ١٩٨٧ بوو ،لەناکاو کۆمەڵێ قەرەوێڵەیان لەبەردەم بنکەی تەندروستی بەندیخانەکەدا ریز کرد، لەنێو بەندیخانەدا دەنگۆی ئەوە بڵاوبۆوە گوایە بەزۆرو بەتۆبزی خوێن لەزیندانیەکان دەستێنن بۆ بریندارانی سوپای عێراق کەلە بەرەکانی شەڕدا زامدار بوو بوون، بەر لەوەی بانگمان بکەن هەمان شەو لەگەڵ برادەرەکانم کۆبووینەوەو بڕیارمان دا لەژێر هیچ فشارێکدا خوێن نەبەخشین. ئەوەبوو بۆ بەیانی سەعات (٧)پاش نان خواردن و سەرژمێری بردیانینە گۆڕەپانی گەورەی بەندیخانەوەو نەیانهێشت کەس لەناو هۆڵەکاندا بمێنێ، پاشان لەوێ بە ریز دایانیشاندین ئیدی کۆمەڵێ بەرپرسی گەورەی ئیستخبارات و ئەمن وموخابەرات لەگۆڕەپانەکەوە وەستابوون و

دەستـیـان كـرد بەقـسـەكـردن بۆمـان،وانەی نـیـشـتـمـان پەروەریـیـان پێ دەگوتینەوە! بەرپرسی ئیستیخبارات بەزمانێكی شیرین دەیگوت: (برایان هەمـووتان دەزانن كـە ئێـسـتـا براكـان و باوك وكـەس وكارتـان لەبەرەكـانی شـەڕدان و ڕووبەڕووی دوژمن دەبنەوە، بۆیە پێـویـسـتـیـان بەخوێنی ئێوە هەیە دەمانەوێ هەریەكێكتان بتلێك خوێنی خۆی ببەخشێ) ئەوەبوو زیندانییە بەتەمەنەكانیان جودا كردەوەو ناردیاننەوە ناو هۆڵەكان، دوای ئەوە خوێن بەخشین دەستی پێ كرد، ژمارەیەكی زۆر لەزیندانیـەكـان خـوێنیـان دەداو ناونووس دەكـران و پەرداخـێك شـەربەتی پرتەقـاڵیـان دەدانێ، ئەوانەی خـوێنیـان نەدەدا هەریەكـەیان پاسـاو و بیـانویەكی دەهێنایەوە،پاشـان بەرپرسـەكـان تووڕە بوون وگـوتیـان (ئێـمـە لەناو بەندیـخـانەدا ئەو خـواردنە باشـانەتان دەدەینێ، كەچی ئێوە ئامـادەنین خوێن ببـەخشن) ئا لـەو سەرو بەندەدا حەسەن نەجار هەستایە سەر پێ و مۆڵەتی قسەكردنی وەرگرت، بۆیە ڕووی كردە بەرپرسی ئیستیخبارات و پێی گوت: (باشە ئێوە ڕۆژانە دوو سێ جار پێمان دەڵێن ئێوە بەكرێ گیراوو خائینن، ئیدی پێم ناڵێن چۆن خوێنی پیاوێكی خائین وبەكرێ گیراو دەخەنە جەستەی سەربازێكی سوپای عێراقیەوە؟!) ئەو بەرپرسە بەو قسانەی حەسەن نەجار زۆر تووڕە بوو هاواری كـرد: ( كێ بەئێـوە دەڵـێ خـائین، كێ ئەو قـسـە خـراپانەتان پێ دەڵێت؟) لەولاوە بەڕێوەبەری بەنـدیـخـانە گـوتی: (گـەورەم بڕوای پێ مـەكـە درۆ دەكـات) حـەسـەن نەجـار دووبارە لێی هاتەوە وەڵام و ئاوڕی بۆ زیندانیەكان دایەوەو گوتی: ( ئەرێ خەڵكینە راست بڵێن توخوا وانیە؟!) ئەوە بوو هەمـوو زیندانیـەكـان پێكەوە بەدەنگی بەرز گـوتیـان (بەڵێ وایە راست دەكـات) پاش ئەوە ناوی حـەسـەن نەجـاریان نووسی و وردە وردە خـوێنبـەخشین بەردەوام بوو تاوەكـو سـەعـات (١٠-١١)ی پێش نیـوەڕۆ نزیكەی (١٠٥)كەس مانەوە خوێنمان نەدا،ئەوەبوو ئەفسەرێك فەرمانی دا بڕۆینەوە ناوهۆڵەكان هەركە هەستاینە سەر پێ پاسەوانانی بەندیخانە بەدارو نیتاق و قامچی و كێبڵ وشەق و زللە كەوتنە گیانمان ئیدی ئازا ئەو كـەسـە بوو هەڵبـێت ولەبەر دەسـتـیـاندا نەمـێنێت وەخـتێ چووینەوە ناو هۆڵەكـان سـەرلەنوێ تاقـمـێك هاتن وتاوەكـو سـەعـات (٣)ی عـەسـر لەگەڵماندا خەریك بوون بۆ ئەوەی قەناعەتمان پێ بكەن خوێن ببەخشین،

بەڵام ئەو (١٠٥) زیندانیـەمـان هەر چۆکـمـان دانەداو زیاتر سـووربووین لەسـەر بڕیاری خۆمان، پاش ئەوە یەکێک لەئەفسـەرەکان گوتی: ( دیارە ئێوە بۆ مردن باشن چونکە بەکەڵکی هیچ شتێک نایەن) ئیدی بەرۆکیان بەردایین،بەڵام وەک سزادانێک تاوەکـو سێ مـانگی تەواو ڕۆژانە سێ جار تێکڕای هۆڵەکـان و ڕاڕەوو گۆڕەپانی گەورە خاوێن کـردنەوەی لەسـەر ئەو (١٠٥) کـەسـە بوو کـە خـوێنیـان نەدا، تەنانەت مـەنجـەڵ شـوشتن ودارو دیواریش ڕۆژی وا هەبوو یەک فەردەی دەبڵی خەت سوور بامێیان دەخستە بەردەممان ودەیانگوت پاکی بکەن. ئیـدی سێ مـانگ بەم شـێـوەیە بەبێ حەوانەوە یەکجار ماندوویان کردین،بەڵام هێشتا لەناخەوە ئاسوودە بووین و لەنێـو زیندانیـەکـاندا سـەرفـراز بووین چونکە هەسـتـمـان دەکـرد ئەو ماندووکردنە باجی هەڵوێستێکی بەرزی خۆمانەو دەیدەین.

## یادی ١٦ی ئاب بەنهێنی

هەر لەو ڕۆژەی کـە بەرەسـمی پەیوەندیم بەرێکخـسـتنەکـانی پارتی دیموکـراتی کـوردسـتـانەوە کـردبوو، ڕۆژی (١٦)ی ئاب لای من مـاناو مەغزایەکی تایبەتی هەبوو هەمیشە لەو ڕۆژەدا هەستم بەخۆشیەک دەکرد وام دەزانی چەژنی لەدایکبوونی خۆمە، زیا لە هەمـوو بۆنەو جـەژنێک دڵم بەڕۆژی دامـەزراندنی پارتی دیموکـراتی کـوردسـتـان دەکـرایەوە، ئاخـر ئەو کاتیش بەرلەوەی دەسگیر بکرێم وابوو، هەموو ساڵێک لەو ڕۆژەدا لەگەڵ هەڤاڵانم لەرێکخستە نهێنەکانی ناوشاردا پیرۆزباییمان لەیەکتر دەکرد، سـالاری برادەرم یادی بەخـێـر هەمـیـشـە جل وبەرگی بۆیاخـاوی لەبەردابوو،کـەچی لەو ڕۆژەدا دەسـتی جلی کـوردی جـوان و قـەشـەنگی دەپۆشی، دەتگوت بوکی بۆ دابەزیوە ئێـمـەش هەمـوو وابووین بۆیە ١٦ی ئابی ساڵی ١٩٨٧ کاتێ لەگەڵ ژمارەیەک لەزیندانیە سیاسیەکانی سەر بەپارتی دیموکراتی کـوردسـتـان لەهۆڵی (م٢)ی بەندیخـانەی ئەبوغـرێبـدا بووین شەوی پێشوو بەنهێنی بەبێ ئەوەی کارێک بکەین زیندانیەکانی تر هەسـتی پێ بکەن کـۆبوونەوەیەکی بچوکـمان کـرد بڕیارماندا بەشێـوەیەکی تایبەت یادی ١٦ی ئابی ڕۆژی لەدایکبوونی پارتی پێشڕەو بکەینەوە. بۆ بەیانی زوو جل وبەرگی پۆشتەو پەرداخمان پۆشی ویەکە یەکە پیرۆزباییمان

لەیەکدی دەکرد هەندێ لەبرادەرانی حزبە کوردستانیەکانی تریش دەهاتنە لامان بۆ پیرۆزبایی و ئێمەش شەربەتمان پێشکەش دەکردن بەهەر حاڵ ئا بەو شێوەیە وردە وردە ڕۆژەکانی ساڵی ۱۹۸۷مان بەڕێ دەکرد، لەمانگەکانی ئەیلول و تشرینی یەکەمی ئەوساڵەدا ژمارەیەکی یەکجار زۆر زیندانی نوێیان هێنایە هۆڵەکانەوە بەرادەیەک هەندێ لەزیندانیەکان لەنزیک ڕاڕەوو دەرگای ئاودەست و حەمامەکانەوە دەخەوتن، دەبوایە (٤-٥) سەعات چاوەڕوان بین ئینجا نۆرەیەکی حەمامان بەردەکەوت ئەو ماوەیە لەبەر قەرەباڵغی، هۆڵەکانی بەندیخانە یەکجار پیس و پۆخل بوو بوون دەیان نەخۆشی ومیکرۆب و مێرووی زیانبەخش لەنێو ئەو هۆڵانەدا بڵاو بوونەوەو ڕۆژ بەڕۆژ تەشەنەیان دەکرد، ئەسپێ لەجەستەی زیندانەکانی دابوو، جێگاو بێخەف و کاسەو کەوچک و تەنانەت خواردەمەنیشمان هەمووی ئەسپێ بوو، جۆرەها نەخۆشی پێست و حەساسیەت بڵاو بوو بۆوە سەدان کەس لەزیندانیەکان تووشی نەخۆشی خوروشت وگەڕی بوو بوون بەتایبەتی لەبنباڵ و ناوگەڵیان، مێرویەکی بەدفەساڵ پەیدا بوو بوو بەناوی (تەختە کالوس)ەوە شێوەی لەئەسپێ دەچوو، بەڵام گەورەترو خێراتر بوو، تەختەکالوس لەنێو مقەباوتەختەدا دەژیا وخوێنی مرۆڤی دەمژی بێگومان جێی گەستنەکەشی لەسەر جەستەی مرۆڤدا ئاسەوارێکی خراپی بەجێ دەهێشت و ئەگەر زۆر هەڵی کراندایە یاخود بیخوراندایە دەبووە برینێکی پیس وچاک بوونەوەی ئاسان نەبوو، ئەو مێرووە بەتەواوی لەنێو هۆڵەکانی بەندیخانەی ئەبو غرێبدا بڵاو بوو بۆوە نزیکەی (٣٠-٤٠)کەس لەزیندانیەکان تووشی نەخۆشی سیل بوون، بۆیە لەهۆڵەکاندا بردیاننە دەرەوەو لەژوورێکی تایبەتدا دایاننان وبەردەوام لەژێرچاو دێری پزیشکی و چارەسەردا بوون. دەم نادەمێ تیمی پزیشکیان دەهێناو زیندانیەکانیان دەپشکنی، بۆ نەخۆشیەکانی پێست مەڵحەمێکی تایبەتیان دابەش دەکرد سودێکی باشی هەبوو، چونکە حەساسیەت و خروشتی نەدەهێشت، ئەو بارودۆخە نا تەندروست و ناهەموارە لەنێو بەندیخانەی ئەبو غرێبدا بەردەوام بوو تائەو ڕۆژەی فەرمانیان دا هەموو هۆڵەکان چۆڵ بکرێت وزیندنیەکان تێکڕای کەلوپەلەکانیان بهێننە دەرەوە بۆ گۆڕەپانەکەو دەست بکرێت بەخاوێن کردنەوەو شۆردنی تێکڕای هۆڵ و ڕاڕەوو ژوورەکانی

بەندیخانە بەتایبەت وئاوو ئینجا دەرمان ڕێژ بکرێت. ئەوەبوو هەڵمەتی خاوێن کردنەوە لەلایەن خودی زیندانیەکانەوە دەستی پێ کرد، لەو پاککردنەوەیەدا هەندێ نهێنیمان بۆ دەرکەوت بۆ نموونە بەشێکی تایبەت هەبوو نزیکەی (٧٠٠-٨٠٠)زیندانی سەربەحزبی دەعوەی تێدا بەندکرابوو، ئەوانە لەساڵانی (١٩٧٨،١٩٧٩،١٩٨٠،١٩٨١)ەوە گیرابوون و بەهیچ شێوەیەک هاتنە دەرەوەیان نەبوو، بێگومان دیدەنی کەسو کاریش بۆ ئەوان قەدەغەبوو تەنانەت خواردنیشیان بەنهێنی بۆ دەبردن، بەڵام ئەو ڕۆژە هەڵمەتی پاککردنەوە بەرپرسانی بەندیخانەی ناچار کرد کە زیندانیەکانی ئەو بەشە نهێنیەش بهێننە دەرەوە. بەهەر حاڵ وەختێ کەلوپەلەکانمان دەرهێنا تەماشامان کرد مقەبای وا هەبوو پتر لە (٢٠٠-٣٠٠) مێرووی تەختە کالوسی تێدا دەژیا، ئەوەبوو سەرجەم سندوقی تەختەو مقەباو بۆکس و تەنانەت فلینی سەهۆڵیشیان پێکەوە لەناوەڕاستی گۆڕەپانی گەورەی بەندیخانەدا گڕ تێ بەردا، هەموو پێخەف و دۆشەک وبەتانی وسەرینەکانمان لەگۆڕەپانەکەدا لەبەر هەتاودانا و ئەو ڕۆژە تێکڕای زیندانیەکان لەگۆڕەپانەکەدا نانی نیوەڕۆیان خوارد، ئێوارە بەر لەوەی بچینە ژوورەوە، هەمووکون و قوژبنێکی ئەو بەندیخانە گەورەیە دەرمان ڕێژ کرا لەدژی مێروو میکرۆب، بەو شێوەیە لەو گرفتە خەتەر ناکە کە هەڕەشەی لەژیانی هەموو زیندانیەکان دەکرد ڕزگارمان بوو.

بەهەر حاڵ ساڵی ١٩٨٧یشم بەو شێوەیە لەنێو بەندیخانەی ئەبو غرێبدا بەسەر بردو پێم نایە ساڵێکی نوێوە.

# ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٨٨

ئاهەنگ گێڕان و پیرۆزبایی کردن بەبۆنەی شەوی سەری ساڵی نوێوە یەکێک بوو لەو بۆنانەی کەلەنێو بەندیخانەی ئەبوغرێبدا قەدەغەنەبوو، وەلێ جەژنی نەورۆزیش لەنێو زیندانیە کوردستانیەکاندا جێگەی تایبەتی هەبوو، زۆربەی ساڵەکان لەو بۆنەیەدا ئاهەنگی بچووکی تایبەتمان بەنهێنی دەگێڕا.

بەهەر حاڵ ئەوشەوە واتە شەوی ١٩٨٨/١/١ هەموو زیندانیەکان لەنێو خۆماندا پیرۆزبایمان لەیەکتری دەکرد، پاشان کۆبووینەوەو کۆڕمان گەرم کردو مستەفامان بانگ کرد کۆمەڵێ گۆرانی زۆر خۆشی بۆ چڕین وئەو ئاهەنگە بچووکەی یەکجار خۆش کرد، مستەفا گەنجێکی کوردی خەڵکی هەولێر بوو، ساڵانێکی زۆر پێشمەرگایەتی کردبوو پاش دەسگیرکردنی لەژێر لێکۆڵینەوەو لێدان وئەشکەنجەدا هێندەیان لێ دابوو عەقڵی ئەمیشیان تێک دابوو، بەڵام یەکێک بوو لەوانەی دەنگێکی پڕ جۆش وخرۆشی پێوەبوو بۆ گۆرانی گوتن، خودا خێری بنوسێ، ئەو شەوە بەگۆرانیەکانی دڵی سەدان زیندانی خۆش کرد، ئەویش کاتێ ئازاد کرا کە شێتێکی سەرگەردان وسەرەڕۆ بوو پێم وابێ ئێستاش هەر لەژیاندا ماوە،بەڵام شیرازەی عەقڵی بەتەواوی تێک چووە. بەهەرحاڵ ئەوشەوەمان بەئاهەنگ وخۆشی و رابواردن بەسەربرد بۆ سبەی بەبۆنەی سەری ساڵەوە دایکم وباوکم و خوشک و براکانم هاتنە دیدەنیم، دوای ئەوە بەماوەیەک دەنگۆی بڕیاری لێبوردنی گشتی. لەنێو زیندانیەکاندا بڵاوبۆوە، دیعایەی لێبوردن ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تەشەنەی دەکردو بەهێز تر دەبوو لەراستیشدا قەڵەم و لێکۆڵینەوەی بەندیخانەکە، کەوتبووە ڕێکخستنەوەی دۆسیەی

زیندانیەکان ومانگی جاریَ دوو جار لیَکوَلَینەوەی نویَ و زانیاری نویَ لەزیندانیەکان وەردەگیرا ئەو لیَکوَلَینەوە تازەیە زوَر لەزیندانەکانی گرتەوە،بەلاَم هەرگیز منیان بانگ نەدەکرد، کەچی ویَرای ئەوەش فشارو ئەشکەنجەی دەروونی بوَ سەر زیندانیەکان لەو بەندیخانەیەدا لەبرەودا بوو تەنانەت وردە وردە دانیشتن وکوَبوونەوەی ناو هوَلَەکانیشیان قەدەغە کرد، دەم نادەمیَ خەلَکیان بانگ دەکرد بوَ لیَدان و ئەشکەنجە بەزوَر دانیشاندن بەدیار دەنگ وباس و وتارو چالاکییەکانی (سەدام حوسیَن)ەوە زیاتر وتوندوتر بوو، ئەو زیندانیانەی کە دیارو بەرچاو وبەهەلَپەو چالاک بوون لەژیَر چاودیَرییەکی توندا بوون لەوانە(ئەبو شڤان، حەسەن نەجار، ئاسوَی عەلی نەجار و زوَری تر بەتایبەتی هاوڕیَیانی حزبی شیوعیش) ئەمانە هەندیَ جار بەبیَ هیچ هوَکارو پاساویَک بانگیان دەکردن و دەبران بوَ لیَدان و ئەشکەنجە، ڕوَژیَکیان هاتن بەدوان ئەبو شڤانیان برد ئەو ئەبو شڤانە پیاویَکی ئازاو خوَڕاگر بوو، هەمیشە وەک مروَڤیَکی چاونەترس و بیَ باک خوَی دەناساند بوَیە ئەو ڕوَژەی بردیان بوَ لیَدان، دەمە قالَیَ وگفتوگوَیەکی زوَری لەگەلَ ئەفسەرە جەلادەکەدا کردبوو سەبارەت بەلیَدانی، کەچی کابرای جەلاد فەلاقەی کردبوو ئینجا بەکیَبلَی کارەبا لەبنی پیَی دابوو، هیَندەی لیَدابوو بەڕادەیەک دوو سیَ جار ئەبو شڤان لەهوَش خوَی چوو بوو،بەلاَم وا خوَی پیشان نەدابوو کە ئازاری دیَت، بوَیە ئەفسەرە جەلادەکە پیَی گوتبوو: ( بەلَیَنت دەدەمیَ یەکجار لەتاو ئازار بلَیَ ئاخ، ئیَستا وازت لیَ دیَنم) کەچی هەر نەیگوتبوو!

## کارەساتی کیمبارانی هەلَەبجە

لەناوەڕاستی مانگی (٣)ی ئەوسالَەدا بارودوَخی بەندیخانە تەواوتیَک چوو بوو، چروچاوی پاسەوان و جەلادو ئەفسەرەکانی ئەمن ڕەنگی خویَنی گرتبوو کەشو هەوایەکی نا ئارام وترسناکی هەبوو، لەدوای ئەو ڕوَژانە کەسو کارمان هاتنە دیدەنمان و پیَیان گوتین ڕژیَمی عیَراقی بەچەکی کیمیایی لەشاری هەلَەبجەی داوەو هەزاران کەسی شەهید کردووە. سەرنجمان دەدا کەس و کاری زیندانیە هەلَەبجەییەکان تاک و تەرادەهاتن، ئەوانیش سەراپا پرسەبارو ڕەشپوَش بوون،ئاخر جاران لەڕوَژانی دیدەنیدا کەس

وکاری هەڵەبجەییەکان ئەو هۆڵەیان ئاوەدان دەکردەوە، باشە ئەم هەموو خەڵکە چی لێهات! بەو دیمەنانەدا زانیمان کە هەزارەها کەس لەو کارەساتەدا شەهیدبوون ،لەو هۆڵەی ئێمەدا چەند زیندانییەکی هەڵەبجەیی تێدابوو لەوانە (مامۆستا یونس و کاک زولفیقار و سەرکەوت هەڵەبجەیی) ئەو دوانەی یەکەم خزم وکەسیان زۆر شەهید بوو بوو بۆیە بەدرێژایی ڕۆژانی دوای (١٩٨٨/٣/١٦) لەسۆراخ و هەواڵپرسینی کەس و کاریاندا بوون،بەڵام سەرکەوت خێزانەکەیان بەدایک وباوک و خوشک و براو خاڵ ومامەوە، تێکڕا لەو کارەساتەدا گیانیان لەدەست دا، بۆیە هەر ئەو ڕۆژەی ئەو هەواڵەی پێ گەیشت لەناوەڕاستی هۆڵەکەدا پەرکەم لێی داو کەوت بەزەویداو کەف لەدەمیەوە هاتەدەرێ، ئیدی تاوەکو ئەو ڕۆژەی کە ئازادیان کرد ڕۆژانە پەرکەم لێی دەدا ئەوەش یەکێک بوو لەو هەواڵە جەرگبڕانەی کە لەودیو دەرگا ئاسینەکانی بەندیخانەوە بیستمان و خەمێکی گەورەو قوڵی لەناخماندا دروست کرد،تەنانەت زیندانیە عەرەبەکانیش بەو هەواڵە ناسۆرە نیگەران بوو بوون ودەم نادەمێ دەهاتن سەرەخۆشیان لەئێمەو زیندانیە هەڵەبجەییەکان دەکرد.

ئێستا بەتەواوی لەیادم نییە نازانم دروست لەچ ڕۆژێکی مانگی نیسان یاخود ئایاری ئەوساڵەدا بوو، دووبارە قەرەوێڵە لەبەردەم بنکەی تەندروستی بەندیخانەدا ریزکراو تاقمێک هاتن بەو مەبەستەی جارێکی تر خوێن لەزیندانیەکان بستێنن،هەمان سیناریۆ سەرلەنوێ سەرەتا بەقسەی خۆش و چەند موحازەرەیەک لەسەر نیشتمان پەروەری!! داوای خوێنیان کرد بۆ سەربازانی بەرەکانی شەڕ ئەمجارەش کۆمەڵێک زیندانی بەئارەزووی خۆیان چوونە پێشەوەو خوێنیان بەخشی، بەڵام ئێمە ئەو (١٠٥) کەسی پێشوو لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەزیندانیەکانی تریش کەسمان خوێنمان نەدا،بەڵام ئەمجارەیان وەک جاری پێشوو فشاریان نەخستینە سەرو زۆریان لێ نەکردین بۆ خوێنبەخشین وەلێ لەسزای ئەو هەڵوێستەمان پاش چەند ڕۆژێک کۆمەڵێک لەپاسەوانان هاتن و لەخۆڕا دەستیان کرد بەگواستنەوەو شوێن گۆڕکێی زیندانیەکان، بێگومان مەبەستیان ئەوەبوو هیچ گروپ و کۆمەڵە زیندانیەک پێکەوە ڕێک نەکەون.

ئەوەبوو هاتنە هۆڵەکەی ئێمەو چەند زیندانیەکیان لە هۆڵەکانی ترەوە

هێناو ئینجا ناوی چەند زیندانییەکیان لەهۆڵی ئێمە خوێندەوەو فەرمانی دا ئێمە یاتاخو کەلوپەلەکانمان بهێنینە دەرەوەو ئەوانەی تر بچنە شوێنی ئێمە، لەو هۆڵەی ئێمەدا من و ئەم ناوانە فەرمانمان پێ درا کە لەو هۆڵە نەمێنین: (نزارە سەر سپی، ئەرسەلان قرگەیی و هەڤاڵی عەریف عەلی وچەند برادەرێکی عەرەب لەوانە ئەبو هندو ئەبو مەروان و تەلال، هەروەها چەند زایندانیەکی مەسیحی وەکو ناپلیۆن و عەبدولئەحەد فرەنسۆ) ئەوەبو ئێمەیان لەنێو هۆڵەکانی تردا دابەش کرد، هەموویان جێگەیان بۆ دیاری کرا تەنها من و فورات و کەسێکی تر بێ جێ و رێ ماینەوە، هەتا دەرەنگانی شەو چاوەڕوان بووین هەر شوێنیکیان بۆ نە دۆزینەوە بۆیە شەو بەتوڕەییەوە (عەلاء ئەلعانی) پاسەوانم بانگ کردو گوتم: (ئێمە شوێنمان نییە لەکوێ بخەوین؟) عەلاء خۆی زیندانی بوو، بەڵام وەک چاودێرو سیخوڕ بەسەرمانەوە بوو، کەچی پاش سەعاتێک گەڕان ڕاڕەوی بەر ئاودەست خانەکەیان بۆ دۆزینەوەو دووشەو لەوێندەرێ ئێمەیان خەواند، تاوەکو (٤٠٠) زیندانی مەحکوم بەمادەدەی (٢٢٥)ی یاسای سزاکانیان لەهۆڵەکاندا گواستەوە بۆ بەشی قورس و کەمێک هۆڵەکان چۆڵەوانیان تێ کەوت و رۆیشتمەوە ناو هۆڵ جێگەی خۆم کردەوە.

## دوو خوشک لەژووری ئیعدامدا

ماوەیەک دوای ئەو ڕووداوانە ڕۆژێکیان پیاوێکی تەمەن نزیکەی (٦٠) ساڵی عەرەب و کوڕێکی گەنجی تەمەن ٢٠ ساڵیان هێنایە ناو هۆڵەکەی ئێمەوە، خەمی روخساری هەردووکیان کێوی لەبن دەهێنا، پیاوەکە یەکجار نورانی و روح شیرین گەنجەکەش هێمن و لەسەرخۆ، کەهاتنە ژوورەوە هەموومان بەپیریانەوە چووین و رێزێکی زۆرمان لێ گرتن، بەڵام ئەوان زیاتر دڵیان بەئێمەی خەڵکی کوردستان دەکرایەوە ئەو پیاوە بە ئەبو قەیس بانگیان دەکردو کوڕەکەش کە کوڕی خۆی بوو ناوی قەیس بوو، ئەمانە بەزیندانی هەتا هەتایی حوکم درابوون، بەڵام دووکچی ئەبو قەیس کە یەکێکیان پزیشک بوو ئەوی تریان قوتابی کۆلیژی پزیشکی بوو، حوکمی ئیعدامیان بۆ دەرچوو بوو هەرلەبەندیخانەی ئەبو غرێب لەژووری ئیعدامدا

بوون. من زۆر لێیان نزیک بوومەوەو دەمویست بزانم ئەم باوک و کوڕو دوو کچە بۆچی گیراون، لەراستیدا ئەوانیش کوردیان زۆر خۆش دەویست بۆیە متمانەیان پێ دەکردین ڕۆژێکیان لەقەیسم پرسی: (لەسەرچی گیراون؟) کەچی قەیس دڵی پڕ بوو ئاخێکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: ( گرفتەکە من نیم،بەڵام من بەزەییم بەو باوکە بەتەمەنەم و ئەو دوو خوشکەمدادێتەوە کە لەژووری ئیعدامدان) منیش چیتر نەمتوانی پرسیاری لێ بکەم و برینی بکولێنمەوە بۆیە بێ دەنگیم لێ کرد، ئەو باوک و کوڕە بەو شێوەیە لەگۆماوی خەفەتدا بێ دەسەڵات مانەوە تاوەکو ئەو ڕۆژەی کەس و کاریان هاتنە دیدەنیان. ئەوانیش خێزانی ئەبو قەیس کەدایکی دووکچە کەش بوو پیرەژنێکی روخسار خەماوی و پڕ سۆز بوو لەگەڵ دوو برای قەیس، هەر کەهاتنە هۆڵەکەوە هەمووباوەشیان بەیەکدا کردو دەستیان کرد بەگریان گریانێک کە مرۆڤ لەئاسنیدا دەتوایەوە ئێمەش خەمبار بووین هەندێک دڵنەوایمان دانەوەو دەمێ ک لەتەکیاندا دانیشتین، دوای ئەو دیدەنیە ئەبو قەیس ڕۆژ بەڕۆژ لاوازترو بێ تاقەت تر دەبوو کارو کردەوەی ڕۆژانەی تەنیا خەون و جگەرەکێشان و نوێژکردن و گریان بوو، نزیکەی (٢٠) ڕۆژی بەسەردا تێپەڕی، ڕۆژێکیان سەعات (١٠)ی بەیانی پاسەوانەکان هاتن بەشوێن ئەبو قەیس و کوڕەکەیداو بردیانن نەماندەزانی بۆ کوێیان بردن ئەو پرسیارە لەسیمای هەموماندا دەخوێندرایەوە، پاش سەعاتێک قەیس بە باوەش باوکی هێنایەوە بە کوڵ دەگریان سەرەتا وامان زانی لە لێدان و ئەشکەنجەوە دێنەوە، هەنسک و هەناسە بڕکێی ئەبو قەیس و گریانی بەسۆی کوڕەکەی بواری نەداین پرسیاریان لێ بکەین، تا ئەو کاتەی وردە وردە هێواش بوونەوەو ئەبو قەیس بەنوزەی گریانەوە لەبەرخۆیەوە چەند جارێک دەیگوتەوە:( استغفر الله... لیش یا الله؟) دوای ئەوە هەندێ لەپاسەوانەکان هاتن و پێیان ناخۆش بوو کە ئێمە دڵنەواییان دەدەینەوە، بۆیە لەو کاتە دا بڵاوەمان لێ کرد بەڵام دوای ئەوەی بەتەواوی هێور بوونەوە جارێکی تر چوومەوە لایان لەقەیسم پرسی:(چی بووە لەکوێ بوون بۆچی بەگریان و بەباوەش باوکت هێنایەوە؟) قەیس لەوەڵامدا گوتی: ( ئەمڕۆ هەردوو خوشکەکەم ئیعدام دەکرێن، کەسوکارم لەدەرەوە واسیتەیەکی گەورەیان کردبوو بۆ ئەوەی خوشکەکانم بەر لەئیعدام کردنیان من

وباوکم ببینن، ئیدی ئێمە چووینە لایان و لەگەڵ یەکتریان بینی گریاین بەسەریەکدیدا خوشکەکانم زۆر بەستەزمان بوون خۆیان دابوو بەسەرسنگی باوکماو بەگریانەوە دەیانگوت: (بابە گیان گەردنمان ئازاد کە)، ئیدی باوکیشم کە ئەو دیمەنانەی بینی ئەژنۆی شکاو لەقاچ کەوت) پاش ساتێک بێ دەنگی قەیس بەدڵێکی پڕەوە گوتی: ( رەنگە ئێستا دوو خوشکەکەم ئیعدام کرابن).

ئیدی ئەبو قەیسی جەرگ سووتاو تادەهات دەم وچاوە نورانیەکەی چرچ و لۆچی زیاتری تێدا دەردەکەوت وهێدی هێدی پیری توندتر بەرۆکی دەگرت، مانگی تەموز داهاتبوو هۆڵەکە گەرم و گۆڕەپانەکان لەو گەرمتر، بەیانیەک زوو لەخەو هەڵیان ساندین بۆ سەرژمێر کردن ویەکە یەکەو دەستەدەستە هۆڵەکەیان بەجێ دەهێشت، بەر لەوەی بچینە دەرەوە گوێمان لێ بوو قەیس چەند جارێک بانگی باوکی دەکرد بۆ ئەوەی لەخەو رابێ و بچنە دەرەوەی هۆڵەکە، ئێمە بەرێوەبووین وەختێکمان زانی قەیس هاوار هاواری گریانی لێ هەستاو دەیگوت: (خەڵکینە باوکم مرد) ویستمان بگەرێینەوە، بەڵام پاسەوانەکان بە پاڵ بردیانین بۆ گۆڕەپانەکەو ریزیان کردین، پاش چەند دەقیقەیەک تەرمی ئەبو قەیسیان لەبەتانیەکدا بەبەردەمماندا هێناو بردیانە دەرەوەی بەندیخانە. دوای ئەو رووداوە تاوەکو مانگێکیش ئێمە هەر لەگەڵ قەیس خەریک بووین دڵنەواییمان دەدایەوە، قەیسی بەستەزمانیش رۆژ تا ئێوارە بەسەر پێخەف و جل وبەرگەکانی باوکیدا دەگریاو بۆنی هەڵدەمژین، دیمەنی ئەو گەنجە بیست ساڵەم هەرگیز بیر ناچێتەوە ئەو رۆژانە وەک تاڵترین بیرەوەرییەکانی ژیانم هەمیشە وەک فیلمێکی سینەمایی لەبەرچاومدایە.

## مادە بێهۆشکەرەکان لەبەندیخانەدا!

بەندیخانەی ئەبو غرێب، دنیایەکی نامۆو پڕ لە رووداوو کارەسات و نیگەرانی بوو، وەک لەسەرەتادا باسم کرد پیاوانی جەلادو پاسەوانانی ئەو بەندیخانەیە، بەرێنمایی گەورەکانیان دەیان و بگرە سەدان شێوازی کەموێنەیان هەبوو، بۆ ئەوەی زیندانیەکانی پێ ئازار بدەن و لەرووی دەروونیەوە بیانکەنە مرۆڤێکی داڕوخاوو بێ ئیرادە، یەکێک لەو

شێوازانەی ئەشکەنجانەی کە هەرگیز عەقڵم بۆی نەدەچوو ، بڵاو کردنەوەی حەب و دەرمان و مادە بێهۆشکەرەکان بوو بەنهێنی لەنێو هۆڵەکانی بەندیخانە و خودی زیندانیەکاندا.

بێگومان ڕژێمی عێراق بە پیلانێکی داڕێژراو ئەو مادانەی بڵاو دەکردەوە لەنێو زیندانیەکاندا بۆ ئەوەی لەسەر خواردنی ڕابێن ولەکاتی پێویستدا سوود لەهەندێ زیندانی وەربگرن.

وەک باسم کرد بەدرێژایی ئەو ساڵانە هەمیشە چەند زیندانیەک هەبوون لەنیو هۆڵەکاندا کاری سیخوڕیان دەکرد بۆ بەرژەوەندی بەرپرسانی ئەمنی بەندیخانە، لەوانەی کەزۆر ناسرا بوون ،(بەخیت لازم و هادی ناسرو عەدنان زوهێر)بوون هەر هەرموویان عەرەب بوون ئەمانە کاریان ئەوەبوو کە بەنهێنی ئەو حەب ودەرمانە بێهۆشکەرانە لە هەندێ بەرپرسانی ئەمنی بەندیخانە وەربگرن وبەنێو زیندانیەکاندا بڵاوی بکەنەوە بەتایبەتی ئەوکەسانە لەسەر خواردنی ڕابێن کەبەرپرسان مەبەستیان بوو فێربن، لەو هەوڵەدا کەسانێکی زۆر بوونە قوربانی، بەڵام خۆشبەختانە بەدرێژایی ئەو ماوەیە تاقە کوردێکیان لەو بوارەدا پێ هەڵنەخەڵەتا ئەو حەبە بێ هۆشکەرانەی بڵاویان دەکردەوە بریتی بوون لە( ئارتین، سۆمادرین، مەگادۆن، ئەبو سەڵیب) کە ئەوی دواییان ناوی میللی و بازاڕی حەبەکە بوو نەک ناوی زانستی، بەهەر حاڵ ئەوەش یەکێک بوو لەشێوازەکانی ئەشکەنجەی زیندانیەکان و ماوەیەکی زۆر لەئارادابوو.

## ئاسۆ لەژووری مەحجەردا

ساڵی ١٩٨٨ یەکێک بوو لە ساڵە هەرە ناخۆشەکانی ژیانی نێو بەندیخانەی ئەبو غرێب، کێشە و گرفتی سیخوڕکان لەنێو هۆڵەکانی بەندیخانەدا یەکجار زۆر بوو بوو، بێگومان هاوکات دەنگوباس و ئەگەری بڕیاری لێبووردنی گشتی! لەئارادابوو. بەیانیەکیان لەتاوبێزاری لەو دۆخە، ئاسۆی عەلی نەجارِ (عەلاء العانی) بانگ کردو بەهەڕەشەوە پێی گوت: (بەس لەسەرمان بنوسن و شکاتمان لێ بکەن، بێ عەقڵ مەبن،خۆ دنیا هەتا سەر بۆ ئەمانە نامێنێ، بەخودا ڕۆژێ لە ڕۆژان ئازاد بکرێین، هەر زیندانیەکانی ئێرە لەدەرەوە دەتکوژن) وەک باسم کرد عەلاء لەمێژبوو

بەتۆمەتی سیخوڕی بۆ وڵاتانی کەنداو حوکم درابوو، بەڵام هێندە لەدژی زیندانیەکان خزمەتی بەرپرسانی بەندیخانەی کردبوو ئەوانیش کردبوویان بەچاودێر بەسەر زیندانیەکانەوە. بۆیە ئەوبەیانیە خۆی لەئاسۆ عەلی نەجار گیف کردەوە ویستی هەڕەشەی لێ بکات، ئاسۆش دەستی لەخۆی شتبوو ئیدی نەیکردە نامەردی و هەرلەنێو هۆڵەکەدا عەلاء ئەلعانی خستە ژێر پێ لەقەوەو بەشەق و زللەو بۆکس ئەوەندەی لێ دا شل وکوتی کرد، ئێمەش بۆ ئەوەی ئاسۆ بەتەنیا تووش نەبێ هەر هەمووماں چووین بۆ عەلاء و هەر کەسێک بیگەیشتایە دوو سێ شەقی تێ هەڵ دەدا، عەلائیش هەر هاوار هاوارو ئای و ئاخ ئۆفی بوو لەبەردەمماندا، هەر چۆنێ بوو خۆی دەرباز کردو چووە لای پاسەوان وجەلادەکان شکاتی لێ کردین ئەوانیش هاتن بەدارو کێبڵ و سۆندە کەوتنە گیانمان و کردیانینەوە بەهۆڵەکەداو دەرگایان لێ داخستین.

هێشتا چوار ڕۆژی مابوو کەسو کارمان بێنە دیدەنیمان، پاسەوانەکان هاتن ناوی ئاسۆیان خوێندەوەو بانگیان کرد، بێگومان دەستبەجێ زانیمان ئەوە عەلاء شکاتی لێ کردووەو دەیبەن بۆ لێدان وئەشکەنە، ئاسۆش لەنێو هەموو زیندانیەکاندا بەکوردو عەرەبەوە کوڕێکی خۆشەویست بوو بۆیە کاتێ ناوی خوێندەوە هەموومان هەستاین و لەگەڵ ئاسۆدا چوینە پێشەوە، بەڵام یەک دووبرادەری عەرەب ئەوانەی ئاسۆیان زۆر خۆش دەویست ئامۆژگاریان کردین وگوتیان: ( کوڕینە وازبێنن و وەرنە دواوە با ئاسۆ تووشی گرفتی گەورە نەبێت، ئەگەر ئێوە وابکەن دوایی ئەوان دێنە سەر ئەو بڕوایەی کە ئاسۆ سەرکردەو پێشڕەوی زیندانیەکانی بێ شک لەو حاڵەدا گیانی ئاسۆ دەچێتە بەر مەترسیەکی گەورە) لەڕاستیدا ئەو برا عەرەبانە بۆچوونەکەیان ڕاست بوو، چونکە ئەگەر بەردەوام بووینایە (١٠٠٪) بەرپرسانی بەندیخانە بەو شێوەیە بیریان دەکردەوەو ئەوکاتە دوور نەبوو ئاسۆ ئیعدامیش کەن، بۆیە کشاینەوەو پاسەوانەکان ئاسۆیان بردو نزیکەی (١٠)ڕۆژ لەژووری مەحجەردا دایاننا، ئێمە خەممان بوو لەو بڕوایە دا بووین کە ئاسۆ زۆری لێدان خواردبێ، کەچی ڕۆژێکیان یەک لەپاسەوانەکان هاتە لامان و بەنهێنی پێی گوتین: (خەمتان نەبێ ئاسۆ هیچ لێی نەدراوە، بەپێچەوانەوە ئەفسەری خەفەر گوتبووی ئاسۆ دەستی خۆشبێ کە لەو

سەگبابەی داوە حەقی خۆیەتی!) لەماوەی ئەو ڕۆژانەدا دایکی ئاسۆ هاتە دیدەنی ئێمەش ڕووداوەکەمان وەکو خۆی بۆ گێڕایەوە، کەچی دایکی ئاسۆ وەک ئافرەتێکی کوردی سەربەرزو سەرفراز پێی گوتین: (گرفت نییە مادام کوڕەکەم لەسەر حەق ئازار دەدەن وبەرگری لەکەرامەتی خۆی و ئێوە کردووە من خەمی لێ ناخۆم ئێوەش هەر کوڕی منن وهەریەکێکتان ئاسۆیەکە بۆ من) بەراستی کە ئەم جۆرە هەڵوێستەم لەو دایکە بینی بەدەست خۆم نەبوو سەرم هێندەی چیایەک بەرز دەبۆوە، وام هەست دەکرد لەوپەڕی ئازادیدا دەژیم، پاشان بۆ ئەوەی ئاسۆ لەژووری مەحجەردا دەربهێنن دەبوایە عەلاء العانی برۆیشتایەو تەنازولی لەمافی خۆی بکردایە، نزیکەی هەفتەیەک بوو ئاسۆ لەمەحجەردا بوو بەیانیەک زۆر تکامان لەعەلاء کرد کەبچێت تەنازول بکات بۆ ئەوەی ئاسۆ بێتەوە ناو هۆڵەکە،کەچی عەلاء لەکەلی شەیتان نەهاتە خوارەوەو بەقسەی نەکردین، بۆیە هەر ئەو بەیانیەش ئازادە قەڵەوی کەرکوکی چینێکی تری لەعەلاء داو ئەویش بەهەمان شێوە لەناوهۆڵەکەدا عەلائی خستە ژێر پێ لەقەوە، عەلاء دووبارە شکاتی کردەوەو پاسەوانەکان ئازادیان برد بۆ لێکۆڵینەوە کەچی ئازاد گوتبووی :(عەلاء بەئاشکراو بەشایەدی هەمووزیندانیەکان لەبەرچاوماندا جنێوی بەهەموو کورد داوە بۆیە لێی دەدەم) بێگومان لەو کاتەدا (ئەبو خەولە)گوێی لەقسەکانی ئازاد بوو بوو،بۆیە بەنهێنی هات و پێی گوتین: (ئەگەر هاتن لێیان پرسین، ئێوەش بڵێن عەلاء جنێوی بەهەموو کورد داوە) ئەو ئەبو خەولەیە پیاوێکی ڕێک و پێک و هێمن و مرۆڤ دۆستی خەڵکی موسڵ بوو، هەر چەندە موراسیلی ئەمنەکان و چێشت لێنەریشیان بوو، بەڵام لابەلا خزمەتی زیندانیەکانی زۆر دەکرد، بە هەر حاڵ کاتێ هاتن (٦-٧)کەسیان برد بۆ شایەدی ئەوانیش وتیان ڕاستە عەلاء لەبەیانیەوە جنێو بەکورد دەدات ئەوەبوو پاش ئەوە ئازادیشیان بردە ژووری مەحجەر و پاش دوو ڕۆژ ئازادو ئاسۆ بەسەلامەتی گەڕانەوە ناومان، لێدانی عەلاء لەچەند لایەکەوە سوودی هەبوو لەلایەکەوە ئەو دیاردەیە بووە باوو زیندانیەکان ئەوترسەیان شکاو هەر ڕۆژەی لەهۆڵێکدا لەسیخوڕەکانیان دەدا، لەلایەکی دیکەوە خودی سیخوڕەکان ترسیان لێ نیشت و ئیدی دەستبەرداری هەندێ کاروکردەوەو ڕەفتاری دژ بە زیندانیەکان بوون.

## وەستانی جەنگی عێراق - ئێران و لێبوردنی گشتی!

ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٨ لەشاشەی تەلەفزیۆنی هۆڵەکەو لەو بڵندگۆیانەی کەدەنگی رادیۆیان دەگواستەوە، گوێبیستی بەیاننامەی وەستانی شەڕی ئێران و عێراق بووین لەراستیدا دڵمان بەو هەواڵە خۆشبوو چونکە بەدرێژایی (٨)ساڵ ئەو جەنگە خەستە لە نێوان عێراق و ئێران لەئارادبوو بۆیە خەڵکانێکی زۆر بوونە سوتماکی ئەو شەڕە، لەو سۆنگەیەوە گەلانی عێراق زۆرتامەزرۆی وەستانی ئەوشەڕەبوون،بەڵام وەک هەواڵمان پێ دەگەیشت پرۆسەی ئەنفالکردنی گوندنشینەکانی کوردستان بەرفراوانترو خەتەرناکتر بۆتەوە، بێگومان تەلەفزیۆنیش هەر ڕۆژەی هەواڵی (بەزمانی خۆیان) پاککردنەوەی گوندێکیان لەیاخی بووان بڵاو دەکردەوە!!

ڕۆژانی وەستانی جەنگە خوێناویە هەشت ساڵەکەی نێوان عێراق و ئێران لەشارەکانی باشوورو ناوەڕاستی عێراق سەرتاسەر ئاهەنگ و بەزم و رەزم و سەما و خۆشی بوو، تەلەفزیۆن بەردەوام ئاهەنگەکانی سەرشەقامەکانی بەغداو وتار خوێندنەوەی سەدام حوسێنی پیشان دەدا بێگومان خۆشی و کامەرانی و ئاهەنگ گێڕانی خەڵکانی نیشتمانپەروەرو هەژار ولیقەوماوی عێراق ئەوەبوو کە ئیتر دێوەزمەی شەڕ لەوڵاتەکەیاندا نەماوەو چیتر کوڕەکانیان بەناحەق ناکوژرێن ولەو تەنگژە ئابووریەی ئەوجەنگە دروستی کردبوو رزگاریان دەبێت نەک لەبەرهۆکاری تر! تەنانەت لەنێو بەندیخانەشدا عەرەبەکان یەکجار دڵیان خۆشبوو جۆرە ئومێدێکیان لادروست بوو بوو دوو ئەفسەری سوپای عیراق یەکێکیان بەپلەی عەقیدو ئەوی تر بەپلەی عەمید کە لەسەر گفتوگۆیەکی ناوبەرەکانی شەڕهەریەکەیان بەحەوت ساڵ زیندانی حوکم درابوون، هێندە دڵنیان خۆشبوو لابەلا بە ئێمەیان دەگوت باش بوو ئەم ماوەیە لەبەندیخانە بووین ئەگینا ئێستا لەو شەڕەدا کوژرابووین و ئێسک و پروسکیشمان رزیبوو.

## لێبوردنەکەی مانگی ئەیلول!

دواجار ئەوەی زیندانیەکان چاوەڕوانی بوون ڕوویدا، نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٨٨/٩/٦ بوو ئەو ڕۆژە ڕێکەوتی هەینی دەکرد، لەنێو بڵاوکراوەی

دەنگوباسی تەلەفزیۆنیدا بێژەرەکە راپۆرتێکی دوورو درێژی سەبارەت بە کێشەی کورد بڵاو کردەوە، ئەگەرچی راگەیاندنی ڕژێمی عێراق هەمیشە راگەیاندنێکی چەواشەکارو سەر لێشێوێن بوو، بەڵام ئەو ڕۆژە لەو راپۆرتەدا کۆمەڵێ قسەی باشی لەمەڕ کێشەی کورد کردو هەندێ رستەی تێدابوو کەئەوە یەکەمین جاربوو لەمیدیای عێراقیەوە گوێبیستی بین، دوای ئەو پێشەکیە راپۆرت ئامێزە بڕیاری لێبووردنی خوێندەوەو تیایدا ئەوەی راگەیاند کە ئەولێبووردنە شمولی هەموو کوردێک دەکات تەنیا ئەوانەی لێ دەربچێ کە بەتاوانی دزی و پیاوکوشتن حوکم دراون. دوای خوێندنەوەی ئەو بڕیارە ناو هۆڵی بەندیخانە یەک پارچە بووە هات و هاوارو هەلهەلەی خۆشی، هەمووان لەئاستی خۆمانەوە لەخۆشی ئەو بڕیارە هەڵدەپەڕین کوردو ئاشووری و تورکمان و ئەو کوردانەی بەئایین یەزیدی بوون گشتی بەجارێ ڕژاینە نێو گۆڕەپانی گەورەی بەندیخانەی ئەبو غرێبەوەو کردمانە هەڵپەڕکێ و گۆرانی گوتنێک ئەوسەری دیار نەبوو، تەنانەت کامێرای تەلەفزیۆن هات و ئەو ئاهەنگ و خۆشیەی وێنەگرت،هەریەک لەئاستی خۆیەوە باوەشی بە برادەرکەیدا دەکرت وماچی دەکردو پیرۆزبایی ئازادبوونی دەکرد، من لەخۆشیا دەگریام بیرم لەو ساتانە دەکردەوە کە خۆم دەکەمەوە بەشاری سلێمانیدا، بڕیارم دا بوو ئەگەر ئازاد بکرێم کۆڵان بەکۆڵانی سەرچنار ماچ کەم، ئیدی نازانم چۆن گوزارشت لەوخۆشی و شادی و بەختەوەریە بکەم کە تێکڕای زیندانیە سیاسیە کوردستانیەکان ئەو ڕۆژە تێیدا دەژیان.

پاش دەرچوونی ئەو بڕیارە تاوەکو سێ ڕۆژیش بەردەوام بەشی قەڵەم و دۆسیەکان لەبەندیخانەی ئەبو غرێب خەریکی وردبینی زانیاریەکان و رێکخستنی دۆسیەی تایبەتی زیندانیەکان بوون. لەسێیەمین ڕۆژدا بەرپرسێکی باڵای ڕژێمی عێراقی لەئاستی بریکاری وەزارەتدا سەردانی بەندیخانەی کردو لەگۆڕەپانی گەورەدا قسەی بۆ کردین و لەوتەیەکدا زۆر بەتوندی بەشێوەیەکی ناشایستە هێرشی کردە سەر سەرکردەکانی کوردو بەحسابی خۆی ئامۆژگاری کردین کەدوای ئەوان نەکەوین ئەگینا تووشی زیان دەبین!! لەکاتێکدا کە ئەو بەرپرسە قسەی دەکرد هەندێ لە زیندانیەکان لەبەر خۆیانەوە بەچپە چپ دەیانگوت: (خوا دەکات ئازاد دەکرێین، بەڵێن بێ ڕووبکەینە چیاو ببین بە پێشمەرگە هەتا کوردستان

ئازاد نەکەین نەگەڕێینەوە بۆ ناو شارەکان) هەر هەموومان تەنیا جانتایەکی بچووکمان ئامادەکردبوو هەندێ کەلوپەلی تایبەتی و پێویستی تێدابوو، بەو نیازەی ئازاد بکرێین و بڕۆینەوە بەرەو شارومالّەکانی خۆمان. دوای ئەوەی ئەو بەرپرسە گـوێرەپانی بەندیخـانەی بەجێ هێـشت ئـیدی بەبلّندگـۆ بانگەوازێکیان دەرکردو گوتیان:( ئەم ناوانەی دەخوێندرێنەوە بەپەلە بڕۆنە بەشی کۆنترۆڵ وخۆیان ئامادەکەن بۆ چوونە دەرەوە لەبەندیخانە) ئای لەو خۆشیەی ئەو ساتانە،حەزم دەکرد باڵ بگرم و خێراخۆم بگەینمەوە سلێمانی وام هەست دەکرد سەدان کەس چاوەڕوانمە، ئیدی بەبلّند گۆ دەستیان کرد بە خوێندنەوەی ناوی ئەو زیندانیانەی ئازاد دەکرێن خۆم وجانتاکەم ئامادەبووم دەمگوت ئێستا نا دەمێکی تر ناوی من دەخوێندرێتەوەو ئیدی دەرۆم... دەرۆم بەرەو دنیـای ئازادی وسـەربەست ژیان.. ناوی هەر زیندانیـەک دەخوێندرایەوە پڕ بە دەنگ لەخۆشیا هاواری دەکردو دەستی هەڵدەبڕی و زیندانیـەکانی تر چەپلّەیان بۆ لێ دەدا، چاوەڕوان بووم و ناوی من هەر نەخـوێندرایەوە هێـدی هێـدی گـوێرەپان چۆڵ بوو،بەلاّم ناوی من و چەندکەسێکی تر هەر نەبوو، وردە وردە ڕەش بین دەبووم، ئومێد لەدلّمدا نەدەما، ئەو جۆش و خرۆشە نەماو خەندەو پێکەنین لەروخسارمدا تۆرا (خودایە تۆ بلّێی منیش وەک هەڤالانم ئازاد بکرێم، ئاخر بەندیخانە وا خەریکە کەسی تێدا نامێنێ!) نەخێر هەموو برادەرەکانم خوداحافیزی و مالّئاواییان لێکردم و ناوی من هەر نەخوێندرایەوە وەخت بوو لەپێستی خۆم بێمە دەرەوە، هێندە دلّم بەخۆم دەسوتا. بەو شێوەیە ناوخوێندنەوە تەواو بوو پتر لەهەزار ناوی خەلّکی شارەکانی کوردستان خوێندرایەوەو منی تێدا نەبووم،ئینجا هەمان بلّندگۆ هەمان ئەودەنگەی ناوی برادەرەکانی خوێندەوە پێی گوتن بڕۆن ئازادبن هەمان ئەودەنگە فەرمانی بە ئێمەی بێ ناو دا کە بگەڕێینەوە بۆناوهۆلّەکانی خۆمان، وەکو شێتم لێ هاتبوو نەمدەزانی ڕوو بکەمە کوێ لەبەرخۆمەوە نەفرەتم، لەشانس و ناوچەوانی خۆم دەکرد، دەوروبەری سەعات ( ٥ )ی عەسر چووینەوە ناو هۆلّەکان ئای ئەو ڕۆژە هۆلّەکان چەند ڕەزایان قورس و گران بوو، زۆربەی هەرە زۆری قەروێلّەکان پێخەفی بێ خاوەن بوون زیندانیە ئازاد کراوەکان تەنیا جانتایەکیان بردەوە ئیدی هەمووشتێکیان بەجێ هێشتبوو ئەو ڕۆژە

هۆڵەکـــەم لێ بووە دۆزەخ، پێکەنین و قـــســـە خـــۆشـــەکـــانی برادەرە خۆشەویستەکانم وەک باڵندەیەک ڕۆیشتن و لەشەقەی باڵیان دا ڕۆیشتن و ڕۆیشتن و نەگـــەڕانەوە. بەڵێ ئەو بڕیاری لێـــبـــوردنە! تەنیـــا ئەو کوردستانیانەی گرتەوە کەبەنەتەوە کوردبوون و بەئایین موسڵمان، ئەگینا ئاشووری و کوردە بە ئایین ئێزدیەکانی نەگرتەوە، بێگومان ئەمەش گرفتێک بوو هەتا ساڵی (١٩٩٥)پێمانەوە نالاند ،کاتێ لێبوردن بۆ کوردەکان دەردەچو شـمولی ئەم کۆمەڵەی نەدەکرد دەیانگوت ئێوە سەر بەنەتەوەی عەرەبن!! کەچی کاتێ بڕیاری لێبوردن بۆ عەرەبەکان دەردەچوو هەر شمولی ئێمەی نەدەکرد دەیانگوت ئێوەلەسەر مەسەلەی کورد گیراون. بەهەر حاڵ ئەو ڕۆژە کەس قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد، سەروسیمای هەموومان ماندوو بێ تاقەت وشەکەت دیاربوو، تەواو بێ ئومێدبووین لەئازاد بوون لەدڵی خۆمدا دەمگوت:(دیارە ئەو (١٥) ساڵ زیندانیە لەناوچەوانم نووسراوەو هەردەبێ تەواوی کەم) هەڤالانم ڕۆیشتنەوە دووربەدوور پڕ بە دڵ خۆزگەم بە ژیانی ئەوان دەخواست، ئیرەییم پێ دەبردن دەمگوت ئێستا بۆ خۆیان لەسلێمانی لەنێوکەسوکاری خۆیاندا دادەنیشن و ئازادو سەربەستن. هەر دوو ڕۆژ دوای ئەوە دیسان بڕیارێکی لێبوردنی تایبەت دەرچوو ئەمجارەیان هەموو عەرەبەکانی گرتەوە، تەنیا ئێمەو ئەوانەی بەتاوانی سیخوڕی حوکم درابوون لەناو بەندیخانەدا ماینەوە،ئێوارەیەک بەرپرسی بەشی قەڵەمی بەندیخانە هاتە هۆڵەکەی ئێمەوەو پاش ئەوەی بۆ چەند ساتێک بەچاوێکی پڕ بەزەییەوە تەماشای کردین، دەستی کرد بەقسەکردن ودڵنەوایی دەداینەوەو پێی گوتین (ئەوە نووسراومان بۆ سەرەوەی خۆمان کردوە ، بۆ ئەوەی سەبارەت بە ئێوەش بڕیارێکی لێبووردنتان بۆ دەربکەن،بەڵام هێشتاوەڵاممان بۆ نەهاتووە) ئاخر ئەوەبوو تاوانی گەورەی نەتەوە گۆڕینی ئێمە کە حکومەت لەسەر ژمێریەکاندا بەعەرەب دەینووسین هەر ئەو تاوانەبوو ئێمەی بەو حاڵە گەیاند . هەموونەوانەی کەمابوینەوە بووبووینە قوربانی نوکە قەڵەم و مەزاجێک، چارەنووسی ئەو هەموو زیندانیە لەسەر ئەو نووکە قەڵەمە وەستابوو بێگومان قسەکانی بەرپرسی قەڵەم هێندەی تر بێ ئومێدی کردین ئیدی هۆڵی بەندیخانەکە چۆڵ بوو بەئارەزووی خۆت هەرجێیەکت پێ خۆشبووایە دەتتوانی لێی بخەویت چونکە وەک باسم کرد

قـەرەوێڵــەكــان بێ خــاوەن بوون، تـاوەكـو نزیكەی ( ١٠ )ڕۆژیش لەخـەم وخـەفـەتدا نانمان پێ نـەدەخـورا دوای ئەوە شـەوێكی درەنگ بەڕێوەبەری بەندیخانەی ئەبو غرێب بەیاوەری چەند پاسەوانێك خۆی كرد بە هۆڵەكەدا و سلاوی لێ كردین، ئینجا یەكە یەكە پرسیاری لێ كردین (خەڵكی كوێی؟ لەسەرچی گیراوی؟ حوكمەكەت چیە؟) ئینجا پرسی:( باشە بۆچی ئێوە ئازاد نەكران؟ )لەولاوە بەرپرسی قـەڵەم بەهێـواشی هۆكـارەكـانی تێگەیاند بەڕێوەبەری بەندیخانە سەری بەرز كردەوەو گوتی: ( براینە بڕیارەكە ڕوون و ئاشكرایە و هیچ پێچ و پەنایەكی تێدانییە، ئەو بڕیارە شمولی ئەو كوردانە دەكـات كـە لەسـەر مـەسـەلەی كـورد گـیراون، بێگومـان ئێـوەش كـوردنین و عـەرەبن! بۆیە ئەو بڕیارە ئێـوە ناگرێتـەوە!)ئینجـا یەك دوانێكمـان هـاتینە وەلام و گوتمان: (بۆچی ئێمە ناگرێتەوە؟ ئێمە لەناوچەی كوردستان لەدایك بووین و باو باپیـرانمان خـەڵكی ئەوێین و هەزاران سـاڵ پێش ئێـسـتـا هەر لەوێ ژیاون) ، بەڕێـوەبەری بەندیخــانە لەوەزیـاتر بـواری قـسـەكـردنی پێ نەداین وگوتی: (درێژەی مـەدەنێ وچیتر قسە مـەكەن ئەوە یاسایەو گفتوگۆی لەسـەر نیـیـە، پشت بەخـودا ئێـوەش ڕۆژێ لـە ڕۆژان ئازاد دەكـرێن) ئیـدی ڕۆیشت وبەجێی هێشـتین. بەڵێ بۆ كـۆمـەڵێ خـەم و بێ ئـومـێـدی و بێ هیـوایی بەجێی هێشـتین، لەو كـاتەدا خـەمی كـەس و كـارمـان بوو چونكە ئەوان نەیان دەزانی هۆی چیە ئێمە ئازاد نەكراوین.

ئیــدی بـارودۆخ بەم نـیـگەرانیــە بەردەوام بـوو، زیندانیــەكــان تووشی هێـدمـەیەكی دەروونـی بـوو بـوون، هەمـوو وەك مـرۆڤـێكی وڕوكـاس بەنـێـو گــۆڕەپان و هۆڵـەكــانی بەندیخــانەدا دەهاتـن و دەچوون، ئەو ســاڵە هەر لەســەرەتاوە بۆمن ســاڵێكی شــووم و پڕ لەنەهامـەتی و بەد بەختـی بوو، ئەوســاتانـە بۆ یەكـەمین جـارم بـوو دوای شـەوە ترسناك و پڕ ئازارەكـانی دائیرەی ئەمنی سلێمانی بیر لەخۆكوشتن بكەمەوە، چونكە خەم و پەژارەو بێ هیــوایی و هەست كـردن بە شكســتی تا ناوچەوانم هاتبــوو، تاكـە ئومێدێك كە دەم نادەمێ دڵخۆشی دەدامەوە ئەوەبوو كە زۆربەی هەرە زۆری ئەو زیندانیانەی كە لەگەڵمـا مابوونەوە لەهەڤالانی ڕێكخستنەكانی پارتی دیموكـراتی كــوردســتــان بوون، ئەگــەرچی هەمــوو ئەو بەڕێزانە لای من خۆشەویست بوون چونكە لەسـەر هەڵوێستی بەرزی شـۆڕشگێڕیی وگـیانی

خـەباتکاری کـەوتبـوونە ئەو شـوێنەوە، بەڵام بەدەست خـۆم نەبوو هەرلەسەرەتای ڕۆژانی ژیانی بەندیخانەوە خولیام بەوانەوە گرتبوو،چونکە هاوخەبات وهاوڕێباز و هاودەم و هاوخەم و هاو خۆشیم بوون و هەمیشە پشت و پەنای یەکتری بووین. ئەوانەی ئێستا ناویانم لەیاد ماوەو ئەو ڕۆژانە دەگـەڵ مندا لەبەندیخـانە مـابوونەوە بریتی بوون لە: (ئەمین ئیسماعیل، جەلال حەسەن ڕەشۆ، تەمەر شەمدین، بوکۆ سلێمان، (و)کەتاوەکو ئێستاش لەبەندیخانەدایە، مەجید شاکر، شێخ سلێمان، شێخ حەسەن سنجاری، د. دەرغام و ویسامی برای، سەلام مەدلول، عەزیز لازار، فوئاد هورمز، وەلید حەداد، سامی توعمە، ناپلیۆن، حەسەن، عەبدولئەحەد فرەنسۆ، بوترس نانۆ، تۆما زێباری، باوکی شەهید یوسف تۆما، حەسەن سالح جەبر، عەبدولڕەزاق سەعد حەرەج، سەمیر شەمعون، فورات، تەلال،چۆنی، لەتیف، فرانسیس، گۆرگیس)ئیدی زۆری تر بوون کە ئێستا ناویانم لەیاد نەماوە. هەروەها ئەو عەرەبانەی کە لەسەر حزبی شیوعی گیرابوون هیچیان ئازاد نەکران. تاماوەیەکی زۆر بەوشێوەیە بەردەوام بووین و هیچ زیندانی نوێیان نەدەهێناو کەسیش لەئێمە ئازاد نەدەکرا، بەڵام لەکۆتایی ئەوساڵەدا کۆمەڵێ گەنجی کوردی خەڵکی سلێمانیان هێناو لەناو هۆڵەکەدا شوێنیان کردنەوە،کاتێ باسی چۆنێتی گرتنیان بۆ گێڕامەوە، خەمێکی گەورەیان بۆ دروست کردم چونکە وەک باسیان کرد ئەوان هیچ یەکێک لەو تاوانانەیان ئەنجام نەداوە کە دراوەتە پاڵیان،هەرچۆنێ بوو بەو شێوەیە ئەو یەک دوو مانگەمان بردە سەرو ژیانی ئاساییمان تێ کەوتەوە،چونکە ئیتر هاتینە سەر ئەو بڕوایەی کە ئێمە ئازاد ناکرێین هەتا ماوەی حوکمی خۆمان تەواو نەکەین، بەو شێوەیە ساڵی ١٩٨٨یشم لەنێو بەندیخانەی ئەبو غرێبدا لەشاری بەغدا بردەسەر.

# ساڵی ۱۹۸۹ دەسگیرکردنی ئەفسەرانی پلەدارو کەسایەتیە ناودارەکان

چەند ڕۆژێک بەر لەسەری ساڵی نوێ شەوێکیان تابەیانی خەوم لێ نەکەوت، گریەکی گەورە لەسەر سنگم دروست بوو بوو تاوەکو تێرتێر بەکوڵ نەگریام ئەو گریە نەڕەوییەوە، بۆ سبەی کەسوکارم هاتنە دیدەنیم و چوکلێت وشەربەت و شیرینیان بۆ هێنام بۆ شەوی سەری ساڵ، ڕۆژانە لەناو یەکتردا دڵنەوایی یەکتریمان دەدایەوە هەندێ جار لەئاوێنەوە تەماشای روخساری خۆم دەکرد، وردە وردە ڕیشم دەهات و سمێڵم بۆرکرد بوو، ئاخر کاتێ دەسگیرکرام منداڵ بووم، هێشتا مووم لێ نەڕوابوو،کوێرا ئاوا گەورە بووم،من لەبەر مەینەتی وئازارەکانی نێو بەندیخانە، بیری تەمەنم نەمابوو ئەوە بۆ سێ ساڵ دەچێ من لەم دیو دەرگا ئاسنینەکانی بەندیخانەوە ڕۆژ و هەفتەو مانگەکان دەبژێرم، هەموو لەتەمەنم دەروات بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەم، خوایە دەبێ (١٥)ساڵ چۆن بەرێ بکەم، بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ دوای ١٥ ساڵ زیندانی بڕۆمەوە سەرچنار کەس من دەناسێتەوە؟! هەندێ جار شیعرە بەرزەکەی هێمنم بیر دەکەوتەوە (ئەی ئەوانەی قەت لەبیرم ناچنەوە.. ئێستا ببینن ئەرێ ئەمناسنەوە؟).

بەهەرحاڵ شەوی ١٩٨٩/١/١ هەر لەئێوارەوە خۆمان ئامادەکرد، لەنیوەشەودا ئاهەنگێکی خۆشمان سازدا بەدەم خواردنی شیرینی و شەربەت و جەژنە پیرۆزە لەیەکتری و قسەی خۆش ونوکتەو بەسەرهاتی سەیرو سەمەرەوە ئەو شەوەمان بردەسەر، بەڵام هەموو جارێ کەدەهاتینەوە سەرباسی سیاسەت و بیرکردنەوە لە ئازادبوونمان تووشی بێ ئومێدی دەبوینەوە. ئیدی بەشێوەیەکی گشتی ١٩٨٩ بۆمن کەمێک ئارام و بێ

گرفت بوو، پاسەوان وجەلادو ئەفسەرانی ئەمنی نێو بەندیخانە جارناجارێ دەگۆڕان، بەڵام ڕەفتارەکان هەر وەکو خۆی بوو، شێوەی ڕەنگ و ڕوو دەم و چاوەکانیان دەگۆڕا، بەڵام عەقڵیەت و بیرکردنەوەکان بەجێگیری مابۆوە.
ئەو ساڵە ساڵێکی ئینقیلابی بوو لەباری دەروونیماندا، هەندێ جار ورەمان دادەتەپی وجاری واش هەبوو ۱۸۰ پلە بەرز دەبۆوە، کەتەماشای تەلەفزیۆنمان دەکرد لەراگەیاندنی حکومەتی بەعس دا وەک هەمیشە (بەهار لەچۆکان بوو!) لەبەرزترین ئاستدا باسی گوزەران و بژێوی و ئاسودەیی وکامەرانی خەڵکی عێراقی دەکرد، ئەگەر کەسێکی نەشارەزا گوێی لێ بگرتایە وای دەزانی بەغدا بووەتە پایتەختێکی هەرە پێشکەوتوو خۆشگوزەران وئارام. ئێمە هەر کاتێ پێمان دەنایە ساڵێکی نوێوە کۆمەڵێ هەست و پرسیارمان لا دروست دەبوو، بەساڵانی رابردووی خۆماندا دەچووینەوە، دەمانگوت ئەوە ساڵێکی تریشمان لەم بەندیخانە ترسناکەدا بردەسەرو هێشتا ماوین و نەمردوین بیرمان دەکردەوە ئاخۆ کێ مردو کێ ئیعدام کراو کێ ئازاد کراو کێ ماوەتەوە؟! هەرچەندە ئەو ساڵە شەڕی نێوان عێراق-ئێران بەتەواوی وەستاو، تارادەیەک ئابووری عێراق ڕوولەبوژانەوەو نرخی کەلوپەل ڕوو لەهەرزانی بوو،بەڵام لایەنی بەرچاوی ئەو ساڵەی بەندیخانە دەسگیرکردن و زیندانی کردنی ئەفسەرە پلەدارەکانی سوپای عێراقی و ژمارەیەک لەکەسایەتی و شارەزایان و پسپۆڕانی بواری زانستی و هەندێ لەبازرگان ودەوڵەمەندان و سەرمایەدارانی عێراق بوو. بۆ نموونە بەرپرسێکی حزبی گەورە بەناوی(ئەبو زەین)ەوە کە لێپرسراوی مەنزومەی شیمال بوو ئەو کات لەهەولێر دادەنیشت لەسەرەتای ئەو ساڵەدا گرتیان و هێنایانە هۆڵەکەی ئێمەوە، د. حەقی کە پزیشکی تایبەتی عەدنان خەیرۆڵا و پسپۆڕی نەخۆشیە دەرونیەکان بوو،د. محەمەد کوڕی د. حەقی بوو ئەوانیش هەر لەهۆڵەکەی ئێمەدا زیندانی بوون، هەمان مانگ کۆمەڵێ بازرگانی ناودارو دەوڵەمەندی عەرەبی عێراقیان هێناو لەبەشی (چێشتخانە ۲) توندیان کردبوون (بەشی چێشتخانەی ۲) پێشتر بۆ چێشتخانە دروست کرابوو،بەڵام پاشان کردیانە هۆڵێکی بەندیخانەو زۆربەی دەوڵەمەندان وسەرمایەدارانیان لەوبەشە توند کردبوو. وردە وردە هۆڵەکانی بەندیخانە قەرەباڵغی و ئاوەدانی تێ دەکەوتەوە هەر ئەو ساڵە

لەمانگی ئایاردا کۆمەڵێک گەنجی کوردو ئاشوریان گرت وهێنایانن لەوانە (تاریق غەفور، هاورێ عوسمان، هاورێ (ل)، تۆنی، عیماد، بایز، قانیع چۆمانی، عەدنان، موحسین، مامۆستا نەسروڵلا، لوئەی، حاجی، عەلی، جەنگی، فەخرەدین، مەحمود، سەرکەوت، کەمال، وشیار،محەمەد رۆستەم، فەرحان حەریری، حەسەن حەریری) ئەمانە لەتەوقیف زۆریان لێ درابوو هەر هەموویان سەریان سفر کرابوو زۆربەی هەرە زۆریان خەڵکی سلێمانی بوون و سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی شیوعی و یەکێتی نیشتمانی و سۆسیالیست و حزبی زەحمەت کێشان بوون. لەو ساڵەدا یەکێک لەشێوازەکانی ئەشکەنجەی زیندانیەکان ئەوەبوو کە ڕۆژانە گۆرەپان و هۆڵ و ڕاڕەوەکانی بەندیخانەیان پێ پاک دەکردینەوە، ئەو زیندانیە نوێیانەی کە دەهاتن سەرەتا زۆر خەمبارو بێ تاقەت بوون، بەڵام کاتێ ئێمەیان ناسی وزانیان ئەوەندە ساڵە لەبەندیخانەداین کەمێک هێور بوونەوەو وردە وردە خۆیان لەگەڵ بارودۆخی ناهەمواری بەندیخانەدا ڕاهێنا. ئەوانەی کە زۆر بوونە برادەرم وهەڵسوکەوتی ڕۆژانەم لەگەڵ دەکردن بریتی بوون لە (هاورێ «ل» کە گەنجێکی ئازاو ورە پۆڵایین بوو، تاریق، هاورێ عوسمان ئەویش گەنجێکی ئازا بوو، بایز، قانیع چۆمانی کە کوڕێکی قسە خۆش و خوێنشیرین بوو) ئیدی وەک بڵێی حکومەتی بەعس دەیەوێ هۆڵەکانی بەندیخانە قەرەباڵغ کاتەوە، گرتنی خەڵک بەجیاوازی نەتەوەو رەگەزو ئایین و مەزهەب و بیرو ئایدۆلۆژیاوە بەردەوام بوو.. کورد، عەرەب، ئاشوری، تورکمان. ئیدی گەنج و پیرو هەرزەکار و هەموو شێوەیەک ڕۆژانە دەهێنران، زستانی ئەو ساڵە گورچیلەم ئازارێکی کەمەرشکێنی تێدا دروست بوو بەشێوەیەک کەم ڕۆژ هەبوو ئازاری گورچیلە زۆرم بۆ نەهێنێ و نەچمە بنکەی تەندروستی بەندیخانە،بەڵام هەموو جارێ چەند حەبێکی ئازارشکێنیان دەدامێ و تا ماوەیەک سوودم لێ وەردەگرت پاشان وەکو خۆم لێ دەهاتەوە. ڕۆژەبەڕۆژ ئازارم زۆرتر دەبوو، گورچیلەم هەوی دەکردو ئازاری میزەچۆڕکێ پتر تەنگی پێ هەڵدەچنیم زیاد لەجارێک پزیشک پێی گوتم:( گورچیلەت زیخی تێدا دروست بووەو پێویستە ئاو زۆر بخۆیت،بەڵام لەمانگی تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا ڕۆژێکیان ئازاری گورچیلەم هێندە زۆربوو نەمدەتوانی خۆم ڕاست کەمەوە لەتاو ئازار

وەک سەرەگۆیاڵ چەمابوومەوەو دنیا ڕەش بوو بوو لەبەرچاوم، بۆیە خۆم گەیاندە بنکەی تەندروستی بەندیخانەو ئەبو مەحمودی برینپێچ واستەیەکی زۆری بۆ کردم تاوەکو بمبەنە بنکە تەندروستیەکەی بەشی قورس، چونکە لەوێ پزیشکی چاک و داو دەرمانی باشی لێ بوو، ئازاری گورچیلە نان و ئاو و خەوو ژیانی لێ حەرام کردبووم، ئەوەبوو لەبنکە تەندروستیەکەی بەشی قورس پزیشکەکە پاش پشکنینی تەواو (٦)دەرزی بۆ نووسیم منیش گوتم ناتوانم دەرزی لەخۆم بدەم چونکە حەساسیەتم هەیە، پزیشکەکە بڕوای پێ نەکردم و یاریدەدەرەکەی بانگ کردو گوتی دەرزییەکی دەمار لەقۆڵی بدە، هەرکە یاریدەدەری پزیشکەکە دەرزییەکەی لێ دام دەستبەجێ مەچەکەم ئاوساو ئەستور بوو،ئەوەندەم زانی سەرم گێژی خواردو لەهۆش خۆم چووم، کاتێ بە ئاگا هاتمەوە لەبەردەم پزیشکەکەدا لەسەر کورسیەک دانیشتبووم، پاشان هەندێ حەبی کفلێکسی دامێ وئامۆژگاری کردم کە خۆم ماندوو نەکەم و وئاو زۆر بخۆمەوەو گەرم خۆم داپۆشم، داوام لەپزیشک کرد کە وەرەقەیەکم بداتێ بۆ بەرپرسانی بەندیخانە بۆ ئەوەی لەپاککردنەوەی بەندیخانەدا لەمن ببوورن و بەزۆر ئیشم پێ نەکەن، ئەوەبوو وەرەقەی دامێ و تاوەکو حەفتەیەک هیچ ئیشم نەکرد، بەڵام دوایی کە بینیم کارێکی زۆر کەوتۆتە سەر زیندانیە پیرو بەتەمەنەکان چیتر غیرەتم قبوڵی نەکرد من دانیشم و ئەوان ئیش بکەن، بۆیە دووبارە داوام لەچاودێر کردەوە کە بمبەنەوە بۆ ئیش کردن.

## سیخوڕەکانی ناوبەندیخانە

هەمان ساڵ لەمانگی کانوونی یەکەمدا نیوەڕۆیەکیان (١٠٣)کەسیان کرد بەهۆڵەکەدا ئەو (١٠٣)کەسە زیندانی نوێ بوون و هەر هەموویان کاتی خۆی سەربازی سوپای عێراقی بوون،بەڵام لەگەرمەی شەڕی عێراق-ئێراندا هەڵهاتبوون چووبوونە خاکی ئێرانەوەو هەندێکیان ماوەیەک لەوێ لەبەندیخانەدا بوون، پاشان بەبڕیارێکی لێبووردنی تایبەت لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە، هەر هەموویان گەڕابوونەوەو خۆیان تەسلیمی دەسەڵاتدارانی عێراق کردبۆوە، کەچی دەستبەجێ تێکڕا حوکمی زیندانی هەتا هەتاییان بۆ دەرچوو بوو. دیارترینیان گەنجێکی خەڵکی زاخۆ بوو بەناوی (بەرخۆ)وە

ئەم بەرخۆیە بەرلەوەی حکومەت داوای بکات بۆ خزمەتی سەربازی مامۆستایەکی زیرەکی زانکۆ بوو،کەچی پاش ئەوەی بوو بوو بەسەرباز لەسەرەتای ڕۆژانی ئەو جەنگەوە هەڵهاتبوو بۆ ئێران و لەوێش ماوەی هەشت ساڵی تەواو لەبەندیخانەدا مابۆوەو لەئەنجامدا عەقڵی تێک چوو بوو،کەچی لەسەرو هەموو ئەوانەشەوە کە گەڕابۆوە بۆ عێراق دیسان بە حوکمی زیندانی هەتاهەتایی پێشوازیان لێ کردوو وەختێ هاتە بەندیخانەی ئەبو غرێب شیرازەی عەقڵی تەواو تێک چوو. هەرلەو ماوەیەدابوو کۆمەڵێ زیندانی دیکەی کوردیان هێنا کە هەر هەموویان لەهەڤاڵانی پارتی بوون لەوانەی کەلەیادم مابن (عزەت، جەزا، سالاری حاجی عوسمان، هەڤاڵ خالید، والی مەحمودو دووکوڕی گەنجی تر کە خەڵکی چەمچەماڵ بوون) دوای ئەوانیش کۆمەڵێک زیندانی عەرەبی شیعەیان هێنا. بەهەر حاڵ هۆڵەکانی بەندیخانەی ئەبوغرێب سەرلەنوێ وای لێهاتەوە کەلەبەر قەرەباڵغی ئەزمەی شوێن هەبوو، بێگومان ئەم قەرەباڵغیە کۆمەڵێک دیاردەی دزێو سلبی لەبەندیخانەدا دروست دەکردەوە، لەسەرو هەموویانەوە دیاردەی سیخوڕی هەندێ لەزیندانیە عەرەبەکان لەبەرژەوەندی بەرپرسانی بەندیخانە و پیاوانی ئەمن.

دیسان شکات و شکاتکاری سەری هەڵدایەوەو هەر جارەی کۆمەڵێک زیندانیان دەبرد بۆ لێدان و ئەشکەنجە بەبێ ئەوەی بزانن لەبەرچی لێیان دەدرێت، کۆمەڵێک پاسەوان وئەمن و جەلادی نوێ هاتنە ئەبو غرێبەوە کە پیشەی ڕۆژانەیان لێدان و ئازاردان و سوکایەتی پێ کردنی زیندانیەکان بوو، هیچ جۆرە لێکحاڵیبوونێک لەئارادا نەمابوو، ئەو پاسەوانە تازانە خەڵکانێکی بەدڕەوشت و بەرتیل خۆر بوون وردە وردە لەنێو هۆڵەکاندا ترس و دڵەڕاوکێ دروست بۆوەو زیندانیەکان لەنێو خۆیاندا متمانەیان بەیەکتری نەمابوو، ئەوەبوو هەر لەو ماوەیەدا بەرپرسانی بەندیخانە فەرمانێکی نوێیان دەرکردو تیایدا بڕیاریان دا بۆ لەوەو دوا لەدوو زیندانی زیاتر نابێ پێکەوە قسە بکەن و دابنیشن و هاتوچۆ بکەن، ئەگەرچی هەندێ جار لێرەو لەوێ سەرپێچی لەو بڕیارە دەکرا،بەڵام هێندە ئەشکەنجەو سوکایەتی پێ کردن دژی سەرپێچی کار دەکرا ناچار دەبوو جارێکی دیکە هەڵەی لەو شێوەیە ئەنجام نەداتەوە، ئەوەی کە هەمیشە ئێمەی کوردستانی

شانازیمان پێوە دەکرد ئەوەبوو، کە ڕۆژێ لەڕۆژان یەکێک لە ئێمە لەنێو بەندیخانەدا کاری سیخوڕی بۆ بەرپرسان نەدەکرد، بەهەر حاڵ ساڵی ١٩٨٩ لەچاو ساڵانی رابردوودا ئارامتر بوو، کارەساتی جەرگبڕو خوێناوی کەشایەنی باس بێت لەوساڵەدا لەناو بەندیخانەدا ڕووی نەدا.

# ساڵی ۱۹۹۰ ساڵی ئازارو ئەشکەنجە

شـەوی سـەری سـاڵی ۱۹۹۰ وەک دوو سـاڵی رابردوو نە ئاهەنگە خنجیلانەکانمان گێڕاو نە کەس پیرۆزبایی لەکەس کرد، چونکە بە پێی ئەو بڕیارە نوێیـەی دائیـرەی ئەمنی بەندیخـانە نەدەبوایە لەدوو کـەس زیاتر پێکەوە بوینایە بۆیە وەک هەرشـەوێکی ئاسایی بەڕێمـان کـرد، بێگومـان بەندیخـانەش تا دەهات قەرەباڵغتـر دەبوو، ئەگەرچی ئازارەکەی گـورچیلەم وردە وردە بەرەو نەمـان وچاک بوونەوە دەچوو، بەڵام بێزاریم گـەیشـتـبـووە لوتکە، بارودۆخی ناوبەندیخـانەش بەرەو خـراپتـر و خـراپتـر دەچوو کارگەیشتە ئەوەی لەبەرچاوی زیندانیـەکانی ترەوە لەهەندێ کەس بدەن و ئەشکەنجەی پێ بگەیەنن، لە هەمووشی ناخۆشتـر ئەوەبوو کەس نەیدەزانی ئەم لێدانە بۆ چیـەو هۆی چییـە!! لەسەرەتای ئەو ساڵەدا رۆژێکیـان من و برادەرێکم کە زۆر نزیک بووین لەیەکەوە پێکەوە دانیشتبووین وقسەمان دەکـرد، ئەوەبوو دەرەنگانێ پاسـەوانێک هات بەشـوێنمـانداو بردیانین بۆ ژووری لێکۆڵینەوە. ئەفسەرەکـە کەپیـاوێکی زلی تێکسمڕاوو رەزا گران بوو،بەکێـبڵێکەوە بە بەردەمـاندا دەهات ودەچوو کـەوتە پرسیـار کـردن و گـوتی: (باشـە ئێـوە کـاتێ شـەوان پێکەوە دادەنیـشن باسی چی دەکـەن؟!) منیش ئەو پرسیـارەیم زۆر پێ نـاخـۆشبـوو بۆیە پێم گـوت: ( بێگومـان هەردووکمان خەڵکی شارێکین و ئەم هەموو ساڵە پێکەوە دەبین قابیلە دوو قسە نەکەین!!پاشان بۆچی هەردووکمـانتان گرتووەو لەنێو یەک بەندیخانەدا داتان ناوین؟!) ئەم وەڵامـە ئەفـسـەرەکـەی زۆر تووڕە کـرد، ئەوەبوو لەچرکـە ساتێکدا چەندین چرچ و لۆچی لەڕوخساریدا دروستبوو،دەستبەجێ دوای ئەو تووڕەبوونە خۆی وپاسەوانانی، بەکێبڵ و شەق و زللە کەوتنە گیانی

هەردووکمان، پاش ئەو لێدانە هەرلەژوورەکەدا نزیکەی یەک سەعات هەردووکمانی لەسەریەک قاچ راگرت و هەرجارێ ماندوو بوبنایەو قاچمان دابگرتایە دەکەوتنەوە لێدانمان بەکێبڵ، بەم شێوەیە تاوەکو سەعات (١)ی شەو لێیان داین وئازاریان داین ئینجا بەو زستانەو بەو سەرمایەی نێو راڕەو و هۆڵەکانی ئەوبەندیخانەیە یەکی یەک سەتڵ ئاوی ساردیان کرد بەسەرماندا، پاشان دوو پاسەوان بەکێبڵ و سۆندە کەوتنە گیانمان و راویان ناین تاوەکو گەیشتینەوە ناو هۆڵەکە هەرگەیشتینە ژوورێ عەزیز لازار هات بەرەو پیرم و باوەشی پێدا کردم، خودا هەڵناگرێ زیندانیەکان ئەوشەوە زۆر خزمەتیان کردین و جل و بەرگیان بۆ گۆڕین وخواردنیان داینێ. ئەو ماوەیە لەنێو هۆڵەکانی بەندیخانەدا هێندە خەڵکی خراپ و سیخوڕی تێدا بوو وای لێ هاتبوو کاتێ زیندانیەک دەبرایە ژووری لێدان وئەشکەنجە زیندانیە بەڕێزو نیشتمان پەروەرەکان زۆر خۆشیان دەویست وڕێزیان لێ دەگرت. هاوڕێ (ل) یەکێک بوو لەوانەی کەزیندانیەکان بەڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد، چونکە خزمەتی زیندانیەکانی زۆر دەکرد و کوڕێکی ئازاو چاونەترس و بەجەرگ بوو هەمیشە بەتوڕەیی وەڵامی پاسەوان و جەلادەکانی دەدایەوە بۆیە هەمیشە دەبرایە لێدان و سوکایەتیان زۆر پێ دەکرد، بەهەر حاڵ هەر لەو مانگانەدا دەنگۆی دەرچوونی بڕیاری لێبووردن هاتەئاراوە، لەسەروبەندی جەژنی لەدایکبوونی (سەدام حوسێن)دا، بڕیارێکی دیکەی لێبووردن دەرچوو نزیکەی (١٠٠)زیندانی لەحوکمە سوکەکان پێ ئازاد کرا، ئێمە ئەوەندە شارەزایمان لەبڕیارو یاساکاندا پەیدا کردبوو هەر کەلە تەلەفزیۆن بڕیاری لێبووردنەکە دەخوێندرایەوە دەمانزانی کێ دەگیرێتەوە و کێ ئازاد دەکرێت، هەر چۆنێ بووئەو ماوەیە دووبارە خومان دایەوە وەرزش،بەڵام هەندێ جار کە هەستیان دەکرد زۆر دڵمان بەو وەرزشە خۆشە ئەویشیان قەدەغە دەکرد.

## وەرزش وئاشنایەتیەک

یەکێک لەو زیندانیە عەرەبانەی کەزۆر برادەریەتیم دەکرد گەنجێکی روح شیرین بوو بەناوی (خالید عایش)ەوە، لەگەڵ خالید دا هاوتەمەن بووین

وهەرلەیەک تەمەنیشدا گیرابوین وکەوتبووینە بەندیخانەوە هەردووکیشمان لەنێو بەندیخانەدا گەورەبووین، بۆیە جۆرە رێزو سۆزو خۆشەویستیەک لەنێوانماندا هەبوو،خالید وەرزشوانێکی بەتواناو یاریزانێکی لێهاتووی گەمەی تۆپی پێ بوو،بۆیە پەیوەندی بەهیچ پرس و باسێکی سیاسیەوە نەبوو، تەنیا خەریکی گەمەکردن بوو، بەهاوکاری خالید عایش و چەند زیندانیەکی تر لەنێو بەندیخانەدا تیمێکی تۆپی پێمان دامەزراندبوو بەناوی تیمی (ئاشتی)یەوە، لەگەڵ هەموو تیمەکانی دیکەی بەندیخانەدا گەمەی تۆپی پێمان ئەنجام دەدا،جارێکیان داوامان لە بەڕێوەبەر کرد کە رێگەمان پێ بدات لەگەڵ تیپەکانی بەشی قورسی بەندیخانە گەمەی تۆپی پێ بکەین، ئەوەبوو هەندێ جار رێگەیان دەداین و هەندێ جاریش نەیان دەهێشت. پاسەوانانی بەندیخانەش تیمێکیان دروست کردبوو زۆرجار گەمەمان لەگەڵ ئەوانیشدا دەکرد، لەگۆڕەپانەکەدا لەکاتی گەمە کردن و راکەراک بەدوای تۆپدا، لەگەڵ پاسەواناندا سوعبەت و گاڵتەو گەپ وقسەی خۆشمان دەکرد، کەچی هەر لەگەڵ تەواو دەبوو ئەوان دەبوونەوە بەجەلادەکانی جاران و ئێمەش زیندانی بەردەست ئەوان، هەمان بەدرەفتاری و هەڵسوکەوتی نەشیاویان دژ بە ئێمە دەکردەوەو دەتگوت هەرئەوانیش نەبوون کە پێش چەند سەعاتێک گەمەو قسەی خۆشیان لەگەڵ دەکردین.
ئیدی لەو ماوەیەدا چەند ئەفسەرو پاسەوان وجەلادێکی زۆر خراپەکارو بەد فەساڵ وتوڕەو ناحاڵیان لەنێو ئەو بەندیخانەیەدا دامەزراند، بەتایبەتی (مولازم ئەحمەدو مفەوەز شەلال) ئەم دوو کەسە ئازاری زیندانیەکانیان زۆر دەداو رۆژانە سوکایەتیان پێ دەکردین، هەرشەوێک ئەوان ئێشکگربوونایە وامان هەست دەکرد کەلەژووری ئیعدامداین، رووی خۆشیان بەهیچ کەسێک نەدەداو لەفزی قسەی خۆشیان نەبوو،لەخۆڕاو بەبێ هیچ هۆیەک بیانویان بەزیندانیەکان دەگرت و دەیانبردنە ژووری مەحجەرو ئەشکەنجەو لێدان، بۆیە زیندانیەکان تێکڕا لەو دوو کەسە بەداخ بوون و چاوەڕوانی ئەو رۆژە بوون کەملیان بشکێن ولەو بەندیخانەیەدا نەمێنن، رۆژ تا ئێوارە بیرمان لە رێگەچارەیەک دەکردەوە کە ئەو ئامانجەمان بپێکین، بەڵام لەبەر سیخوڕەکانیان نەمان دەوێرا بەئاشکرا قسە بکەین، مولازم ئەحمەد و مفەوەز شەلال وێڕای ئەو هەموو خراپەکاریە دووکەسی بەرتیل خۆرو

چاوچنۆک بوون، ئیدی هەمیشە لەو بیرکردنەوانەدا بووین، تاوەکو ئەفسەرێکی بەشی هەواڵگری (مخابرات)ی بەندیخانەکەمان ناسی، بێگومان ئەو ئاشنایەتیمان لەگەڵ ئەو ئەفسەرەدا لەرێگەی گەمەی تۆپی پێوە پەیدا کرد، لەنێو بەندیخانەی ئەبو غرێبدا بەشێک هەبوو پێیان دەگوت بەشی هەواڵگری ئەو بەشە هەمیشە کۆمەڵێک زبندانی تایبەت بەخۆیان هەبوو لەهۆڵێکدا بەندیان کردبوون کە هەموو کەلوپەل و پێداویستیەکانی حەوانەوەی تێدا بوو. بەشی هەواڵگری بەسەر هەموو بەرپرسانی بەندیخانەو تەنانەت ئەمنەکانیشدا دەسەڵاتیان هەبوو،چونکە سەرنجمان دەدا تەنانەت ئەفسەران و پاسەوانان وجەلادەکانیش لەئەفسەرانی ئەو بەشە دەترسان ونەیاندەوێرا توخنیان کەون.

تەنانەت زیندانیەکانیشیان خەڵکی گەورەی بواری هەواڵگری بوون وبەسزا بەشێوەیەکی کاتی لەو هۆڵە خۆشانەدا زبندانی دەکران. ئینجا بەرپرسی بەشی هەواڵگری ئەو ئەفسەرە بوو کە پێشتر گوتم ئاشنایەتیەکی باشی لەگەڵ ئێمەدا هەبوو، رۆژانە دەهاتە گۆرەپانەکەوە گەمەی فوتبۆڵێنی لەگەڵ دەکردین و سات لەدوای سات زیاتر ئێمەی خۆش دەویست و رێزی لێ دەگرتین، هەمیشە لێی دەپرسین: ( کێ خراپە لەگەڵتان؟ کێ دەستریژیتان دەکاتە سەر؟ کێ بەرتیلتان لێ وەردەگرێ پێم بڵێن؟ ) هەندێ جار پێی دەگوتین (کێ لە ئێوە هەر شتێکی پێویستە هەر گرفتێکی هەیە پێم بڵێ)، بەراستی ئەو ئەفسەرە وەک لەرەفتار و گوفتاری نێو بەندیخانەیدا دەردەکەوت کەسێکی مرۆڤ دۆست بوو، تارادەیەکی بەرز لەوانی تر باشتر بوو. لەبەهاری ئەو ساڵەدا شەوێکیان ئەو ئەفسەرەو پاسەوانە تایبەتیەکانی سەردانی ئەوبەشەی کردبوو کە زبندانیەکانی بەتاوانی سیخوری حوکم درابوون،لێی پرسی بوون کێ خراپەتان لەگەڵ دەکات؟ ئەوانیش گوتوییان (عەبد) بەلێیانمان دەدات، ئەو عەبدە گەنجێکی عەرەبی نەفس نزم و بێ غیرەت بوو، بەڵام ئەویش وەک هەموو زیندانیەکانی تر لەبەندیخانە مەحکوم بوو،وەلێ سیخورێکی دڵسۆزی ئەفسەرە بەدرەفتارو بەرتیل خۆرەکان بوو، رۆژانە زیندانیەکانی بەلێیان دەداو زۆرجاریش هەرەشەی لێ دەکردن وبەرتیلی لێ وەردەگرتن بۆ خۆی و ئەفسەرو جەلادەکان، هەر ئەو شەوە ئەفسەری هەواڵگری عەبدی

بەتێهەڵدان بردبوو، بێگومان پیاوانی ئەمنی بەندیخانەش نەیان دەوێرا بەرگری لەعەبد بکەن.

بۆیە بردیانە بەشی هەواڵگری ولەوێ پاش لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەو لێدانێکی زۆر، عەبد هەموو راستییەکانی درکاندبوو بەتەواوی پێی گوتبوون کێن ئەو زیندانیانەی سیخوڕی بۆ ئەفسەرەکان دەکەن و بەرتیلیان بۆ کۆ دەکەنەوەو زیندانیەکان بەلێدان دەدەن،ئەوەبوو شەوی دواتر دەرگای هۆڵەکەمان کرایەوەو ئەفسەری هەواڵگرییەکەو پاسەوانە تایبەتیەکانی سەردانی ئێمەیان کرد، دووبارە لە ئێمەشی پرسی: ( کێ ئەزیبەتتان دەدات و بەلێدانتان دەدات پێم بڵێن؟ ) ئیدی لەپاڵەوە تێمان گەیاند کە گرفتی ئێمە( (عەلاء ئەلعانی و سەباح)ە، بێگومان ئەو دووکەسەش هەر زیندانی بوونو سیخوریان بۆ بەرپرسانی بەندیخانە دەکرد، ئەفسەری هەواڵگرییەکەش نەیکردە نامەردی و لەبەرچاوی ئێمەدا هەر لەناو هۆڵەکە خۆی وپاسەوانەکانی کەوتنە گیانی (عەلاءو سەباح) و چینێکی باشیان تێ هەڵدان ئینجا ئەفسەرەکە چاوی لێ سوورکردنەوەو بە پەنجە هەڕەشەی لێ کردن و گوتی: ( سەگبابینە بۆ واز لەو خەڵکە هەژارە ناهێنن... بەرەفتارە ناشرینەکانی خۆتان هەموویانتان کردووە بەدوژمنی حوکمەت، وەڵاهی لەمەودا یەک زیندانی بەلێدان بدەن و شکاتیان لێ بکەن وەکو سەگ دەتان تۆپێنم) ئیدی لەو شەوە بەدواوە لەو لێدان و ئەشکەنجەو سوکایەتی پێکردنە رزگارمان بوو،هۆڵەکانی بەندیخانە کەمێک هێمنی و ئارامی باڵی بەسەردا کێشا. لەدەوروبەری ناوەڕاستی مانگی نیساندابوو بەیانیەک پاسەوانان هاتن وسەرژمێرییان کردین، ئەوبەیانیە وەکو ڕۆژانی تر غەڵبە غەڵب ودەنگە دەنگ نەدەهات بارودۆخی ناوبەندیخانە بەگشتی نائاسایی بوو پاسەوانان و جەلادەکان زۆر بەهێواشی و نەختێک بەرێزەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکردین، لەناخماندا سەدان پرسیار سەری هەڵدابوو (چی بووە؟ چی ڕوویداوە؟ ئەم خامۆشیە چیە؟ تۆ بڵێی بڕیاری لێبوردن لەئارادا نەبێت؟ یاخود مەسەلەیەکی ترەو ئێمە ئاگاداری نین!)تەنانەت ئەو بەیانیە هەڵمەتی خاوێن کردنەوەش لەئارادا نەبوو. پاش سەرژمێری کردیانینەوە ناو هۆڵەکانمان سەعات (١١)ی هەمان ڕۆژ بەبڵند گۆ ناوی (عەبدو عەلاء ئەلعانی و بەخیت لازم و سەباح وچەند کەسێکی تر

لەسیخورەکانی ناو بەندیخانە) خوێندرایەوەو داوایان لێ کردن بچن بۆ بەشی کۆنترۆڵ،ئەوان ڕۆیشتنە دەرەوە سەرەتا لەو باوەڕەدا بووین کە ئازاد بکرێن، سەعاتێک دوای ئەوان هەمان بلند گۆ داوای لەتێکڕای زیندانیەکان کرد کە بچنە ناو گۆڕەپانی گەورەی بەندیخانەوە بۆ سەرژمێری کردنیان، کەچووینە گۆڕەپانەکەوە تەماشامان کرد هێزێکی گەورەی چەکدار دەوروبەری گۆڕەپانیان گرتووە، کاتێ لەگۆڕەپانەکەدا ریزبووین ئەفسەری هەواڵگرییەکە لەوێ بوو پرسیاری لەهەندێ لەزیندانیەکان کرد یەکێک لەوانە (د. حەقی)بوو کەبە ئەفسەرەکەی گوت: ( ئێستا قەیناکە ئێمە زیندانین و لەنێو ئەم بەندیخانەیە داین، بەڵام بڕوا بکەن تاوانەکەمان هێندە گەورە نییە کە سوکایەتیمان پێ بکەن و زیندانی شکات لەزیندانی بکات و بەلێدانی بدات!)دوای ئەو قسانەی، ئەفسەرەکە فەرمان دا هەموومان لەجێگەی خۆمان دانیشین، (١٠)دەقە دوای ئەوە دەدوانزە ئەفسەرو پلەدارو بەرپرسی گەورە هاتن کەدوایی زانیمان ئەوانە لە هەواڵگری وئەمنی گشتیەوە هاتوون، یەکێک لەو ئەفسەرانە کە پیاوێکی سپیلکەی مو زەرد بوو هەندێ قسەی بۆ کردین وبەحسابی خۆی موحازەریەکی نیشتمانیپەروەری داینێ! لەگەرمەی قسەکانیدا وەختێکمان زانی لەولای گۆڕەپانەکەوە (مفەوەز شەلال و مولازم ئەحمەدو نزیکەی (١٠)کەسی تر لەبەرپرسان و پاسەوانان وجەلادەکان)یان بەچاو بەستراوی وکەلەبچە کراوی هێنایە گۆڕەپانەکەوە، بێگومان ئەو دەدوانزە کەسەی کە بەو زەلیلیە هێنایاننە بەرچاومان هەر هەموویان لەو کەسانە بوون کەبەدرێژایی ئەو ماوەیە ئازاری زیندانیەکانیان دەداو بەخراپترین شێواز ئەشکەنجەیان دەدان، ئەو دیمەنەش یەکێک بوو لەئاوات وئامانجەکانی زیندانیە بەرێزو بەحورمەتەکان، ئیدی هەر تەماشای وەزعی شڕی ئەو پاسەوان و جەلادانەمان دەکردو سەرنجمان لەڕوخساری یەکتری دەدا: ( خودایە تۆ بڵێی ئەمە خەون بێت یان راستی؟!) بەش بەحاڵی خۆم لەشوێنی خۆمەوە چاوم هەڵدەگلۆفی،ئاخر بەراستی هەرگیز ئەم دیمەنەم بەخەویش نەدەبینی تۆ بڵێی ئەمە ئەو پاسەوان وجەلادو ئەفسەرە بەد فەسالانەبن و ئێستا وا بەزەلیلی لەبەردەمماندا بن؟! هەندێ جار بڕوام نەدەکرد، بەڵام کاتێ ئەفسەرەکە کەوتە قسە و هەندێ دێڕو دەستەواژەی لەزار دەرپەڕی قەناعەتم

کرد، ئەو ئەفسەرە رووی کردە زیندانیەکان و گوتی: ( براینە ئێوەش هەمووکوڕی عێراقن و پشت بەخودا ئەمڕۆ تا سبەی ئازاد دەکرێن) ئینجا دەستی بۆ مولازم ئەحمەد و مفەوەز شەلال و تاقمەکەی درێژ کردو گوتی: (ئەمانە هەرچی کارێکی خراپیان دژ بەئێوە ئەنجام داوە هەمووی بەفیت و بێناموسی و بەدڕەوشتی ئەو سەگانە بووە) کە گوتی: ئەو سەگانە دەستی بۆ ئەوبەری گۆڕەپانەکە درێژ کرد، دەمانویست بزانین ئەوسەگانە مەبەستی کێیە!! کەچی تەماشا دەکەین لەو لاوە بەهەمان شێوە بەچاو بەستراوی وکەلەبچە کراوی (عەلاء ئەلعانی و بەخیت لازم وسەباح وعەبدو زیندانیە سیخوڕەکانی تریان) هێنا، خۆشی وشادی و کامەرانی هێندەی تر لەدەروونماندا دروست بوو، هەر لەو کاتەدا پەل وچاوی سیخوڕەکانیان کردەوەو سەر لەنوێ ئەفسەرەکە دەستی بۆ درێژ کردن و رووی کردە ئێمەو هاواری کرد: ( لەدیدی ئێمەوە، ئێوە زۆر لەم بەدڕەوشتانە شەریفترن،چونکە رێز لەیاساکانی بەندیخانە دەگرن و بەبێ دەنگی رۆژان بەرێ دەکەن، دەزانین خەڵکانێکتان تێدایە ساڵانێکی زۆرە لەم بەندیخانەیەدان و هیچ گرفت و کێشەیەکتان دروست نەکردووە، بۆیە ئێمە وەکو حکومەت ئەو بەدڕەوشتیەیان لێ قبوڵ ناکەین).

بێگومان ئەو دیمەنانە کۆمەڵێ پرسیار و گومانی زۆری لا دروست کردین،بەڵام کە ئەوانەمان بەزەلیلی بینی زۆر ئاسوودە بووین، دوای ئەو قسانە بەرپرسەکان رۆیشتن وئەفسەرو جەلادو پاسەوانەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بردو زیندانیە سیخوڕەکانیان لەناو گۆڕەپانەکەدا بەجێ هێشت،هەندێک لەزیندانیەکانیان چوونە لای ئەفسەری هەوالگریەکەو لێیان پرسی: (ئەدی عەلاء ئەلعانی و تاقمەکەی چێ لێ دەکەن؟ خۆ ئەمانیش پیاوی ئەوان بوون) ئەفسەرەکە وەک بڵێی ئاماژەی سەوزی داینێ کە تۆڵەیان لێ بسێنینەوە، بە پێکەنینەوە پێی گوتین: ( ئارەزووی خۆتانە ئیسراحەتی خۆتان وەربگرن!) ئینجا رۆژ رۆژی تۆڵە سەندنەوە بوو، چووینەوە ناو هۆڵەکەو دەرگاکەمان داخست،هەر هەموو زیندانیەکان بەجارێ چووین بۆ سیخوڕەکان پێش هەموویان عەلاء ئەلعانیمان هێنا، هەرچی ئازای هەبوو بەشەق و بۆکس و زللە کوتامان، ئیدی داخی ئەو هەموو ساڵ زیندانی و ئازارو ئەشکەنجەیەمان لەوان کردەوە، یەکەیەکەی

سیخورەکانمان دەرس دا دا، هەر سیخوڕێک لەژێر پێ لەقەو تێ هەڵداندا لەهۆش خۆی دەچوو، پاسەوانەکان تەنیا ئەوەندەیان لەسەر بوو بەچواردەستە هەڵیـان دەگـرت ودەیانبـرد بۆ بنکەی تەندروسـتی. ئەو ڕۆژە وەک ڕاپەرینێکی جەماوەری وابوو، تاوەکو سێ ڕۆژ بەردەوام لەو سیخوڕانەمان هەڵدا، هەر زیندانیەک بێ تاقەت بوایە هەڵدەستایە سەر پێ و چینێکی لەسیخورەکان هەڵ دەدا.

بێگومـان ئێمـە هێندە دڕندە نەبووین،بەڵام مـەبەسـتمـان بوو هەمـوو زیندانیەکانی تر بەچاوی خۆیان ئازارو زەلیلی سیخورەکان ببینن وجارێکی تر کـەس جـورئەتی ئەوە نەکـات کـاری وا دزێوو نابەجێ بکات دژی زیندانیەکان.

دوای ئەو سێ ڕۆژە کۆمەڵێک پاسەوان و ئەفسەرو ئەمنی تازەیان هێناو لەبەندیخانە دایانمەزراندن، یەکێک لە ئەفسـەرەکان هات و گوتی:( بەسە ئیتر لە سیخورەکان مەدەن، تۆڵەی خۆتان وەرگرتەوە، با چیتر غەڵبە غەڵب و گـرفت و کـێـشـە دروست نەبێت) مـاوەی چەند مـانگێک بارودۆخی بەندیخانە کەمێک ئارام بوو، تەنانەت ڕیش هێشتنەوەش قەدەغە نەبوو، سەرژمێـری و هەڵمەتی خاوێنکردنەوەوکاروباری ڕۆژانە بەئاسـایی و بەبێ دەنگی بەڕێوەدەچوو، پاشـان لەسەر داوای ئێـمـە سـیخـورەکـانیـان لەبەشی تایبەتدا نەهێشت ولەناوماندا نەمان.

## داگیر کردنی کوێت وبارودۆخی بەندیخانە

لەسـەرەتای مـانگی(ئاب)ی ١٩٩٠دا دروست لەبەرەبەیانی ڕۆژی ٢/٨ی ئەو ساڵەدا سوپای عێراقی هێرشێکی بەرفراوان و پێشتر پیلان بۆ داڕێژراوی کردە سەر دەوڵەتی کوێت ولەماوەی چەند سەعاتێکدا عێراق دەوڵەتی کوێتی داگیر کرد، بێگومان ئەمە لەدەرەوەی بەندیخانە ،بەڵام ئێمە لەم دیو دەرگـا ئاسنینەکـانەوە سـیناریۆکـەمـان وا بیـست گـوایە چەند ئەفـسـەرێکی کـوێتی کـودەتایان دژی دەسـەڵاتدارانی کوێت ئەنجام داوەو عـێراق هاوکـاری کـردوون. بەهەر حـاڵ ئەوەی بەلای ئێـمـەوە گـرنـگ بوو چۆنێتی ڕوودانی ڕووداوەکە نەبوو، بەڵام زانیـمان حکومەتی عێراق پێی

نایە شەڕێکی نوێ وگەلانی عێراق ئاشوبێکی تر ڕووی تێ کردن، دیسان کارەساتەکان دووبارە دەبنەوەو، هێشتا خەم و ئازارو برینەکانی شەڕی عێراق و ئێران لەسەرجەستەی گەلانی عێراق تیمار نەبوو بۆوە... هێشتا دایکان وبوکە بێ هاوسەرەکانی ئەو وڵاتە بەرگی ڕەشیان فڕێ نەدابوو، جارێکی تر ڕژێمی عێراقی بەرەو کارەساتێکی نوێ و جەنگێکی دیکەی راکێش کردن، زیندانیەکان بەگشتی وعەرەبەکان و خەڵکی باشوور بەتایبەتی ئەژنۆیان شکا، تەواو بێ تاقەتی ئەو بارودۆخەبوون، دەیانزانی ئێستا کەس و کاریان لەناو بەرەکانی شەڕدان، پێشبینی ئەوەمان دەکرد کەسەر لەنوێ برسێتی وقات و قڕی بینەقاقای مرۆڤەکانی ئەو وڵاتە دەگرێت ومەرگەساتی گەورەتر بەڕێوەیە، بەهەر حاڵ ئەو بیروبۆچوونانەی ئێمە لەڕوخساری پاسەوانان و پیاوانی ئەمنی بەندیخانەشدا دیاربوو، ئەوانیش بێ تاقەت بوون،شەکەتی و ماندوویی نیگاکانی پڕ کردبوون، زیندانیەکان وەکو جاران ترسیان لەدڵدانەمابوو، هەریەک لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد پاسەوانانیش زۆر گوێیان نەدەدایە کاروباری ناوخۆی بەندیخانەکە، بەڵکو بەبیروهۆش هەموو لەدەرەوەی ڕووداوەکانی بەندیخانەیان دەڕوانی وچاوەڕوان بوون،کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی داوای لە عێراق دەکرد بکشێتەوەو کوێت بەجێ بێڵێ، عێراقیش بەنیاز بوو دەوڵەتی کوێت لەسەر نەخشەی جیهانی بکوژێنێتەوەو بیکاتە پارێزگای ژمارە (١٩)ی عێراق، پاسەوانەکان.. ئەفسەرەکان.. جەلادەکان تەنانەن هەندێ لە زیندانیەکان ترسیان لێ نیشتبوو تاکە ئومێدێکیش ئەوەبوو، بەڵکو دەسەڵاتدارانی عێراق پاش ئەم کردارەیان شوێنپێیان لەق بێت و زیندانیەکان بەو هۆیەوە بەدنیای ئازادی ئاشنابنەوە، بەڵام گرفتی سەرەکی ئێمە ئەوەبوو ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری سەپاندنی گەمارۆی ئابووری لەسەر عێراق دابوو، دەمانزانی ئیدی کەس وکارمان لەدەرەوە لەگرانیەکی کەم وێنەدا دەژین. ماوەیەک بەسەر ئەو ڕووداوانەدا تێپەڕی، بەیانیەک زوو پاش سەرژمێرکردن لەگۆڕەپانەکەدا هێشتیانینەوەو (د. ئومێد مدحەت موبارەک)ی وەزیری تەندروستی و کارەباری کۆمەڵایەتی حکومەتی عێراق،هاتە بەندیخانەو لەسەربانی یەکێک لەبیناکانی بەندیخانەوە، بەبڵندگۆ هەندێ قسەی بۆ کردین، بەڵام بەراستی

قسەکانی د. ئومێد وبارودۆخی ناهەمواری ئەو کاتی گەلانی عێراق، دووشتی زۆر لەیەک دوور بوون و بەهیچ یەکیان نەدەگرتەوە،بەتایبەتی لای ئێمەیەک کە مەینەتی ودەردەسەری نوقمی خەم و خەفەتی کردبووین تەنانەت هەندێ لەزیندانیەکان هۆی هایان لەقسەکانی کرد، ئێمەش وەکو خەڵکی کوردستان لەڕێی یاداشتنامەیەکەوە داوامان کرد بوو، کە هەوڵ بدرێت بمانخەنە بەندیخانەیەکەوە کەلە پارێزگاکانی باکور بێت، بۆ ئەوەی نزیک بین لەکەس وکارمانەوەو لەکاتی دیدەنیدا رێگایەکی دوور نەبڕن و خەرجی زۆر نەکەن. د. ئومێد کە یاداشتەکەی خوێندەوە بەبڵند گۆکە گوتی هەندێکتان وەرنە لای بەشی کارگێڕی باقسەتان لەگەڵ بکەم بزانم چیتان دەوێ، پاشان من وچەند کەسێکی تر چوینە لای بەشی کارگێڕی و کەوتینە قسەکردن لەگەڵیدا، من بەکوردی بە د. ئومێدم گوت:( ماڵمان زۆر دوورەو ئەوە پێنج ساڵە لێرەین، چەندین بڕیاری لێبوردن دەرچوو شمولی نەکردین و ئێمە هەر لێرە لەم ئەبوغرێبە ماوینەتەوە، کەسو کارمان گەربیانەوێ بێن بۆ دیدەنیمان زۆر ماندوو دەبن و ئەرکێکی زۆر دەکێشن) پاشان د. ئومێد گوتی:( باشە پێم بڵێن گوێتان دەوێ؟) هەموو پێکەوە گوتمان:( کەرکوک بێ،موسڵ بێ،هەولێر بێ گرنگ ئەوەیە لەم شوێنە دوورە نەمێنینەوە) د. ئومێد بەزەردەخەنەوە گوتی:( پشت بەخودا بەپێی توانا رێگە چارەیەکتان بۆ دەدۆزمەوە) ئەوەبوو رەنجمان بەفیڕۆ نەچوو،هەر هەفتەیەک دوای هاتنی وەزیری تەندروستی پاسەوانەکان هاتن و گوتیان کێ دەیەوێ بیگوازینەوە بۆ بەندیخانەی (بادوش) لە موسڵ با ناوی خۆی بنوسێت، ئەوەبوو ئێمە کە (١٠٨) کەس بووین لەدانیشتوانی شارەکانی سلێمانی وهەولێر و موسڵ خۆمان ناونووس کرد.

## ئازارەکانی ئەبو غرێب ئیتر ناتان بینم!

شەوی ١-٢/ ١٠/ ١٩٩٠ پاسەوانەکان ئاگاداریان کردینەوە کە خۆمان ئامادە بکەین بۆ رۆیشتن، ئەوەبوو هەر ئەوشەوە هەموو کەل وپەل و پێداویستیەکانمان کۆ کردەوەو خستمانە دوو لۆری گەورەوە کەلەگۆڕەپانی بەندیخانە وەستا بوون.

بۆ بەیانی زوو چوار پاسی گەورەیان هێنایە گۆڕەپانەکەوەو

سـەعـات(٦)ی بەیانی یەکـەیەکـە ناویان خـوێندینەوەو چووینە ناو پاسـەکانەوە، ئیدی پاسـەکان جوڵەیان کردو کـەوتنەڕێ، هێـواش هێـواش لەدەروازەی سەرەکی بەندیخانەی ئەبو غرێبەوە چوونە دەرەوە... ئیتر تەواو شەوە شووم و ترسناکەکانی ئەو غرێب، ئیتر تەواو ئازارە بێ کۆتاییەکانی ئەبو غرێب، ئیتر نایەمەوە ئەی ئەو برینانەی هەرگیز سارێژ نابن.. ئیتر نایەمەوە... بەکەماڵی ئیسراحەتەوە لەسەر کوشنە نەرمەکانی ناوپاسەکە دانیشتم ولەپەنجەرە کەپسەکانەوە تەماشای دنیام دەکرد، ئاخر لەو ڕۆژەی کە بە لاندگرۆزەرەکە منیان هێنا بۆ دادگایی کردن، لەو ڕۆژەوە ناو شارو دیمەنەکانی ئەو دیو دیواری بەندیخانەم نەدیبوو، هێندە لەو هۆڵە نەفرەتیەی ئەبو غرێب بێزار بووم، دەمویست ئەگەر مەرگیش بێت کەش و هەوا بگۆڕم.. دەم ویست دیوارێک ببینم جیا بێت لەدیوارە بەرزو بڵندەکانی ئەبوغرێب، دەمویست دەرگایەک ببینم وەکو دەرگا ئاسنەکانی ئەبو غرێب نەبێت،دەم ویست شەو و ڕۆژێک ببینم درێژ تربێت یاخود کورت تربێت لەشەوو ڕۆژەکانی ئەبو غرێب،دەمویست کۆمەڵێک دەم وچاوو روخسارو سیمای تر ببینم، دەمویست گوێم لەناوێک بێت غەیری ناوی (ئەبوغرێب). ئاخر پێنج ساڵ بوو من لەو قەفەزە نەگریسەدا بووم، پێنج ساڵ بوو دەمویست شەقامێک ، گەراجێک، خانویەک، باڵەخانەیەک، دارێ، درەختێ ببینم، هەزاران زیندانی نوێ هاتن و هەزارانی تر ئازاد بوون وسەدان نەخۆش کەوتن و هەزاران ئیعدام کران ودەیان زیندانی لەحەسرەت و مەراقدا مردن... کەچی من هەروەکو خۆم بووم،دەتگوت ئەو ژوورەم تاپۆ کردووەو کرێچیەکانی دەگۆڕم من هەر گەنجە ئاشووربە کوردستانیە بەدبەختە کە بووم، کە هیچ بڕیارێکی لێ بوردن نەی دەگرتەوە، بۆیە ئەو ڕۆژە کە ئەبوغرێبمان بەجێ هێشت وام دەزانی ئازاد کراوم. پاسەکان بەڕێوەبوون هێزێکی یەکجار گەورە پاسەوانیان دەکردین، لەنێوان هەردووپاسدا ئۆتۆمبێلێکی شۆفەرلێتی بیکاب (موسەلەحە) هەبوو، شۆفەرلێتەکان پڕ بوون لەچەکدارو بیکەیسیەکیان لەسەر سەقفی قەمەرەکەی دابەستبوو، ئەو گواستنەوەیەی ئێمە هاوزەمان بوو لەگەڵ ئاڵوگۆرکردنی هەندێ لە دیلەکانی جەنگی عێراق و ئێران، بۆیە زۆر لە ڕێبوارانی ڕێ وایان دەزانی ئەم کەژاوەیەی ئێمە گێرانەوەی دیلەکانی جەنگن. شاری تکریتمان بەجێ

هێشت سەعات (١١) پێش نیوەڕۆ پاسەکان لەچێشتخانەیەکی قەراغ ڕێ لایان دا، پاسەوان وچەکدارەکانی هێزە کە دابەزین وخواردن و کێک و سەندەویچیان دەکڕی، ئێمەش هەرلەپاسەکەدا مابوینەوە، پاسەوانێک لەناو پاسەکەدا لەبەر دەرگاکە وەستابوو منیش هەستامە سەرپێ و بە پاسەوانەکەم گوت ڕێگەم پێ دە زۆرم برسیە دەچم خواردن دەکڕم، سەرەتا پاسەوانەکە نەیهێشت منیش کۆڵم نەداو چەند جارێک داوام لێ کرد ڕێگەمان بدات بچینە خوارەوە خواردن بکڕین، دواجار پاسەوانەکە وتی راوەستە باپرس بە لێپرسراوی هێزەکەمان بکەم ئەگەر رازی بوو ڕێگەتان دەدەم، ئەوەبوو پاسەوانەکە چوو پرسی کردو هاتەوە سەرەوەو گوتی: ( تەنها یەک کەستان بڕوات ئەگەر زیندانیەکانی تریش خواردنیان دەوێ با ئەو کەسە بۆیان بهێنێ) منیش گوتم(براینە کێ خواردن و شتی پێویستە من دەچم بۆی دەکڕم) ئیدی زیندانیەکان هەریەکە لەجێی خۆیانەوە پارەیان دامێ وداوای هەندێ شتیان کرد، منیش چوومە خوارەوە دیاربوو یەکێک لەئەفسەرەکان بەخاوەنی چێشتخانەکەی گوتبوو گوایە ئێمە دیلی ئێرانین، بۆیە زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کردین ومنیش چوومە لای وەستای کەباب برژێنەکەوەو گوتم ئەوەندە لەفە کەبابەم بدەرێ، وەستای کەبابەکە فزوڵ گرتی وبەنهێنی لەژێر لێوەوە لێی پرسیم:( راستە ئێوە دیلی ئێرانین؟!) منیش بەهێواشی پێم گوت: ( نەخێر ئێمە خەڵکی کوردستانین ولەئەبو غرێب زیندانی سیاسی بووین، ئێستا گواستراوینەتەوە بۆ بەندیخانەی بادوش، لەموسڵ) ئیدی پێویستیەکانم کڕی و سواری پاسەکە بوومەوەو کەوتینەوە ڕێ.

## بەندیخانەی بادوش

دەمەو ئێوارە کەژاوەی زیندانیە کوردستانیەکان گەیشتە نێو شاری موسڵ، ئینجا موسڵمان بەجێ هێشت و بەرەو دەشتاییەکی پان وبەرین بەڕێ کەوتین، کەش وهەوای ئەو دەشتە لەدەوروبەری ئەبو غرێب فێنک تر بوو، شەقامێکی تەخت وپان بوو ئەمبەرو ئەوبەری هەندێ گردۆڵکەی لێ بوو بەسەر هەریەک لەگردۆڵەکەکانەوە ڕەبیەی سەربازی هەبوو. پاش چەند

دەقیـقەیەک ئۆتۆمـبیلەکـان شەقامی سـەرەکیـان بەجێ هێشت و بەدەسـتە راستدا لایان دا، کەمێک بەڕێوەبووین وگەیشتینە دیوارێکی دوورو درێژو بەرز وەکـو دیواری ئەبو غـرێب وابوو ،لەشـوورای شارۆچکەیەک دەچوو نەک دیواری بەندیخانە، بەهەر حاڵ دەرگایەکی گەورەی ئاسن کرایەوەو ئۆتۆمبیل وپاسـەکانی ئێـمـە خۆیان کـرد بەژووردا، لەگۆڕەپانەکەدا یەکەیەکە ناویان خوێندینەوەو کەل وپەلەکانمان لەلۆریەکان وەردەگـرت و دەچووینە لایەکەوە ریز دەبووین، ئەوە بەندیخانەی بادوش بوو لەموسڵ. بادوشیش ناوچەیەکی سەربەموسڵەو نزیکەی ( ٢٠ ) کیلۆمەتر لەسەنتەری شاری موسڵەوە دوورەو جیـا لەو بەندیخـانە گەورەیە کـارگەو سەربازگـەیەکی گەورەو چەند داوو دەزگـایەکی سـەربازی تێـدایە، کـە دایانگرتین سـەرەتا دەرگـایەکی ئاسن کرایەوەو چووینە ناو ڕاڕەوەکەوە یەک لە ئەفسەرەکان پێی گـوتین: (بڕۆنە ژوورەوە بەئارەزووی خـۆتان شـوێن دابەش بکەن) ئینجا دەرگایەکی ئاسنی شیـشـبـەند کـرایەوە، ئەویـشـمـان بەجێ هێـشت چووینە بەشێکی دیکەی بەندیخـانەکـە لەوبەشـەدا دوو هۆڵی گـەورە هەبوو ئاودەست وحـەمـام لەحـەوشـەکـەدابوون بینـاکـە خـاوێن بوو، پێ دەچوو تەمـەنی زۆر نەبێ و ماوەیەکی کـەم بێ دروست کرابێ، بە پێی ئەو یادگاری و بیـرەوەرییانەی کـەلەسـەر دیوارەکـانی ناوەوەی هۆڵ و ژوورەکـانی نووسـرابوو، ئەو بەندیخانەیە تایبەت بوو بەوانەی کەلەخزمەتی سەربازی لەسوپای عێراقیدا هەڵدەهاتن ودەگیـران، هەر هەموویان لەوێ بەند دەکران و ئیعـدام دەکران چونکە بیـرەوەریـیـەکـان هەمـووی باسی لە سـێدارەدان و گـوللە بارانکردن دەکـرد، هۆڵەکـان چۆڵ بوون لەسـەروو هۆڵەکـانەوە بەڕاڕەوێکدا ڕۆیشـتین دیتمان دەرگایەکی ئاسن هەیەو دەستە راستی هۆڵێکی گەورەیە (٦) ژوور بەرامبەر (٦) ژووری دیکە هەیە، ئێـمـە هەردەڕۆیشـتین وچاوەڕوانی دەمی مامۆستا نەسرولاو هاوڕێ «ل» محەمەد رۆستەممان دەکرد، چونکە ئەوان وەک پیاو ماقوڵی زیندانیەکانیان لێ هاتبوو ،ئەوەبوو ئەوان گوتیان بالەم ژوورانەدا بین باشترە بەو شێوەیە هەر ژوورەی (٤-٥)زیندانی تێکەوت من لەژووری ژمارە (٢)لەگەڵ دوو زیندانی گەنجی خەڵکی سلێمانیدا مامەوە.

بەو شـێـوەیە لەوێ مـاینەوەو شـەوانە بۆ خـۆمـان پێکەوە دادەنیـشـتین

ومەجلیسـمان گەرم بوو. لەبەندیخانەی بادوشیش بەهەمان شێوە گۆڕەپانی وەرزش و شوێنی گەمەکردنی تێدابوو، پاش دەدوانزە ڕۆژ کەس و کارمان هاتنە دیدەنیـمان، چونکە پێشتر لەئەبوغرێب پێمان ڕاگەیاند بوون کە ئەگـەری ئەوە هەیە بمانگوازنەوە بۆ مـوسـڵ لەلایەکی دیکەوە لەنێـو بەندیخانەی ئەبو غرێبەوە هەواڵیان بۆ چوو بوو کە ئێمە گواستراوینەتەوە بۆ بەندیخانەی بادوش، دایکم وباوکم زۆریان پێ خۆشبوو هەمـوو جارێک شەوی پێشووتر دەهاتنە هەولێرو لەوێ لەماڵی خزمان دەمانەوەو بەیانی زوو بەسەعاتێک کەمتر دەگەیشتنەلامان. لەبادوش لەو بەندیخانەیە هەموو شتێک بەرەو باشی دەڕۆیشت، پاسەوانەکان کۆمەڵە کەسێکی ڕێک و پێک و بێ تەنگ و چەڵەمـەبوون، تەنانەت ڕێگەیان پێ داین رادیۆش بهێنینە ژوورەوە بەڕێوەبەری ئەو بەندیخانەیە پیاوێکی بەتەمەنی زۆر ڕێک و پێک بوو، پێم وابێ ئێستا کۆچی دوایی کردووە، نزیکەی ( ٥٠ )ڕۆژێک دەبوو لەوێ بووین بەیانیـەک زوو بەڕێوەبەری بەندیخـانە هات وکۆمـەڵێ قـسـەی بۆ کـردین گـوتی: ( ئێـمـە ئازارتان نادەین و ئەوپەڕی ڕێزتان لێ دەگرین و خزمەتتان دەکەین،بەڵام تکاتان لێ دەکەم هەوڵی هەڵهاتن مەدەن چونکە دوایی ئەو برادەرایەتیـمان نامێنێ و خراپتان لێ بەسەر دەهێنین، ئێستاش چیتان پێویستە پێم بڵێن؟) یەک دوانێکمان چووینە پێشەوەو گوتمان: ( ڕێگەمان پێ بدە باکامێـرا بهێنینە ناوبەندیخـانەوە دەمـانەوێ هەندێ وێنە بۆ یادگاری بگرین) بەڕێوەبەر کەمێک بیری کردەوەوگوتی: ( باشە، بەڵام نابێ خۆتان کـامێـرە بهێنن،من دەیهێنم و بۆ خۆتان وێنەی یادگاری بگرن) ئەوەبوو پاش چەند ڕۆژێک دروست لە ١٩٩٠/١٢/٨ دا وێنەگرێک هات وکۆمەڵێک وێنەی گرتین، بەڵام بەڕێوەبەر پێی گوتین نابێ هیچ دیوارو تاوەرو بینایەکی بەندیخانە دەربچێت ئێمـەش فەرمانەکەیمان جێ بەجێ کـرد،دوای ئەوە هەر سێ چوار ڕۆژ جـارێک وێنەگـر دەهات وێنەمان دەگرت و بۆی دەهێنایینەوە و ئێمەش لەکاتی دیدەنیدا وێنەکانمان دەدایەوە کەس وکارمان، هەندێک لەزیندانیەکان نەیان دەوێرا وێنە بگرن، چونکە لەو باوەڕەدا بوون فـیلمی کـامـێـراکـە ببـرێت بۆ ئەمن و پاشـان موحاسەبە بکرێن، بەو شێوەیە ژیانمان لەنێو بەندیخانەی بادوشدا ١٠٠ نمرە لە بەندیخـانەی ئەبو غـرێب خـۆشـتـر بوو هەرچەندە هەردووکـیـان هەر

بەندیخانەن و ئازادی لەمرۆڤ زەوت دەکەن، بەڵام لەنێو بەندیخانەدا مرۆڤ بەو شێوەیە بیر ناکاتەوە، بەڵکو چاوەڕوانی ئەوەیە ئەمڕۆ لەدوێنێ ئاسوودە تر بێ، لەڕووی دەروونیەوە کەمێک ئارام و دڵنیا تربێت، ئەو ڕۆژانە کە کەس وکارمان دەهاتنەلامان باسی دەرەوەیان بۆ دەکردین، لەلایەکەوە گرانی و قات و قڕی لەلایەکی دیکەوە دەیانگوت هێزی پێشمەرگە نزیک دەوروبەری شار بونەتەوەو خەڵک خەریکە رادەپەڕێ. وردە وردە پشتمان بەخواردنی ناو بەندیخانە نەدەبەست، بەڵکو هەندێ لەزیندانیەکان ماڵیان لەناو موسڵ بوو کەسوکاریان ڕۆژانە خواردنیان بۆ دەهێنان، ئیدی بەم شێوەیە ساڵی (١٩٩٠)یشم لەنێو بەندیخانەکاندا بەسەربرد.

# ساڵی ١٩٩١ ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستان

شـەوی ١/١/١٩٩١ یەکـێـک بوو لەشـەوە خـۆشـەکـانی ژیانی نێـو بەندیخانەم،بەو بۆنەیەوە هەموو زیندانیەکان پێکرا ئاهەنگێکی خۆشمان سازدا،خوانێکی تێروپڕو بەتام سفرەی ڕازاندبووینەوە ،گۆرانی وبەزم و ڕەزم وقسەی خـۆش وبەسـەرهاتی کـۆمـیدی ئامـێـز دڵی خـۆش کردین تەنانەت هەندێ لەپاسـەوانانی نێـو بەندیخـانەی بادوشـیش تا درەنگانێکی شـەو بەشداری ئاهەنگەکەیان کـردین. ئیدی چەند ڕۆژێک ئاوا بەردەوام بووین، لەنزیکەوە ئاگـاداری دەنگوباسی سـیـاسی ناوچەکە بووین، هەمـوو دنیـا داوای لەعێراق دەکرد کە لەکویت بکشێتەوە بەتایبەتی دەوڵەتە زلهێزەکان، یەک لەسەریەک شاندی سیاسی دەهاتنە عێراق بۆ ئەوەی لەگەڵی شەیتان بێتە خوارەوەو ڕای گشتی جیهانی پەسەند بکات، کەچی ڕژێمی عێراق بەپێچەوانەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر لەسەر کەللە ڕەقی و بڕیاری مانەوەی هێزەکانی لەناو کوێتدا سوورترو مکوم تر دەبوو، بێگومـان باری ئابووری عێراق بەگشتی وگوزەرانی خەڵکەکەی بەتایبەتی سات لەدوای سات بەرەو خراپترو خراپتر دەچوو، هەموو ئەو ڕاستیانەشمان لەزاری دیدەنکاران وئەو خواردنانەی بۆیان دەهێنایین بۆ ڕوون دەبۆوە،ئا لەو سەروبەندەدا لەکاتێکدا کە ژیانی ئێمە لەنێو بەندیخانەی بادوشدا تارادەیەک لەچاو ئەبو غرێبدا بەرەو باشتر دەڕۆیشت،سەباحی سیخوڕ ئەو سەباحەی لەبەندیخانەی ئەبو غرێب لەسەر سیخوڕی و مەرایی و ماستاو بۆ پاسەوان وجەلادەکان سووک و ڕیسوا کرا، سەر لەنوێ لەبەندیخانەی بادوشیش وردە وردە خەریک بوو دەچووە سەر هەمان پیشەی جارانی وهەمیشە لەهەوڵی ئەوەدا بوو خۆی لەپاسـەوانەکـان نزیک بکاتەوە بۆ ئەوەی شکات لە ئێـمـە بکات و

زیندانیەکان بەلێدان و ئەشکەنجە بگەیەنێ، بێگومان ئەو سەباحە خەڵکی دەوروبەری شاری موسڵ بوو بۆیە لەگەڵ ئێمەدا گوزارابۆوە بۆ بادوش، ئێمەش لەو باوەڕەدا بووین کەلەئەبو غرێب ئەزموونێکی باشی وەرگرتبێت و چیتر جورئەتی ئەوە نەکات وەکو جاران ببێتەوە بەسیخوڕ بۆیە لەناو خۆماندا رێزمان لێ دەگرت و ئەزیەتمان نەدەدا، ڕۆژبەڕۆژ من بەنهێنی چاودێریی ئەو سەباحەم دەکرد دەمبینی دەچووە لای پاسەوان و ئەمنەکان وقسەی بۆ دەکردن، بەراستی من لە ئەبو غرێبیش لەهەموو زیندانییەکان زیاتر لەو سەباحەم دا بوو، بۆیە دەترسام تووشی گێچەڵم بکات. ڕۆژێکیان تیمارسازی بنکە تەندروستیەکەی ئەوێ هاتە لامان و پێی گوتین: ( ئاگادار بن ئەو سەباحە ناپاکە لەناوتانداو ڕۆژانە دەچێتە لای ئەفسەرو ئەمن وپاسەوانەکان شکایەتتان لێ دەکات) لەو ڕۆژەوە زیاتر چاودێری سەباحم کرد، تاوەکو ئەوشەوەی لێکۆڵەرێکی ئەمن ناردبووی بەشوێن مامۆستا نەسروڵادا پێی گوتبوو: ( دیارە ئێوە هەر خەریکی کۆبوونەوەو گوتنەوەی دروشمی سیاسین دژی حکومەتی عێراقی، ئینجا پێم خۆشە ناوی ئەو زیندانیانەم بدەیتێ کەئەو کارە دەکەن) مامۆستا نەسروڵاش گوتبووی: (ئێ هەر هەموومان لەنێوان چوار دیواردا زیندانی کراوین، ئیدی چۆن پێکەوە دانەنیشین و قسە نەکەین؟) بەهەر حاڵ ئەوشەوە لێکۆڵەری ئەمنەکە هەندێ ڕێنمایی مامۆستا نەسروڵای کردبوو کە پێمان ڕاگەیەنێت، هەمان شەو مامۆستا نەسروڵا گەڕایەوە بۆ لامان، تەواوی گفتوگۆیەکەی نێوان خۆی و لێکۆڵەری ئەمنەکەی بۆ گێڕاینەوە، ئیدی من بێگومان بووم لەوەی ئەم گرفتە لەژێر سەری سەباح سیخوڕدایە بۆیە هەرلەوێ بەمامۆستا نەسروڵاو زیندانیەکانی ترم گوت: ( من دەزانم کێ ئەو قسانەی گەیاندووە.. ئەو سەباحە بەدڕەوشتەیە ئێستا دەچم لێی دەدەم) ئەوەبوو دوای نان خواردن چوومە ژوورێکی دیکەی زیندانیەکان، لەژێرەوە سەرنجم دا سەباح هەر دەهات و دەچوو چاودێریی دەکردین، منیش بەنهێنی بەیەکێک لەزیندانیەکانم گوت: (برۆ بۆ لای سەباح و وردە وردە بەقسەکردنەوە خەریکی بکەو بیبە ناو ئەو هۆڵەی کەبەسەر گۆڕەپانەکە دەڕوانێ بۆ ئەوەی پاسەوانەکان چاویان لێی نەبێ) ئەوەبوو زیندانیەکە بەقسەی کردم و بەدەم قسەوە بردیە ناو هۆڵەکەوە، منیش هێدی هێدی

بەدواياندا رۆيشتم و دەرگای هۆڵم داخست، ئینجا دەستم دایە گسکێکی دەسک دارو کەوتمە لێدانی سەباح، ئیتر هەر ئەوەندەم خۆشبوو سێ چوار دارم تێ سرەواند وەختێکم زانی سەرجەم زیندانیەکان هاتن و پێکەوە ئەوەندەمان لێ دا ئاوبالآیمان شل و شەکەت کرد، چونکە ئازارو ئەشکەنجەکانی بەندیخانەی ئەبو غرێبیشمان بیرکەوتەوە، کە چەندین جار بەلێدانی داین وبەرتیلی لەزیندانەکان وەردەگرت وحەب ودەرمانە بیهۆشکەرەکانی بەنێو بەندیخانە دا بلآو دەکردەوە، پاش ئەوەی سەباح خۆی بوراندەوە بەهەردوو پەل رامکێشا بۆ ناو ڕاڕەوەکە ئەوەندەم زانی هەستایە سەرپێ و بەهاوار هاوار بەرەو دەرگای سەرەکی ڕای کرد: (ئەی هاوار فریام کەون،ئەوانە کوشتیانم)... پاسەوانەکان هاتن و بردیانە دەرەوە، دیسان لەوێش کۆمەڵێ شکایەتی لێ کردین ئەوەبوو پاش چەند دەقەیەک بەڕێوەبەری بەندیخانەو کۆمەڵێک پاسەوان هاتنە ناوهۆڵەکەو گوتیان چیتان دەوێ بۆچی لەو کوڕەتان داوە؟ چەند زیندانیەک چوونە پێشەوەو بە بەڕێوەبەرمان گوت: ( ئەو سەباحە زۆر بەدڕەفتارەو بوختانچیە، دەبێ لەنێو ئێمەدا نەیهێڵیت ئەگینا دەیکوژین) بەڕێوەبەر کەمێک بیری کردەوەو پرسی: (تەنیا ئەمەتان تێدایە ئاوا خراپ بێت؟) گوتمان:( بەڵێ) گوتی: (ئەم سەباحە دەگوازمەوە، بەلآم ئەمە دواجارتان بێت ئازاری خەڵک بدەن و ئاژاوە دروست بکەن).

بەو شێوەیە سەباح گوزرایەوە بۆ ئەبو غرێب و لەو ڕۆژەوە سەرمان سووک بوو.

## گێژەڵوکەی بیابان و یەکەمین هەوڵی هەڵهاتن

ناوەڕاستی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩١ دروست ١٥/١ دوا مۆڵەت بوو،کە ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بۆ عێراقی دانابوو تاوەکو هێزەکانی خۆی لەکوێت پاشەکشێ پێ بکات، ئەو ڕۆژانە ئێمەو پاسەوانەکان و تکێرای بەرپرسانی بەندیخانە لەدوودڵیەکی کەم وێنەدا دەژیاین، هەموو بیروبیرکردنەوەو دانیشتنمان باس باسی چارەنووس ودواڕۆژی عێراق و کوردستان بوو،لەعەقڵی خۆماندا سەدان ئەگەرو بۆچوونمان رواندبوو، ئاخۆ ئەو رەوشە بەرەوکوێ دەروات؟! بەیانی زووی

ڕۆژی ۱۹۹۱/۱/۱۷ هەندێک لەزیندانیـەکـان بەخـەبەریان هێنام و گوتیان: (هەستە لەخەو ئەمشەو فڕۆکەکانی هاوپەیمانان لە عێراقیان دا) لەراستیـدا ئەو هەواڵە دڵی هەمووـمانی شاد کرد، یەکەمین هۆکاری ئەو شادییەشمان ئەوەبوو کە ئومێدێکمان لادروست بوو،بەڵکو ئێ لەم لێدان و بۆردومـان و بگرە و بێنەو بەردەیەدا، ئێمـە بەدنیای ئازادی بگەین!! ئاخر ئەوە بو شـەشـەمین سـاڵ دەچوو من لەوبەندیخـانەیەدا ئازارو مـەینەتیم دەچەشت، هەندێ لەزیندانیـەکـان سـالاّنێک بەرلەمن لەبەندیخـانەدا بوون،ئیـدی چۆن دڵمان بەهەمـوو گۆرانکارییەکی سیاسی وسەربازی ئەو ناوچەیە خـۆش نەبێت. هەرلەبەیانیـەوە تاوەکـو بەرەبەیانی ڕۆژی دوایی بەنهێنی گوێمان لەرادیۆ دەگرت، شەوی دوایی گوێمان لەدەنگ و زرومەو گرمە گرمی بۆردومـانی فـڕۆکەو تۆپی دژە تەیارەو جۆرەها تەقـینەوە بوو، وەک هەواڵمان پێ گەیشت ئەو شەوە لەکارگەی چیمەنتۆی بادوشیان دا لەنزیک بەندیخـانەی بادووشـەوە دوو مـەشـجـەبی سـەربازی (کـۆگـای تەقەمەنی) هەبوو، هەر ئەوشەوە لەو دوو مەشجەبەش دراو تاکو بەیانیەکی درەنـگ تەقـــینەوە بەردەوام بوو، ئەو ڕۆژانە چوونە دەرەوەمـــان بۆ نێـــو گـۆڕەپانی بەندیخـانە قـەدەغـە بوو،لەسـێـیـەمین ڕۆژدا هێـزێکی گـەورەی چەکـداریان هێنایە ناوبەندیخـانە کـەوە بەمـەبەسـتی پاس کـردنی. چەند ڕۆژێک بوو کـارەبا بڕابوو شەوانە پاسەوانەکان دەهاتن بەلایت تەماشایان دەکردین ئیـدی بە چراو لەمپـاو مۆم و فـتـیلە ناوهۆڵ و ڕاڕەوو ژوورەکـانی بەندیخـانەیان ڕووناک کـردبۆوە، بێـزاری تەواوی بەندیخـانەکـەی گرتبـۆوە، هەندێ لەپاسەوانەکان شـەرمـیـان لەئێـمـەش نەدەکـرد، بەئاشکرا هاواریان دەکرد خۆزگە ئەمجارە سەدام بڕوخایەو لەم شەڕو شۆڕو برسێتیە رزگارمان بوایە، گـەرەکـمـان بوو بزانین لەتەلەفزیۆن چ باسـە!! ئەوە بوو کـاتێ دیدەنی زیندانیـە مـوسـلاویـەکـان دەهـاتن،یەکـێـک لە زیندانیـەکـان بەبراکـەی گـوت تەلەفزیۆنێکمـان بۆ بهێنە بە پاتری ئۆتۆمبیل ئیش بکات کـارەبای پێویست نەبێت، پاش هەفتەیەک تەلەفزیۆنەکەی بۆ هێنایـن.

بێگومـان بۆردومـان و زرمەو گـرمـەی شـەوان بەردەوام بوو، دەتوانم بڵـێم لەو هەرایە ڕاهاتبـووین، شـەو ناشـەوێک یەک دوو سـەعـاتێک کـارەبا دەهاتەوە،بەڵام گڵـۆپ پێکردن قـەدەغـە بوو لەبەر بۆردومـانی فـڕۆکـەکـانی

هاوپەیمانان، کەتەماشای تەلەفزیۆنمان دەکرد تەنیا دوو کەناڵی تورکی وەردەگرت، ئەگینا کەناڵە ناوخۆییەکانی تەلەفزیۆنەکانی عێراق هیچیان پەخشیان نەمابوو، هەندێ شەو لەو کەناڵانە فیلمی تورکی نیشان دەداو بەدیاریەوە دادەنیشتین دوای ئەوە بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانە بڕیاری دەرکرد، کە دەبێ لەسەعات (١٢)ی شەوەوە تەلەفزیۆن بکوژێتەوەو تێکڕای زیندانیان بخەون، بەڵام ئێمە زۆر گوێمان نەدایە ئەو بڕیارە بەڵکو شەوانە بەدیار تەلەفزیۆنەوە دادەنیشتین ویەکێک لە زیندانیەکانمان وەک پاسەوان لای دەرگای ڕاڕەوەکەوە رادەگرت هەر کاتێ پاسەوانێکی بەندیخانە دەریکەوتایە هاواری دەکرد: ( قاز هات). ئیدی ئەوە وشەی نهێنی بوو لەنێوانماندا، ئەو بارودۆخە ناهەموارە بەو شێوەیە بەردەوام بوو هەندێ جار خۆمان بەکاری دەستی و دروستکردنی کەلوپەلی جوانی لەزەنگیانەو تەختەو پەڕۆ دروستکراوەوە سەرقاڵ دەکرد عەزیز لازارو هاوڕێ (ل) لەو کەسانەبوون کە زۆر دەستڕەنگین بوون لەوبوارەدا. وردە وردە گێژەڵۆکەی بیابان تەواو بوو، ئینجا هێرشی زەوی هێزەکانی هاوپەیمانان بۆ سەر شوێن و پێگەو ناوچەکانی سوپای عێراقی لەناوچەی کەنداو دەستی پێ کرد، لەو ڕۆژەوە پاسەوانەکان زیاتر ترسیان لێ نیشت، هەمیشە قسەی خۆشیان لەگەڵ دەکردین ڕۆژ بەڕۆژ زیانەکانی سوپای عێراقی زیاتر دەبوو هەمووده‌مانزانی سوپایەکی تێکشکاوو بێ ورە بەرگەی ئەو هێرشە گەورەو بەرفراوانەی هاوپەیمانان ناگرێت، ئەو ڕۆژانە بەڕێوەبەری بەندیخانە زوو زوو بەسەری دەکردینەوەو بەحسابی خۆی ئامۆژگاری دەکردین! شکست و زیانەکانی سوپای عێراقی و پاشەکشەی لەکوێت و مەرگەسات ومەینەتیەکانی گەلانی عێراق وێردی سەرزمانی زیندانیان و پاسەوانان و بەرپرسانی بەندیخانەی بادوش بوو دوو دڵی و دڵەڕاوکێ لەلوتکەدا بوو، لەمانگی شوباتی ئەوساڵەدا ڕۆژێکیان یەکێک لەرادیۆکانی وڵاتانی کەنداو هەواڵێکی خوێندەوە شاگەشکەی کردین، گوایە سەربازێکی سوپای عێراقی موشەکێکی ناوە بەوێنەی سەدام حوسێنەوەو لەباشووری عێراق ڕاپەڕینی خەڵک دژی ڕژێمی عێراق دەستی پێ کردووە، ئیدی بارودۆخی ناو بەندیخانە هێندەی تر جۆش وخرۆش گرتی. خەو وخواردن و کارو کردەوەی بەردەوامان گوێ گرتن بوو

لەرادیۆکـانی جیـهـان وعـەرەبی و ئۆپۆزیسـیـۆنی عـێـراقی و بەتایبـەتیش رادیۆکـانی شـۆڕشی کـوردسـتـان، بەتایبـەتی دەنگی کـوردسـتـانی عـێـراق بەردەوام جفرەی لێ دەدا بۆ ڕێکخستنەکانی ناو شارو هێزەکانی پێشمەرگە لە دەوروبەری شارەکانی کوردستان. هەموو بەو ئاواتەوە بووین موشەکێک، قومبەلەیەک، گوللە تۆپێک،راجیمەیەک بیدا بە بەندیخانەکەداو ئێمەش ڕاپەڕین، بارودۆخی بەندیخـانەش ڕۆژبەڕۆژ بەرەو خـراپی دەرۆیشت ئاو نەما، سوتەمەنی تەواو، کارەبا بەخەونیشی نەبوو، ڕۆژی یەک نانی بۆریان دەداینێ، هەفتەی جارێکیش برنجێکیان نەدەداینێ، ڕێگای نێوان شارەکان ئاسـایی نەبوو، دیدەنکارانمان نەدەهاتن، تەنانەت هەندێ ڕۆژ بەتانکەری پاککردنەوەی ئاودەست وپیـسـایی ئاویان بۆ دەهێنایین، من و مـامـۆسـتـا نەسرولا و هاوڕێ عـوسمان وسالاری حاجی عـوسمـان و عەزیز لازار چەند جارێک لەناو خۆمدانا کۆبووینەوە بیرمان لەوە دەکردەوە پلانێک دارێژین بۆ هەڵهـاتن، بەلام هەر چەند سـەیری ئەو هێـزە چەکـدارە زۆرەی بەندیخـانەکـەمـان دەکـرد مـەحـاڵ بوو بتـوانین، شـەوێ لەشـەوان یەک لەبەرپرسانی بەندیخانە بەنهێنی بە مامۆستا نەسرولای گوتبوو(هەر کاتێ هێـزی پێشـمـەرگـە بێـتـە ئەم ناوەوە تەقـە بکات دەسـتـبـەجێ دەرگـای بەندیخـانە دەکەینەوەو هەمـوومـان پێکەوە هەڵدێین) بەراستی ئەو قسـەیە لەکـەللەی دابووین، هێندەی تر تووشی دڵەڕاوکێی کردبووین و چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بووین، ئیـدی سـات لەدوای سـات بـارودۆخی بەندیخـانە ئالۆزتر دەبوو، ڕۆژێکیـان کاتی دیدنی کەسو کارمان بوو، خزم و دۆستی هەمـووی زینـدانیـەکـان هاتبـوون، کـەچی خـوشکی یەکـێک لەزینـدانیـە کـوردەکـان زۆربەخەمباری و بێ تاقەتی هاتە ژوورەوە، ئێمەش لێمان پرسی چیە بۆچی وا مـاتی؟! کـچـەکـەش گـوتی: ( بەرلەوەی بێـمـە ژوورەوە یەکـێک لەپاسەوانانی بەردەرگای بەندیخانەکە تانەو تەشەری لێدام و قسـەی زۆر ناشرین وناشایستەی بەرامبەرم کرد) ئێمەش لەهەلێکی وەها دەگەڕاین، بۆیە پلانێکمـان دارشت کـە ئەگـەر بێت و ئەو پاسـەوانە هاتە ژوورەوە دەیگرین و مـیـرازێکی باشی دەکەین،حسابمان بۆ هیچ شتێک نەدەکرد،و ترس لەدڵمـاندا نەمـابوو، هێـشـتـا کـەس وکاری دیدەنکارانمان لەهۆڵەکادا بوون، دیتـمـان ئەو پاسـەوانەی تانەی لەخـوشکی زینـدانیـەکـە دابوو،

لەوسەری ڕاڕەوەکە وەستابوو ئەوەبوو بە پاسەوانێکی ناوهۆڵەکەمان گوت: (زەحمەت نەبێ ئەو پاسەوانەمان بۆ بانگ بکە ئیشمان پێیەتی) ئیدی چوو بانگی کردو پاسەوانەکە بە پێی خۆی هاتە ئەمدیو هۆڵەکەوە، ئێمەش دەستبەجێ دەرگای هۆڵەکەمان لێ داخست وکەوتینە گیانی،هەرچی ئازای هەبوو بەشەق و زللەو بۆکس شل و شەکەتمان کرد، بوارمان نەدا یەک ووشە بدرکێنێ دیدەنکاران هەموو هۆڵەکەیان بەجێ هێشت و ڕایان کردە خوارەوە، ئێمەش بەهەموو زیندانیەکان لە لێدانی ئەو پاسەوانە بەردەوام بووین، ئیدی حەسیرمەیانێکمان پێ کرد با بەدەواری شڕی نەکردبێ و هەرگیز بیری نەچێتەوە تا ئەو کاتەی لەژێر دەستماندا ڕای کردو خۆی گەیاندە دەرەوەی هۆڵەکە، پاش کەمێک بەڕێوەبەری بەندیخانە هات و گوتی بچی لەو پاسەوانەتان داوە؟ مامۆستا نەسرولڵا چووە پێشێ گوتی:( قسەی ناشرینی بەخوشکێکی زیندانیەک داوە، ئێمەش لێی قبوڵ ناکەین) بەڕێوەبەری بەندیخانە پیاوێکی لەسەرخۆو مرۆڤ دۆست و ڕێک و پێک بوو هاوکات زۆریش دەترسا، لەخودای دەویست ئێمە هیچ کێشەو گیروگرفتێک نەنێینەوە، بۆیە دەستبەجێ فەمانی داو گوتی: ( بڕۆن ئەو سەگبابە بگرن ولەژووری تاکە کەسیدا توندی کەن) لەراستیدا هەستمان بەسەربەرزییەک دەکرد، چونکە ئەو سوکایەتیەمان قبوڵ نەکرد، ڕەنگە گێڕانەوەی ڕووداوێکی وەها بەلای خوێنەرەوە هەندێک ئاسایی بێت، بەڵام بۆ ئەو ڕۆژەو لەوشوێنە سەخت و ترسناکەدا کە بچووکترین هەڵە بەرەو پەتی سێدارەت دەبات، نەخاسمە لێدانی پاسەوانێکی بەندیخانە!! کارێکی گەورەیە.

بارودۆخی عێراقیش لەڕووی سیاسی وسەربازی و ئابووری و کۆمەلایەتیەوە تا دەهات ڕووەو خراپترو ئالۆزتر دەڕۆیشت، شارەکانی باشووری عێراق ڕۆژ لەدوای ڕۆژ یەکەیەکە لەژێر دەسەلاتی حکومەتی بەعسدا نەدەما، شەوێکیان ئەفسەرێکی بەندیخانە هاتەلامان و بەراشکاوی داوای ئەوەمان لێ کرد، ڕێگەیەکمان بۆ بدۆزێتەوە لێوەی هەڵبێین،ئەگەرچی ئەو ئەفسەرە ڕەزامەندی خۆی نیشاندا،بەلام گوتی: ( بەو شێوەیەی ئێوە دەیلێن مەحاڵە، ئێوە چاوەڕوانی ئەوە بن ڕۆژێک هێزی پێشمەرگە بگاتە ئەم ناوچەیە ئەوکات پێکەوە تەگبیر دەکەین!) لەراستیدا

پاسەوان وبەرپرسانی بەندیخانە لەئێمە ماندووتر و برسی ترو بێ تاقەت تربوون، وەک لەسەرەتا باسم کرد یەکێک لەزیندانیەکانمان سالاری حاجی عوسمان بووکە یەکێک بوو لەهەڤالانی پارتی وبرای ئەنوەری حاجی عوسمان بوو کە ئەویش پێشمەرگەیەکی قارەمان و ماندوونەناس بوو، کاک ئەنوەر بەرلەدوو رۆژ بە دیدەنکاراندا هەوالّی بۆ ناردبووین، کە خۆمان ئامادەکەین بەو نزیکانە دینە ئەو دەوروبەرەو هێرش دەهێنن، بەلاّم ئێمە پەتی تەحەمولمان پچرابوو ، چونکە دۆخەکە لەوەدا نەمابوو مرۆڤ لەوە زیاتر چاوەروان بێت، بێگومان ئەم نێهنیەش تەنیا من و سالارو مامۆستا نەسرولاّ و هاورێ عوسمان و یەک دوو زیندانی تر دەمانزانی بۆیە ئەو چوار پێنج کەسەمان کەسوپاس بۆ خودا ئێستا هەموومان ئازادین، بریارمان داو پلانێکمان دارشت بۆ ئەوەی هەلّبێین نەمانهێشت زیندانیەکانی تریش بزانن. پلانەکەشمان بەو شێوەیە بوو، کە ئێوارە درەنگ پاسەوانەکان بانگ بکەین نانمان لابخۆن ولەکاتی نان خواردنەکەدا هێرشیان بکەینە سەرو پەلبەستیان کەین و وردە وردە برۆینە دەرەوە.

ئێوارە سێ چوار پاسەوان لەراڕەوەکەدا بوون تاوەکو سەعات (۱۱)ی شەویش هەر نانمان نەخوارد چونکە بانگهێشتمان کردبوون و نەدەهاتنە لامان، جل وبەرگی تەواومان لەبەرکردبوو ئامادەبووین بۆ جێبەجێکردنی پلانەکە، کەچی بۆ بەدبەختی ئێمە ئەو پاسەوانانە هەرنەهاتنە سەرخوانەکەمان توومەس بەهۆی هەلّەی یەک دووبرادەرمانەوە هەستیان کردبوو کەنیازی کارێکی لەو شێوەیەمان هەیە، بۆیە ئەو پاسەوانانە نەک هەر نەهاتنە پێشەوە بەلّکو چوون لای بەرێوەبەری بەندیخانە شکاتیشیان لێ کردین. دەوروبەری سەعات (۱۱)ی شەو بەرێوەبەری بەندیخانە ناردی بە شوێن مامۆستا نەسرولاّدا ئێمەش تادرەنگانێکی شەو چاوەروانمان کرد، لەنیوە شەودا مامۆستا نەسرولاّ زۆر بەتورەیی گەرایەوە رەنگ و رووی ئاگری لێ دەباری سەرەتا قسەی لەگەلّ کەسدا نەکرد، پاشان کەچووینە پێشەوە لێی بەتوندی یەک چەپۆکی کێشا بەرانی خۆیداو پێی گوتین: (جلەکانتان داکەننەوە دەی، ئاخر خەتای منە دوای عەقلّی مندالّی وەکو ئێوەکەوتوم دیارە ئێوە هی ئەوەنین مرۆڤ رێنماییتان بکات) بەراستی مامۆستا نەسرولاّ وەک برا گەورەو ریشسپی ودەمراستمان هەمیشە جێگای

ڕێزمان بوو بۆیە بەهێواشی لێمان پرسی: (بۆچی..چی بووە؟) ئیدی پێی گوتین: (کاکە گیان بەڕێوەبەری بەندیخانە بەپلانەکەمانی زانیوەو هەر لەپیاوەتی خۆیشی نامانکوژێت!) پاشان بۆی گێڕاینەوە کە بەڕێوەبەر پێی گوتووە: ( ئێمە وامان زانی کوڕی باشن وڕێزمان لێ گرتن، کەچی ئێوە بەنیازن هەڵبێن وخۆمان و ماڵ و منداڵمان بخەنە بەرپەرتی سێدارە، بۆیە بڕیارم دا چیتر برادەرەیەتیتان نەکەم و ئەو ئاشنایەتیەمان نەمێنێ!) ئیدی لەوشەوەوە رەفتاری پاسەوانەکان گۆڕاو چیتر ئەو ڕێزەی جارانیان لێ نەگرتین.

## زیندانیەک هەڵهات!

یەکێک لەو زیندانیە کوردانەی لەگەڵماندا بوو ناوی مەحمود بوو سێ ڕۆژ دوای ئەو ڕووداوانە بەئاسانی لەوبەندیخانەیە هەڵهات و ببڕاوبڕا نەماندییەوە، بەڵام چۆن وکەی؟! رەنگە گێڕانەوەی هەڵهاتنی مەحمود وەک فیلمێکی سینەمایی وابێت، مەحمود خێزاندار بوو ژنێک و دوو منداڵی هەبوو زۆربەی ڕۆژانی دیدەنی خێزانەکەی ومنداڵەکانی دەهاتنە لای، ئەو شەوەی کەبۆ بەیانی کاتی دیدەنیمان بوو، مەحمود بەنهێنی بەموکێش هەموو مووەکانی ریش وسمێڵی هەڵکێشا بوو،ئینجا بەیانی وەختێ کاتی دیدەنی تەواو دەبێت، مەحمود عەباکەی کە خێزانەکەی بۆی هێنابوو دابووی بەسەری خۆیداو یەکێک لەمنداڵەکانی خۆی کردبووە باوەشی ولەگەڵ خێزان وکەس و کاری زیندانیەکانی تردا بەنێو قەرەباڵغیدا لەبەرگی ئافرەتێکدا چوو بووە دەرەوە بەبێ ئەوەی کەس هەست بکات، ئەوەبوو ئەو ڕۆژە وەک هەمیشە دوای دیدەنی سەرژمێریان کردینەوە چەند جارێک ناوی زیندانیەکان خوێندرایەوە کەچی مەحمود دەنگی نەبوو،دوای ئەوە بانگی ئەو زیندانیانەیان کرد کە لە ژوورەکەدا لەگەڵ مەحمود بوون ئەوانیش هیچ زانیارییان نەبوو، ئینجا دوای ئەوەی حەمام و ئاودەستەکانی بۆ گەڕان و هەر نەیان دۆزییەوە بۆیان دەرکەوت کە مەحمود هەڵهاتووە بێگومان بەخت یاوەری مەحمود بوو چونکە لەوکاتەدا بەهۆی بۆردومانی فڕۆکەکانی هاوپەیمانانەوە، هەمووپەیوەندییەکی تەلەفۆنی پچڕابوو، ناچار بوون بەئۆتۆمبیلێکی لاندگرۆزەر دوای کەون بەو نیازەی لەڕێگای بیگرنەوە

کەچی دووبارە بەخت مەحموودی بەرنەداو لاندگرۆزەرەکە لەرێگا تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بوو بوو سەرەو نگون بوو زۆر لەنەفەرەکانی ناویشی گیانیان لەدەست دا. بەم شێوەیە مەحمود هەڵهات و بەرپرسانی بەندیخانە کەوتنە گیانی برادەرکانی وهەموو ڕۆژێک دەیانبردنە لێکۆڵینەوە ئیدی پاش ئەوەی کە هیچیان بۆ ڕوون نەبۆوە برادەرەکانی مەحمود وچەند کەسێکی تریان ڕەوانەی بەشی قورسی بەندیخانەی ئەبو غرێب کردەوە،بێگومان دوای ئەو ڕووداوە بارودۆخی نێو بەندیخانە هێندەی تر ترسناک و ناخۆش بوو،هێزێکی چەکداری زۆرتریان هێنایە ناو بەندیخانە کەوە، ژمارەی پاسەوانەکان ڕۆژبەڕۆژ زیادی دەکردو فشاری دەروونی لەبرەودابوو تەنانەت ماوەی چوونە دەرەوە وگەمەی ناو گۆڕەپانی بەندیخاشیان لێ کەم کردینەوەو ژەمە خواردنەکانیشمان تا دەهات وشکترو کەمتر دەبۆوە، هیچ پاسەوانێک تەنانەت ڕوویەکی خۆشی نەدەدا بە زیندانیەکان ئەو هەلومەرجە لەبارەی جارانی نێو بەندیخانە نەما ئەو بەرێوەبەرەی ڕۆژانە دەهاتە ناومان و قسەی خۆشی بۆ دەکردین هەر نەمان دیبەوە، ئەو خواردنەی کەسو کارمان لەکاتی دیدەنیدا بۆیان دەهێنایین هێدی هێدی ئاسەواری قات و قڕی و برسێتی وگەمارۆی ئابووری پێوە دەردەکەوت، دیاربوو ئاستی گوزەران وبژێوی ئەوانیش هێواش هێواش بەرەو دابەزین دەچوو، بەم شێوەیە ئەو بارودۆخە بەردەوام بوو تاوەکو ڕۆژی ڕاپەڕینە شکۆدارەی خەڵکی کوردستان.

## ڕاپەڕینی کوردستان لەژووورە تاریکەکانی بەندیخانەوە

تا ئێستا زۆر باسی ڕۆژە هەرەخۆش و ساتە هەرە تاڵەکانی ژیانی نێو بەندیخانەم کرد، بەڵام ١٩٩١/٣/٥ ئەو ڕۆژەیە کە هەرگیز لەیادی ناکەم، ئەو ڕۆژەی کوردستانەکەم تروسکایی ئازادی لێ وەدەرکەوت ئەو ڕۆژەی خەڵکی کوردستان تێکڕاو پێکڕا، بەجیاوازی نەتەوەو ئایین و ڕەگەزو مەزهەبەوە، بەپیرو گەنجو ئافرەت و منداڵەوە، ڕاپەڕین ئەو ڕۆژانەی دێوەزمەی شەڕو کوشتارو ئازار بەرۆکی یەکەیەکەی کوردستانیەکانی بەردەدا... ئەو ڕۆژانەی خەونی هەموو شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری

کوردستان هاتەدی، ئای لەو ساتانە چەندە خۆش و دڵگیربوو، ئاخر ئێمە کە لەنێو ژووره تاریک و ترسناکەکانی بەندیخانەوە، سەرمان نابوو بەرادیۆی دەنگی کوردستانەوە، ئێمە کەلەنێو ئازارەکانەوە گوێبیستی سروودەکانی (دەمی راپەڕین و بژی پێشمەرگە و کینە ئەم و پێشمەرگەنە) دەبووین، ئاگر لە هەناومان بەربوو بوو، هەموو شیعرێک هەموو هەواڵێک هەموو دەنگێک، هەموو وشەیەک فرمێسکی خۆشی پێ دەباراندین،ئای کوردستانەکەم ئەوە تۆی رزگارت بوو لەسەرو فەساڵی بەعسیەکان، ئای سلێمانیەکەم ئەوە تۆی مولازم موحسین و مفوەز عەلاو نەقیب چەلوب و رائید تەهاو دەستەو دایەرەکانیانت شار بەدەرکرد، ئای سەرچنارەکەم ئەوە تۆی کونە مشکت لەپیاوانی بەعس و جەیشی شەعبیەکان کردۆتە قەیسەری؟!! گریام.. زۆر گریام بۆ ئەو سەرکردانەی کە هەموو ئاواتیان ئەوەبوو کوردستان بەئازادی ببینن.. بۆ بارزانیی نەمر ئەو کەڵە سەرکردەیەی هەتا ئەبەد لەناخی هەمووماندا بەزیندوویی دەمێنێتەوە، بۆ کاک ئیدریس، چرا پڕ شەوقەکەی دیوەخانی کوردایەتی و نیشتمانپەروەری .. گریام بەکوڵ گریام هەڤاڵە شەهیدو بێ سەروشوێنەکانم بۆ سالار بۆ نزار، بۆ هەموو ئەو گەنجانەی لەتەعزیبستانی بەندیخانەکانی رژێمی عێراقدا بۆ سەربەخۆیی کوردستان گیانیان بەخشی، بۆ ئەو شەهیدانەی کەبەخوێنی خۆیان داروبەردی ئەو وڵاتەیان رەنگین کرد.. لەوساتانەدا لەو چرکەیەی کە دەنگی کوردستان مژدە هەواڵی ئازاد کردنی یەکەیەکەی شارو شارۆچکەکانی کوردستانی رادەگەیاند،، خۆزگەم بە پێشمەرگەکان دەخواست لەناخی خۆمدا مەزەندەی خۆشەویستی و ئامێزی گەرمی خەڵکم بۆ پێشمەرگە دەکرد، دەمگوت ئێستا پێشمەرگەکان بەجل وبەرگی قوڕاوی وبەکوڵەباڵ و تاقم و تفەنگ و پوزەوانەو پێڵاوی لاستیکەوە، لەشەقامەکانی شاردان، دەمزانی ئێستا خەڵک گوڵباران و ماچبارانیان دەکات.. بارودۆخی ناو بەندیخانەش هەر ئاڵۆزو ئاڵۆزتر دەبوو پاسەوانەکان تازەبوون ئێمەیان نەدەناسی زۆربەمان بە ئاواتەوەبووین پاسەوانەکان ئازارمان بدەن و بیکەینە هەلاو بیقەومێنین، ئای لەهەل گەڕاین و بۆمان نەرەخسا، رۆژانی دیدەنی کەس نەدەهاتە لامان، تەنیا تاک و تەرا لەناو شاری موسڵەوە دیدەنی زیندانیەکان دەهات، لەخودامان دەویست پاسەوانێک بێت

سوکایەتیمان پێ بکات و بیکەین بەشەڕێک هەتا نەکوژرێین واز نەهێنین یاخــود ئەوەتا ئازاد دەبووین، شــەوان کــەش وهەوای ناو بەندیخــانە بۆ پاســەوانەکــان زۆر ترسناک بوو،چونکە هەریەک لەو زیندانیــانە وەک قومبەلەیەک وابوو، هەموو ساتەوەختێک ترسی تەقینەوەیان لێ دەکرا،وای لێهات بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانە لەترسی زیندانیەکان داوای موەلیدەیەکی کارەبایی گەورەی کردو شەوان کارەبایان دەداینێ، ڕۆژ بەڕۆژ ماوەی چوونە دەرەوە بۆ ناو گۆڕەپان کەمــتــر دەبۆوە،چونکە خــەریک بوو زیندانیــەکــان لەکۆنترۆڵ دەردەچوون بەتایبەتی کەسانی وەکو ئێمە کە (٥-٦)ساڵ بوو لەبەندیخانەدا بووین، ڕەفتارو گوفتاری پاسەوانەکان یەکجار نەرم ونیان بوو بوو،هەمــوو لەگیانی خۆیان دەترسان هیچیان متمانەیان بە بەردەوام بوونی ئەو بارودۆخە نەمابوو هەر لەو سەروبەندەدا بەڕێوەبەری بەندیخانە چەند جارێک هاتە لامان و هەڕەشەی لێ کردین دەیگوت:( هەمــوو چوار دەوری بەندیخانە بەهێزی تایبەت گیراوە، هەر کەسێ هەوڵی ڕاکردن بدات گــوللەباران دەکرێت، لەبەر ئەوە تکاتان لێ دەکەم کــەس هەوڵ نەدات)، لەکۆتایی مانگی (٣)دا شەوێکی درەنگ دەستکرا بەتەقەو دەستڕێژێکی زۆر، دەنگی کــلاشینکۆف و بیکەی سی و تەنانەت دۆشکەش زۆر نزیک بوو لەئێمــەوە دەمانزانی بەشێکی زۆری ئەو تەقــانە پاسەوانی سەربان و ســەردیوارو تاوەری چاودێرییــەکــان بوون،لەخــۆشــیــا وەخت بوو باڵ بگرین،مامۆستا نەسروڵا بەنهێنی هاتە لامەوەو گوتی: (شێرە گیان وابزانم ئەمجارەیان پێشمەرگە هات) پاسەوانەکانی ناو ڕاڕەوو دەرگای هۆڵەکان یەکجار شڵەژا بوون، ئیدی تێکڕای ئەو بەندیخانەیە یەک پارچە بوو بەهات و هاوارو ڕاکەڕاک و تەقەو زرم و وڕ، تاوەکو سەعات (١)ی شەو ئەو وەزعە نائاسایيە بەردەوام بوو تەقەکان هەندێ جار دوور دەکەوتنەوەو جار ناجارێک نزیک دەبوونەوە لەدوای سەعات(١)ی شەوەوە دەنگی زنجیــری دەبابە دەهات، دیاربوو کــەتیبــەیەکی دەبابەیان هێنایە ناو بەندیخــانەوە، ئیــدی بەڕاســتی ئەودەنگە دووبارە بێ ئومــێــدی کردینەوە،بەتایبەتی پاش ئەوەی دەنگی تەقەکان بەتەواوی کپ و خامۆش بۆوە، پاسەوانێکمان بانگ کردە لای دەرگاکەوەو لێمان پرسی: ( ئەوە چیە چی ڕوویداوە؟) لەوەڵامــدا گــوتی:( هیچ نەبوو دوو سێ زیندانی بەشی

قورس خۆیان بێ عەقڵ کرد ویستیان هەڵبێن، بەڵام وا هەموویان کوژران وکۆنترۆڵ کرایەوە)، دوای ئەوە هێزێکی زۆری چەکدار هاتنە ناو هۆڵ و ڕاڕەوو ژوورەکانی بەندیخانەوە، ئەفسەرێک بەپلەی عەقید دەستێ جلی سەربازی پۆشیبوو، پێ دەچوو فەرماندەی ئەو هێزەبێت.

بەبێ ئەوەی ڕوو بکاتە ئێمە بەدەنگی بەرز هاواری کرد بۆ ئەوەی ئێمە گوێمان لێ بێت: ( گوێ مەدەنێ، ئەمانە زیندانی سیاسین و عاقڵن، دەزانن سبەی دانوستاندن دەبێت وئازاد دەکرێن،بۆیە خەمتان نەبێت ئەمانە وەکو ئەو سەر سەری و خوێڕیانەی تر ڕا ناکەن و خۆیان بەکوشت نادەن بەراستی ئێمە گوێمان لەو قسانەی ئەو ئەفسەرە گرت،بەڵام بڕوامان پێ نەکرد هێشتا هەر لەبیر کردنەوەدا بووین چونکە تەقەو دەستڕێژەکان زۆر بوون و نزیک بوون. بەهەر حاڵ ڕاستیەکەمان نەزانی تاوەکو شەو درەنگ تیمارسازی بنکەی تەندروستیەکەیان برد بۆ بەشی قورس، ئەو تیمارسازە وەکو ئێمە زیندانی بوو هەمیشە هەواڵی نوێی ناو بەندیخانەکەی پێ بوو ،ئەو شەوە لەوێ بوو تاوەکو سبەی نیوەڕۆ کە هاتەوە بەم شێوەیە ڕووداوی شەوی ڕابردووی بۆ باس کردین: (شەوی ڕابردوو لەبەشی قورس دوو زیندانی لەناو هۆڵەکەدا بووە بە شەڕیان، ئیدی ئەفسەری ئێشکگر چوو بووە ناو هۆڵەکەوە بۆیان ولەبەرچاوی ئەوانی تردا بەکێبڵ لەزیندانیەکی دابوو ،یەکێکی تر لەزیندانیەکان کە کوڕێکی گەنجی موسڵاوی بوو، بە (٦-٧) مادەی جیاواز حوکم درابوو ،لەو کاتەدا هێرشی کردبووە سەر ئەفسەرەکەو دەمانچەکەی لاقەدی دەرهێنابوو، ئینجا بەتەقەکردن بەرەو دەروازەی سەرەکی بەندیخانە ڕای کردبوو، لەو کاتەشدا هەموو زیندانیەکانی بەشی قورس، هەریەک لەجێی خۆیانەوە ڕاپەڕیبوون و بەدوای ئەو گەنجەدا بەرەو دەرەوەی بەندیخانە ڕۆیشتبوون، بێگومان شەویش تاریک بوو بوو ،ئیدی بەو شێوەیە ژمارەیەکی زۆر لەزیندانیەکان هەڵهاتبوون وهەندێکیان کوژران وبەشێکیشیان بریندار بوون وچەند کەسێکیان هەر لەشوێنی خۆیان نە جولابوون وبەسەلامەتی مابوونەوە) لەپاشاندا بۆمان دەرکەوت کە ئەو شەوە (٤٠٠)زیندانی هەڵهاتبوون، بەڵام (٣٠٠)یان دەسگیر کرابوونەوە، هەواڵەکان وایان ڕادەگەیاند کە ژمارەیەک لەوانە نەگیراونەتەوە خۆیان گەیاندۆتە تورکیا، هاوکات (٣)زیندانی

لەوانە لەکاتی هەڵهاتندا دەسگیرکرابوونەوە لەژێر لێدان و ئەشکەنجەدا گیانیان لەدەستدا. پاش ئەو ڕووداوانە بەشێکی زۆری بەندیخانەکە نۆژەن کرایەوەو ژوور وهۆڵەکان بەشێوەیەک دەستکاری کرا کە پتر ئازاری دەروونی زیندانیەکانی دەدا، بۆ نموونە پەنجەرەکانیان هێندە بچووک کردەوە تەنیا جێگای خشتێکیان بەکراوەیی هێشتەوە هێزە چەکدارەکان و پاسەوانانی ناو بەندیخانە هێندەی تر ژمارەیان زیادی کرد، ئەو دەمە پەشیمان بووین دەمانگوت بریا ئەو شەوە هەڵهاتینایە. لەسەرەتای مانگی نیسانی ئەو ساڵەدا لەرێی کەناڵەکانی تورکیاوە کۆڕەوە ملیۆنیەکەی خەڵکی کوردستانی نیشان دا زانیمان کە هێزەکانی ڕژێمی عێراق دووبارە هێرشیان کردۆتەوە سەر شارەکانی کوردستان و خەڵکی کوردستان بەکۆڕەوێکی بەکۆمەڵ وسەرانسەری بەرەو سنورەکانی تورکیا و ئێران هەڵوێستیان لەئاست هێرشی حکومەت دەربڕیوە، تەلەفزیۆنەکان منداڵ وئافرەت و پیرو پەککەوتەی کوردستانی لەوپەڕی نەهامەتی ودەردەسەری و برسێتی وبەد بەختیدا نیشان دەدا، ناو بەندیخانە لەئاست ئەو دیمەنە ویژدان هەژێنانە کپ وخامۆش بوو بەشێوەیەک هەندێ لەعەرەبەکانیش کە کەس وکاریشیانی تێدانەبو، تنۆک تنۆک فرمێسکی سۆزیان بۆ ئەو خەڵکە ئاوارەیەی کوردستان دەڕشت، پتر لە مانگێک بەسەر ئەو کۆڕەوەدا تێپەڕی ئەوانەی خەڵکی کوردستان بووین تاقە دیدەنیەکیشمان نەهات، هەرچاوەڕوان بووین کەس بەتەمای کەس و کاری نەمابوو، چونکە کارەساتەکە لەوە گەورەتر بوومرۆڤ بەتەنیا خەمی خوشک وبراو دایک وباوکی خۆی بێت.

دواجار یەکەمین دیدەنکارم هات کە مامم بوو،بەر لەهەموو شت هەوانی ماڵی باوکم پرسی پێی گوتم: ( هەموویان سەلامەتن و لەکۆڕەوەکەدا چوونەتە شاری ورمێ لەکوردستانی ئێران تاوەکو ئێستا لەوێ ماونەتەوە)، هەرلەو مانگەدا بەرەی کوردستانی وحکومەتی عێراق دەستیان کرد بەدانوستان و لەوسەروبەندە دا جارێکی دی خەڵکی کوردستانی عێراق بەزێدی خۆی شادبۆوەو خێزانە ئاوارەکان گەڕانەوە سەرماڵ ومولکی خۆیان، ئینجا وردە وردە دیدەنیکارمان دەهاتن و هەواڵی خۆشیان دەداینێ لەهەموو ئەو هەواڵانە خۆشتر ئەوەبوو کەباوک و دایکم پێیان

گوتم: (کادیران و هەڤالانی پارتی و زیندانیە کۆنەکانی برادەرم زوو زوو سەردانی مالّمان دەکەن وهەوالّم دەپرسن)، ئەوانەی لەکوردستانەوە دەهاتن باسی ئازادی وسەربەستی خەلّکیان بۆ دەکردم، هەوالّی (لەتیف)ی ناپاکم پرسی ئەو کەسەی من و سالاری بەگرت دا، پێیان گوتم لەرۆژانی راپەریندا خەلّکی راپەریو کوشتویانە،پێم خۆشبوو زۆر بەختەوەر بووم، لەراستیدا من هەرگیز حەزم بەمەرگی چۆلەکەیەکیش نەدەکرد نەک مرۆڤ، بەلاّم هەر چەند بیرم لەو لەتیفە دەکردەوە وەختەبوو دەچووم بەناخی زەویدا، چونکە سەدان گەنجی وەکو سالاری بەکوشت داو سەدانی وەکو منی خستە ئەم بەندیخانانەوە دەمویست رۆژێ لەرۆژان بەریسوایی بیبینم نەک بەکوژراوی! کەس و کارمان کە دهاتنە دیدەنی بۆیان دەگێڕاینەوە کە لەکاتی راپەرینی خەلّکدا دامودەزگا سەرکوتکەرەکان چۆن زەلالەتیان بوو بەدەست منداڵانی شارەوە، بەدەست ئەو دایکە رەشپۆشانەی کە تادوێنێ بوو رۆلّەکانیان لەو شوێنانەدا فەلاقە دەکران وهەلّدەواسران، سەرفراز بووین بەوەی رەنج و ئازارو ئەشکەنجەو ماندوو بوونی ناوبەندیخانەمان بەفیرۆ نەچووە، سەربەرزبووین کەولاّتەکەمان ئازادە، شارەکەمان سەرفرازە گەرەکەکەمان دوورە لەچاوە بەدەکانی پیاوانی بەعس.

بە شبەحالّی خۆم دەمگوت ئەگەر بشمرم گرفت نییە، هەمیشە دلّمان بەوە خۆشبوو، کە ئێمە لەم ژوورە تاریک و هۆلّە ساردو سڕانەوە، مێژوویەکمان بۆ خۆمان تۆمار کرد، ئاسوودەبووین بەوەی کە رۆژێ لە رۆژان لەم شوێنە ترسناکانەدا سەرمان بۆ دوژمن شۆڕنەکرد، هێندەی تر جۆش وخرۆشی نیشتمانپەروەری گرتینی، وەک بیرەوەریەک باسی یەکەیەکەی ئەو کێبلّ و شەق وبۆکس وئەشکەنجانەمان دەکرد، کەلە پێناو هێنانەدی ئەو رۆژەدا چەشتمان. لەو رۆژانەدا خەلّکان و خزمان و دۆستان زۆرتر دەهاتنە دیدەنیمان،رەنگ و روخسارو گفتوگۆیان بۆنی ئازادی لێ دەهات، هەموو خەندەیەک هەموو قسەیەک هەموو وشەیەک کەلەزاری ئەواندا دەهاتنە دەرێ تام و چێژی ئازادی پێوە بوو، ئیدی بەو حالّە ژیانمان بردە سەر. لەدەوروبەری مانگی ١٠ سالّی ١٩٩١ بوو،شەوێکیان رادیۆمان کردەوە،لەیەکێک لەرادیۆ جیهانیەکاندا کە بەداخەوە ئێستا ناوەکەیم لەیاد نەماوە راپۆرتێکی دوورودرێژی لەسەر بەندیخانەکانی عێراق خوێندەوە

بەتایبەتیش تیشکی خستە سەر بەندیخانەی بادوش، جگە لەوە چەند جارێک لێرەو لەوێ باس لەبەندیخانەکان وزیندانیە سیاسیەکانی عێراق کرا، هەموو ئەوانە بوونە هۆکارو هاندەرو پاڵنەرێک کەجارێکی دی بیر لەگواستنەوەمان بکەنەوە بۆ بەندیخانەی ئەبو غرێب، ئەو کات نزیکەی ساڵێکی تەواو بوو ئێمە لەبەندیخانەی بادوش بووین.

## ئەمجارەشیان ئەبو غرێب

سەعات (٥)ی سپێدەیەکی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩١، لەکاتێکدا کە تێکڕای زیندانیەکان لەقوڵایی خەودا بوون،دەرگا ئاسنەکان کرانەوە، هەموو لەخەورابووین، هێشتا هۆڵەکە تاریک بوو لەجێی خۆمانەوە تەماشای دەرگاکانمان دەکردو چاومان هەڵدەگلۆفی چەند پاسەوانێک هاتنە ژوورەوەو یەکێکیان بەدەنگی بەرز هاواری کرد: (زۆر بەپەلە تەنیا یەک چارەکە سەعات مۆڵەتتان هەیە هەموو کەلوپەلی خۆتان بپێچنەوەو ئامادەبن بۆ ڕۆیشتن) لەراستیدا کاتەکەی هێندە نائاسایی بوو بواری بیرکردنەوەمان نەبوو نەشمان دەزانی نیازی چیان هەیەو ئەمجارەیان بەرەو کوێمان دەبەن!.. پاسەوانەکان زۆر توڕەو هەڵەشەو شپرزەبوون، بۆیە لەماوەی چارەکە سەعاتێکدا خۆمان کۆ کردەوەو ئامادەبووین بۆ ڕۆیشتن، دوای ئەوەی کەلوپەلەکانمان خرایە لوریەوە، یەکە یەکە کەلەبچەیان کردین وخستیانینە ناو پاسەگەورەکانەوە، هیچ کەس لەفزی نەجوڵاند چونکە پاسەوانەکان ئامادەنەبوون وەڵامی هیچ پرسیارێک بدەنەوە، پاسەکان کەوتنە ڕێ و پشت و پاشی کەژاوەکە بە ئۆتۆمبیلی شوفرلێتی پڕ لەچەکدار (موسەلەحە) گیرابوون، کەس قسەی لەگەڵ کەسدا نەدەکرد، هەموو چرپەو وورتەیەک قەدەغەبوو، هەرچی دەمی بکردایەتەوە پاسەوانەکان وەکو گەلە گورگ تێی دەئاڵان .کاتێ لاماندا بۆ سەر هێڵی خێرا دەستبەجێ زانیمان بەرەو ئەبو غرێبمان دەبەنەوە،ئاخر وشەی ئەبو غرێب بەلامانەوە وەک مەملەکەتی ترس وتۆقان وئازار و ئەشکەنجەی لێهاتبوو، بۆیە هەرزوو سەردڵمان گیرا وەک جاری پێشوو ئۆتۆمبیلەکان لەچێشتخانەو گازینۆکانی سەر ڕێ لایان نەدا،بەڵکو پاسەکان زۆربەخێرایی مار ئاسا بەشەقامەکاندا دەکشان،سەعات (٤)ی عەسر گەیشتینە ناو بەندیخانەی ئەبو غرێب،

لەویَ لەبەشی سووک دایانبەزاندین و پاش سەر ژمێرکردن هەر (١٠)نەفەرەو کردیان بە بەشێکدا، من لەگەڵ عەزیز لازارو سەرکەوت وچەند کەسێکی تر بەر هۆڵی ژمارە (١٠) کەوتین، کە چووینە هۆڵەکەوە یاسا نامرۆییەکانی بەندیخانەی ئەبو غرێبمان بیرکەوتەوە کە زۆر لەمێژبوو لەیادمان نەمابوو،هۆڵەکە لەمسەر تا ئەوسەری قەرەوێڵەی دووقات بوو نزیکەی (٦٠)زیندانی تێدابوو، من لەنێوان دوو قەروێڵەدا لەسەر زەوی جێگایان بۆ کردمەوە، سەرلەئێوارە دووبارە لەناو هۆڵەکەدا سەر ژمێریان کردینەوە. شەو درەنگانێ بەڕێوەبەری نوێی بەندیخانە هات ولەناو هۆڵەکەدا بە بەرچاوی هەموومانەوە یەکێک لە زیندانیەکانی فەلاقە کرد، بێگومان ئەم لێدانەش تەنیا بۆ چاوترساندن و پێشوازی ئێمە بوو! بەڕێوەبەر بەهەڵەداچوو بوو، نەیدەزانی ئێمە سالانێکی زۆر پێش ئەو کاتە لەیەکە یەکەی ئەو ژوورانەدا لێدانمان خواردووەو ئەشکەنجە دراوین. نەیدەزانی ئێمە زۆر لەمێژە بەو ئازارانە ئاشنابووین وبەلامانەوە ئاساییە!! پاشان بەڕێوەبەری بەندیخانە ڕووی کردە ئێمەو پێی گوتین: (ئێوە هەموو کوڕی باشن و گلەییمان لێتان نییە، بەلام ئاگادارین لەم خوێڕی وسەر سەریانەی ئێرەوە فێری ڕەفتاری خراپ نەبن، زۆر لەزیندانیەکانی ئەو هۆڵە زیندانی سیاسی نەبوون، بەڵکو بەتاوانی دزی و ڕێگری و پیاوکوشتن حوکم درابوون، بۆیە ئێمە زۆرمان پێ ناخۆشبوو لەناو ئەو خەڵکە خراپەدا دانرابووین ئەگەرچی هەندێ لەزیندانیە کۆنە سیاسیەکانیش لەو هۆڵەدا بوون، بەلام بەگشتی خەڵکێکی پیس و پۆخڵ بوون ڕۆژێکیان ئەبو فورات و ئەبو مەحمود کە پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ بەڕێوەبەری بەندیخانە هەبوو داوایان کرد کە زیندانیە سیاسیەکان لەو خەڵکە دزو ڕێگرە جودا بکەنەوە ئەوەبوو هۆڵێکی تایبەتیان بەناوی (بەشی یەکەم) بۆ تەرخان کردین، ئیدی لەو ڕۆژەوە کەمێک حەواینەوەو پاک وخاوێنی هۆڵەکەمان ڕاگرت، هەندێ لەزیندانیە عەرەبەکان ئیرەییان بە ئێمەی خەڵکی کوردستان دەبرد، کە لێمان نزیک بوونەوە پێیان دەگوتین: (خۆزگەمان بەخۆتان، کەس و کارتان لەژێر دەستی ڕژێمی عێراقدا نەماوە،خۆزگەمان پێتان ئێوە هێزێکی گەورەی پێشمەرگەرتان لەپشتەو سەرکردەی دڵسۆزتان هەیە و لێتان دەپێچنەوە وەکو ئێمە بێ ساحێب نین!) ئیدی بەو شێوەیە

ڕۆژانمان دەگوزەراند ئەو ماوەیە ئومێدی ئەوەمان هەبوو کە ئازاد بکرێین، بۆیە لەڕووی دەروونییەوە تارادەیەک ئاسوودە بووین ڕۆژانە هۆڵەکەمان خاوێن دەکردەوە کۆمەڵێ خەڵکی بێ گرفت و کێشەبووین. ڕۆژێکیان بەڕێوەبەری بەندیخانە هات و لەسەر پاک وخاوێنی هۆڵەکەمان زۆر ستایشی کردین، پاشان گوتی: ( چیتان پێویستە من ئامادەم هاوکاریتان بکەم) هەموو پێمان گوت گۆڕەپانی تۆپی پێمان بۆ دروست بکەن و هەوڵ بدەن لە ڕۆژانی دیدەنیدا کەس و کارمان زۆرتر لامان بمێننەوە چونکە لەڕێگەی دوورەوە دێن. ئەوەبوو هەردوو داخوازییەکەی بۆ بەجێ هێنایین ئەبو تولفاح کە یەکێک بوو لەوانەی نزیکەی (١٦)ساڵ بوو لەبەندیخانەدابوو بە بەڕێوەبەری گوت: (حەق نییە ئێوە هەرگیز لەزیندانی سیاسی بدەن، چونکە حوکم دراون و بێ گرفت ماوەکەی خۆیان تەواو دەکەن) بەڕێوەبەر بۆ ئەو پێشنیارەش سەری ڕەزامەندی لەقاند، ئەو ماوەیە ئەبو غرێب لەهەموو کاتێک ئارامتر بوو،کەس و کارمان کە دەهاتنە دیدەنیمان زۆر دڵنەواییان دەداینەوە دەیانگوت ئومێدێکی زۆر هەیە کە ئازاد بکرێن.

# ساڵی ١٩٩٢ بڕیاری لێبوردن و مانەوەی ئێمە!!

لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٢ دا وەک هەموو لایەکمان مەزەندەمان دەکرد، ڕژێمی عێراق بڕیارێکی دیکەی لێبوردنی بۆ زیندانیەکان دەرکرد، ژمارەیەکی زۆر لە زیندانیە کوردستانیەکان بەربوون، بەڵام دیسان ئێمەی نەگرتەوەو لەو لێبوردنەش نا ئومێدبووین و ئەمجارەشیان کۆمەڵێک زیندانی ماڵئاواییان لێ کردین و ئێمەیان بۆ ئەو ڕۆژە ڕەشانەی نێو بەندیخانە جێ هێشت،ئێمە وا لەگەڵ دەنگی ئەو دەرگا ئاسنانەدا ڕاهاتبووین دەمانگوت ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان ئازادیش بکرێین ڕەنگە بەرگەی ژیانی دەرەوە نەگرین،ئاخر خودی خۆم ئەوە حەوتەمین ساڵی ژیانی بەندیخانەم بوو خەریک بوو دیمەنەکانی سلێمانیم بیر دەچۆوە، هەندێ جار بیرم لەڕەنگ و روخساری کوڕان وکچانی گەڕەک دەکردەوە، شێوەی هیچیانم لەیاد نەمابوو،وەخت بوو کۆڵانەکانی سەرچناریش لەبەر چاوما ڕێشکەو پێشکە بکەن،چونکە ئەوە حەوتەمین ساڵ بوو من ڕۆژانە لەدەرگای ئاسن و دیواری بەرزو جەلادو پاسەوان و سیما مەینەتبارەکانی بەندیخانەو قەرەوێڵە دووقاتەکان زیاتر هیچی دیکەم نەدەبینی، وام دەزانی ئەو وڵاتە هەر هەمووی پێک هاتووە لەم ٢٠ مەترەی کەمن و زیندانیەکانی تری تێدا دەژیاین. لەنێو ئەو بەندیخانەیەدا بەشێکی تایبەت هەبوو کۆمەڵێ زیندانی جینائی تێدابوو کەبەهەندێ تاوان حوکم درابوون، جیاوازی ئەو بەشە لەگەڵ ئەوانی تردا ئەوەبوو کە زیندانیەکانی ئەو بەشە تایبەتە دەیانتوانی هەر سێ مانگ جارێک هەفتەیەک مۆڵەت وەربگرن ولەنێو کەسوکاری خۆیاندا بمێننەوە، پاشان بەپێی خۆیان دەگەڕانەوە ناو

بەندیخانە لەسەرویەندی ئەو لێبوردنەدا ئەو زیندانیانەیان هێنایە ناو ئێمەو مۆڵەت پێدانیان لێ قەدەغە کرا، هەندێکیان هێندە لەسەر ئەو مۆڵەت وەرگرتنە راهاتبوون بەو بڕیارە خەمۆکی دایگرتن و چەند جارێک هەوڵی خۆکوشتنیان دا،بەڵام کاتێ بەتەواوی ئێمەیان ناسی وزانیان کە هەریەکەمان ماوەی (٧-١٠-١٥-٢٠)ساڵە دەرەوەی بەندیخانەمان نەدیوە،کەمێک هێور بوونەوەو سەبوری بەدڵیاندا هات، ئەو ماوەیە برسێتی و گرانی وقات و قڕی سەرانسەری عێراقی گرتبۆوە، ژێرخانی ئابووری عێراق هەڵتەکیبوو ئاسەواری شەڕێکی دوژاو بەرووخساری بەرپرسانی بەندیخانەشدا دەردەکەوت، ئەو گرانی و قات و قڕیە بەشێوەیەکی زۆر خراپترو سەختتر ناو بەندیخانەشی گرتبۆوە، جا ئێوە لەخۆتان بپرسن حکومەتێک نەتوانێ نانی سوپاکەی بدات،ئاخۆ چی دەداتە کەسانێک کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لەدژی وەستاون و ئێستا لەژێر چەپۆکی خۆیدان! ئەو ماوەیە ڕۆژانە تەنیا یەک نانی بۆریان دەدایە زیندانی، هەژاری بینەقاقای خەڵکی عێراقی گرتبۆوە، بێگومان باری گوزەرانی خەڵکی کوردستانیش لەخەڵکی ناوەڕاست و باشووری عێراقیش خراپتر بوو، چونکە جیا لەو گەمارۆ ئابوورییە دەرەکیەی کە خرابووە سەر عێراق و کوردستانیشی گرتبۆوە، خودی حکومەتی عێراقیش دووبارە گەمارۆیەکی ناوخۆیی بەسەر کوردستاندا سەپاندبوو، بەسیمای ماندوو هەژاری کەس و کارماندا دیاربوو، کە فشارێکی ئابووری زۆر دەخەنە سەر خۆیان بۆ ئەوەی بتوانن سەردانی ئێمە بکەن وخواردن و پێداویستی و پارەمان بۆ بهێنن، ئەوانەی دەهاتنە دیدەنی زیندانیە عەرەبەکان زۆربەی هەرە زۆریان ئافرەت و منداڵ بوون، چونکە لەو بارودۆخەی عێراقدا پیاوەکان یان سەربازبوون و لەریزی سوپای عێراقیدا بوون،یاخود لەو شەڕانەدا کوژرابوون، یان وەکو ئێمە لەبەندیخانەکاندا بوون یاخود کەم ئەندام و سەرقاڵی پەیداکردنی نانی ڕۆژانەیان بوون،یاخود ئەوەتا لەداخی ئەو بارە ناهەمواره سەری خۆیان هەڵگرتبوو. هەر لەسەرەتای ئەوساڵەدا شەوێکیان دووبارە بەڕێوەبەری بەندیخانە هات وزۆر ریزی لێ گرتین، تەنانەت ریزیان لەکەسوکاریشمان دەگرت و هەندێ جار لەکاتی هاتنیان بۆ دیدەنیمان نەشیان دەپشکنین، ئەوشەوە پاش ئەوەی بەڕێوەبەر زۆر قسەی بۆ کردین لێمان پرسی:( چیتان

لەسەر ئێمە بیستووە، بۆچی ئازاد ناکرێین و هیچ بڕیارێکی لێبووردن نامان گرێتەوە، ئەو خەڵکانەی کە ئازادتان کردون لەسەر هەمان ئەو تاوانەی ئێمە گیرابوون، ئیدی بۆچی ئەوان دەگرێتەوەو ئێمە ناگرێتەوە؟) بەڕێوەبەری بەندیخانە لەوەڵامدا گوتی: ( بڕواتان بێت هیچ زانیارییەک لەبارەی ئێوەوە نازانم، ئەگەر حەز دەکەن تەلاقتان بۆ دەخۆم، ئێمە تەنیا بەفەرمانی سەرووخۆمان زیندانی ئازاد دەکەین) بێگومان بۆ ئەو شوێنە ناخۆشەو ئەو ڕۆژە ڕەشە ئەو قسانە بەلامانەوە خۆش بوو،پاش ئەوە وەک هەمیشە موحازەرەیەکی لەسەر نیشتمان پەروەری داینێ!!! بەڕێوەبەری بەندیخانە زۆر دڵی بە پاک وخاوێنی هۆڵەکەمان خۆشبوو، بەراستی ئەو ماوەیەش هیچ کێشەو گرفت و هەراو بەزم و ڕەزمان نەبوو بۆیە زۆر ڕێزی دەگرتین.

## شەو نییە خەوتان پێوە نەبینم

دەمزانی (٧)ساڵ زۆرە بۆ گەنجێکی وەکو من کەلەبەندیخانەدا بمێنێتەوە، هێشتاش دڵنیانەبووم چەند ساڵی تر دەمێنمەوە، دەمزانی حەوت ساڵ دابڕان لەژیانی ئاسایی ناوکۆمەڵ لەخویندن و خوێندنەوەو فێربوون، کارێکی قورسەو لەدوارۆژدا ئەگەر بمێنم زۆرم لەسەر دەکەوێت، ئەو ماوەیەشم بەهەلێکی باش زانی کە کەس و کارم لەڕۆژانی دیدەنیدا بەنهێنی هەندێ کتێبی بەسوودم بۆ بهێنن،ئەوەبوو دوو کتێبی بەهاداریان بۆ هێنام کە شەوانەڕۆژی بەندیخانە من وهەندێ لەو زیندانیانەی زۆر متمانەم پێیان هەبوو زۆر چێژمان لە خوێندنەوەیان وەرگرت، ئەو دووکتێبەش یەکەمیان نامیلکەیەکی مامۆستای شاعیر عەبدوڵڵا پەشێو بەناونیشانی (شەو نییە خەوتان پێوە نەبینم) و کتێبێکی عەرەبی بەناونیشانی (عشرە أيام هزت العالم) بوو چەندین جار ئەو نامیلکەیەی پەشێوم خوێندەوەو لێی تێر نەدەبووم وام لێهاتبوو زۆر شیعرەکانیم لەبەر کردو تاوەکو ئێستا لەیادم ماون. دەتوانم بڵێم ئەو ڕۆژانەشمان لەچاو ژیانی بەندیخانەدا تاڕادەیەک هێمن بوو. بەرلەکۆتایی مانگی ئایاری ئەو ساڵە لەناوبەندیخانە دا بیستمان کە لەکوردستان هەڵبژاردنی پەرلەمان ئەنجام دراوەو مژدەی ئەوەشیان دامێ کە پارتی دیموکراتی کوردستان سەرکەوتنی بەدەست هێناوە،وەخت بوو لەخۆشیدا باڵ بگرم، ئەو ڕۆژە هەڤاڵانی پارتی

لەناویەکدیدا بەنهێنی پیرۆزباییمان دەکرد، لەراستیدا خودی پرۆسەی هەڵبژاردنەکە بۆ هەمووکوردستانیەک مایەی سەربەرزی و سەرفرازی بوو،هەندێ لەو زیندانیە عەرەبانەی کە ئاستی رۆشنبیریان بەرزبوو،زۆر بەریزەوە ئەو پرۆسەیەیان هەڵدەسەنگاند تەنانەت یەکێک لەو برا عەرەبانە هاتە لامەوەو بەچرپە پێی گوتم: (ئەنجامدانی ئەو هەڵبژاردنە لەکوردستاندا نیشانەی ئەوەیە کە رەنجی ئێوە لەم بەندیخانەیەدا بەفیرۆ نەچووە) ئەو رۆژانە لەهەموو کاتێک زیاتر شانازیم بەکوردستانی بوونی خۆمەوە دەکرد، یادی ئەو رۆژەم دەکردەوە کە لەگەڵ سالارو بێستوون وفەرە لوتپاندا بەرەو پێشمەرگایەتی دەرۆیشتین، لەدڵی خۆمدا دەمگوت ئای ئێستا دەبێ شاروشارۆچکەکانی کوردستان چەند خۆش بن، هەمووجارێ لەبەرخۆمەوە لەخودا دەپاڕامەوە دەمگوت:( خوایەگیان یارمەتیم بدە تەنیا ئەگەر بۆیەک رۆژیش بێت کوردستان ببینم بەئازادی و دوور لەسەرو فەسالی پیاوانی بەعس و ئەمن و دەزگا سەرکوتکەرەکان) زۆر شەو خەونم بەوەوە دەدی من و هەڤاڵانم دەگەڕاینەوە سلێمانی ولەدوریانەکەی سەرچنار خەڵک پێشوازییان لێ دەکردین، هەمووجارێ لەو خەونە خۆشەدا گرمەی دەرگا ئاسنەکەی بەندیخانە بەخەبەری دەهێنام و خەونەکانم دەتۆران. بەهەر حاڵ هەر لەو مانگەدا ئێوارەیەک سەرلەنوێ لەنێو بەندیخانەدا دەنگۆی ئەوە بڵاو بۆوە کە ئازاد بکرێین، بەو دەنگۆیانە بەختەوەربووین،چەند جارێک پاسەوانەکانمان بانگ کردو لێمان پرسین ئاخۆ سەبارەت بە ئێمە هیچ زانیاری نوێ هەیە ؟، پاسەوانەکانیش دەیانگوت رێنمایی نوێ دەربارەی سەرجەم زیندانیە سیاسیەکان هاتووە، بەڵام هێشتا ئێمەش بەتەواوی نازانین .ئەو ماوەیە بارودۆخی ناوبەغداش تەواو نەبوو، کارەبای پایتەختی عێراق پچڕ پچڕ بوو هەر لەنێو بەندیخانەدا بیستمان گوایە لەهەندێ گەڕەکی بەغدا راپەڕین رویداوەو هێزە چەکدارەکانی رژێم بەچەکی قورس خەڵکی راپەڕیویان سەرکوت و دەمکوت کردۆتەوە،ئەو ماوەیە خەڵکێکی زۆر دەگیران وژمارەیەکی زۆریش ئیعدام کران، بە پێی قسەی ئەوانەی دەهاتنە دیدەنیمان بارودۆخی ناو شاری بەغداش شڵۆق وئاڵۆز بوو،بەرپرسانی بەندیخانە زۆر لەو بەشەی ئێمە دەترسان چونکە زیندانی سیاسی بووین و لەهەموو ئان و ساتێکدا ئەگەری ئەوە هەبوو کێشەیەکی

گـەورە بنێـینەوە، بۆیە بەڕێوەبەری بەندیخـانەی بەشی سـووک ژێراو ژێر هەوڵی دەدا لەویەشـەی ئەو نەمـێنین وبمانگوازنەوە بۆ بەشـێکی دیکە، ئەوەبوو هەوڵەکـانی بەئاکـام گـەیشت و پاش چەند ڕۆژێک دووبارە بەئۆتۆمبیل خۆمان وکەل وپەلەکانمانیان گواستەوە بۆ بەشی قورس بەشە کۆنەکەی خۆمان، ئەو شوێنەی بیرەوەری سالانێکی زۆری خۆمانی پێوە بوو، ئەو شوێنەی یادەوەری دەیان برادەرو هەڤاڵ و هاوڕێی خۆشەویستی تێدابوو ئەوانەی ئازادکران، ئەو خۆشەویستانەی کە شەوانە پێکەوە دادەنیشتین و کۆڕو مەجلیسمان گەرم دەکردو بەڕۆژیش لەنێو گۆڕەپانەکاندا سەرقالی وەرزش و گەمەی قوتبۆڵێن بووین. کە چووینە هۆڵە کۆنەکەی خـۆمـان وەک سیناریۆیەک هەمـوو ڕۆژانی رابردووم بیـرکـەوتەوە، هەندێ لەزیندانیە کۆنەکانی تێدا مابوون، ئەوانەی لەساڵی ١٩٨٦ەوە بەیەکتری ئاشنا بوو بووین بەتایبەتی ئەوانەی بەتاوانی سیخوڕی حوکم درابوون وهیچ لێبوردنێک نەیدەگرتنەوە، بێگومان کۆمەڵێک زیندانی نوێشی تێدا بوو ئەو (١١٠)کەسەمان دابەشکراین بەسەردوو هۆڵدا هەر هۆڵی (٥٥)کەس، ئەمە وێڕای زیندانیەکانی تر. لەو زیندانیە نوێیانەی کە لەو هۆڵەی ئێمەدا بوون کوڕێکی کوردی فەیلی تێدابوو بەناوی (فوئاد)ەوە ئێستا لەدەرەوەی وڵاتە! ئەو فوئادە کەزانی ئێمە زیندانی کۆنین و خەڵکی کوردستانین زۆر دڵی پێمان کرایەوەو پێشوازیەکی گەرمی لێ کردین، هەر ئەو شەوە نان و چاو مـــاســـتی بۆ هێـنایـن بۆمـن و عـــەزیـز لازارو هاوڕێ (ل).
سەعات(١٢)ی یەکەمین شەوی ئەو هۆڵەمان سەرژمێریان کردینەوە وامان دەزانی ئەوە یەکەمین ڕۆژی بەندیخانەیە، لەو کاتەدا لەبیرکردنەوەی ئەوە دا بووین چۆن هەواڵ بۆ کەس و کارمان بنێرین کە ئێمە لە بەندیخانەی بەشی سوکەوە گوازراوینەتەوە بۆ بەندیخـانەی بەشی تایبـەت. دواجار پێم گوتن لێم گـەڕێن ئێـستـا مـن چارەسـەری دەکـەم، هەسـتـام و چوومـە لای دەرگـا شیشبەندەکەوە پاسەوانێکم بانگ کرد، لەراستیدا بەدرێژایی ئەو سالانەی بەندیخـانە ئەزمـوونێکی باشم پەیدا کـردبوو لەچۆنێـتی خۆ نزیک کـردنەوە لەپاسەوانەکان و بەکـارهێنانیـان لەبەرژەوەندی زیندانیـەکان ئەو پاسـەوانە کلیلی هەموودەرگاکانی پێ بوو، بۆیە کە بانگم کرد زۆر ترسا، چرچاوی تێک چوو، بەجارێ پەشۆکاو هەر سـەیری ئەملاولای خۆی دەکـرد، منیش

پێم گوت: (زەحمەت نەبێ تەنیا وەرە پێشەوە گرفتێکی بچوکم هەیە ئەگەر بتوانی بۆم چارەسەر بکەیت زۆر مەمنونت دەبم) سەرەتا نەهاتە پێشەوە، پاشان جگەرەیەکم بۆ دەرهێناو دووبارە گوتم:( فەرموو جگەرە بکێشە) ئەویش دەستبەجێ هاتە پێشەوەو جگەرەکەی وەرگرت، منیش بەهەلم زانی و پێم گوت: (دەمەوێ بچیتە گەراجی سلێمانی و بەیەکێک لەشوفێرەکان بڵێی، ئەوانەی لەبەندیخانەی بەشی سوک زیندانی بوون گوزراونەتەوە بۆ بەشی تایبەت چیشت دەوێ هاوکاریت دەکەم) پاسەوانەکە بەترسەوە کەمێک سەری بەملاولادا سووڕاندو گوتی:( بەیانی قسە دەکەین!!) ئەوەبوو بەیانی زوو دوای سەر ژمێرکردن لەپەنایەکەوە بڕێک پارەم دایە لەگەڵ پاکەتێک جگەرەدا.

پاشان لەسەر پارچەکاغەزێکی بچووک ناونیشانی ماڵی خۆمانم بۆ نووسی، ئیدی پاسەوانەکە رۆیشت و پاش دوو رۆژ گەڕایەوە لام ولەپەنایەکدا پێی گوتم هەواڵەکەم نارد، ئەوەبوو پاش (٥-٦)ڕۆژ کاتی دیدەنی کەس و کارمان بوو، هەرلەبەیانیەوە تاوەکو سەعات (١١)ی پێش نیوەڕۆ چاوەڕوان بووین ئینجا کەس و کارمان هاتن، بەڵام گوتیان کەس هەواڵی ئێوەی پێ نەگەیاندوین، وەلێ دڵم بەوەخۆشبوو کە دایکم دەیگوت:(هەڤاڵانی پارتی و برادەرە زیندانیە کۆنەکانت زوو زوو سەرمان لێ دەدەن و هەواڵتان دەپرسن).

## سەهۆڵ فرۆشی بەندیخانە

لەدەوروبەری مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٢ دا هەستم دەکرد ماڵەوەمان باری داراییان تێکچووەو لەقورگی خۆیانی دەگێڕنەوە دەیکەنە پارەو بۆ منی دەهێنن، دەمویست کارێک بکەم کەمتر پێویستم بەپارەی ئەوان بێت،لەنێو بەندیخانەشدا حانووتێک هەبوو سەهۆڵ و هەندێ پێداویستی تری دەفرۆشت و ڕۆژانە زیندانیەکان دەچوون لەو حانووتە کەل و پەل وخواردەمەنی هەندێ شتی پێویستیان دەکڕی، لەراستیدا ئەوەی لەسەر حانوتەکەش بوو هەر زیندانی بوو، بۆیە بڕیارم دا بچم ڕۆژانە بەعەرەبانە سەرهۆڵ بێنم و لەنێو ژوورو هۆڵەکانی بەندیخانەدا بەقازانجێکی کەم بەزیندانیەکانی بفرۆشمەوە، چونکە حانووتەکە دووربوو

لەهۆڵی زیندانیـەکـانەوە ئەوەبوو دەسـتم دایە ئەو ئیـشـەو تا ئەو ڕۆژەی ئازادیش کـرام هەر سێ ڕۆژ جـارێک زسـتـان و هاوین ئەو کـارەم دەکـرد. بەرپرسـانی بەندیخـانە تارادەیەکی باش فشـاریان لەسـەر کەم کـردبووینەوە لەنێو زیندانییەکاندا سیخوڕو خەڵکی خراپ کەم بوون کاروباری ڕۆژانەمان بەرێکوپێکی دابەش کـردبوو هەر زیندانیـەک باری گـوزەرانی خـراپ بوایە هەمـوو پێکەوە کـۆمـەک و هاوکـاریمان دەکـرد، لێـدان و ئەشکەنجـە و سـوکـایەتی پێکردن نەمـابوو، گـیـروگـرفت کـەم بوو بۆوە زیندانیـەکـان هەمـووخـەڵکی باش وبەرێزبوون خۆ ئەگـەر تاک و تەرا خـەڵکێکی نەفس نزمیشی تێدا بوایە، بێ شک هیچی پێ نەدەکرا، ئەم بارودۆخە تارادەیەک بۆ زیندانی خـۆشـە،چونکە بەندیخـانە تەنیـا دەرگـا لێ داخستن ودابڕانی مـرۆڤ نییـە لە ئازادی و ژیانی ئاسایی ناو کۆمـەڵ، بەڵکو لەودیو دەرگـا ئاسنەکانەوە دەیان و بگرە سـەدان تەنگو چەڵەمـەو کێشەو گـرفـتی لابەلا تووشی مرۆڤی زیندانی دەبێت کەلەمەزەندەی عـەقڵدا نییە، بەم شێوەیە ساڵی ١٩٩٢شم لەنێو بەشی تایبەتی بەندیخانەی ئەبو غرێبدا بردە سەر. ئەگەرچی لەکۆتایی ئەو ساڵەدا بارودۆخ بەرەو خراپی چووەوە.

# ساڵی ١٩٩٣ نوێ بوونەوەی برینەکان!

بژێوی قورس و گرانی کەس و کارمان لەدەرەوەو گوزەرانی نا هەمواری خۆمان لەنێو بەندیخانەدا خەمۆکی و بێ تاقەتی و ڕەشبینی زیندانیەکان و بەدرەفتاری وبرسێتی پاسەوانەکان وبەرپرسانی قەفەزی گەورەی بەندییەکان بەهیچ شێوەیەک هانی نەداین و بواری بۆ نە ڕەخساندین کەشەوی سەری ساڵی ١٩٩٣ وەک ساڵانی رابردوو ئاهەنگە بچکۆلەکان بگێرین. ئەو زستانە هۆڵەکان هێندەی ئەشکەوتی قەد چیا بەرزەکان ساردو سڕو نسرم بوو، زۆپاو سوتەمەنی و گەرمکەرەوەی هۆڵەکان نەمابوو خواردنەکانی جارانیش نەما، ڕۆژ تا ئێوارە نانە ڕەقیان دەداینێ، بەدوو هەفتە جارێکیش زیندانیان چاویان بەکەوچکێک برنج نەدەکەوت دەرگاکردنەوەو چوونە نێو گۆڕەپانی ئێواران قەدەغە کرابوو، ئەو ساڵە بەندیخانەی ئەبو غرێب تەنیا قەدەغەیەک و دووان و سیانی تێدانەبوو، بەڵکو قەدەغستان بوو! فشارو ئەشکەنجەی دەروونی سنوری تێپەڕاند بوو بۆیە باری دەروونی زیندانییەکان داڕماو و تێکشکا و بوو هەریەک لەزیندانیەکان ڕۆژبەڕۆژ بەرەو گۆشەگیری دەچوون ، ژیانی ڕۆژانەمان یەک قاڵبی وەرگرتبوو هیچ گۆڕانکارییەک لەئارادنەبوو. سپێدەیەکی زووی مانگی شوباتی ١٩٩٣ کوڕێکی ئەسمەری ڕەشتاڵ و سمێل ئەستووریان بەسەرو پرچی تاشراوەوە کرد بەژووردا ئەو گەنجە سیمایەکی خەمئامێزی شکستخواردووی پێوە بوو، پاسەوانەکان هیچ جێیەکیان بۆتەرخان نەکرد، ئەویش لەگۆشەیەکی هۆڵەکەدا لەسەر یاتاخەکەی خۆی بەخەمباری دانیشت، ئەودەمە سەرژمێری بەیانیانمان پێ ئەنجام درابوو سەرقاڵی ئامادەکردنی خوانی بەیانی بووین، بەر لەهەموو کەس فوئاد وهاوڕێ

(ل)چوون بەخێرهاتنیان کرد.
ئەو گەنجە عەرەبە پێ دەچوو یەکەمین جاری بێت ئاوها بەزەلیلی و بەبێ دەسەڵاتی خۆی ببینێت، منیش بەشێوازی خۆم ڕێزم لێ ناو بەهاوڕێ (ل)و فوئادم گوت: (ئەو کوڕە گەنجە بهێنن و وەرن لای من نان بخۆن) سەرەتا شەرمی دەکرد، بەڵام پاش ئەوەی زۆرمان لێ کرد، ئینجا هاتەلامان وخۆمان بەیەکتر ناساند، ئەو گەنجە ئەفسەر بوو لەسوپای عێراقیدا چوار (نوط الشجاعە)ی لەلایەن سەدام حوسێنی سەرۆکی دەسەڵاتی بەعسەوە پێ بەخشرابوو ماوەیەکی زۆر لە سلێمانی خزمەتی سەربازی ئەنجام دابوو، خەڵکی سلێمانی زۆر خۆش دەویست، نزیکەی (٨)مانگ بوو لە ژێر لێکۆڵینەوەدا بوو بەتۆمەتی ئەوەش حوکم درابوو گوایە جنێوو قسەی نەشیاوی بەسەرۆکی عێراق گوتووە! ،بەڵام ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە تاوانی لەو شێوەیەی ئەنجام نەداوە پاشان دکتۆر حوسێن پێی گوتین ڕێزی لێ بگرن ئەوە پیاوێکی بەڕێزو ڕێکوپێکە، ئەو دکتۆر حوسێنە کە پتر لە (٨)ساڵ بوو زیندانی بوو ،هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرابوو لەبواری جیۆلۆجیدا د. حوسێن کاتی خۆی فەرمانبەری سەفارەتی عێراقی بوو لەروسیا، ئەو ماوەیە تەها یاسین ڕەمەزان زۆر هاتوچۆی روسیای کردبوو، ئیدی یەکێک لەفەرمانبەران لەناو سەفارەتدا بەزمانێکی نوکتە ئامێز گوتبووی: (چیە ئەوە تەها یاسین ڕەمەزان هەموو ڕۆژێک لەروسیایە!!) د.حوسێن و کچێکی مەسیحی کە هەر لەسەفارەت فەرمانبەربوو بەو قسەیە پێکەنینیان هاتبوو، ئیدی هەمان ڕۆژ لە روسیاوە د. حوسێن وکچە مەسیحیەکەیان هێنا بۆوە بۆ ناو بەندیخانەی هەواڵگری (موخابەرات) و ئینجا لەوێوە بۆ لێکۆڵینەوەو پاشان دادگایی کرابوون و بەتۆمەتی سیخوڕی حوکم درابوون، بەهەر حاڵ چاودێری هۆڵ هات وگوتی ئەگەرجێتان هەیە ئەو زیندانیە تازەیە لای خۆتان دابنێن منیش لای خۆم جێگەم بۆ ئەو ئەفسەرە کردەوە، ئەو ئەفسەرە دیاربوو لەنێو سوپادا گەنجێکی ئازابوو بوو خزمەتێکی زۆری ڕژێمی عێراقی کردبوو لەبواری سەربازیدا زۆرجار باسی ڕۆژانی شەڕی عێراق و ئێرانی بۆ دەکردین و باسی چۆنێتی وەرگرتنی (نوط الشجاعە)کانی بۆ دەکردین، هەمیشە تەماشای ئەو کوڕە گەنجەم دەکردو بیرم لە ڕەفتارەکانی ڕژێمی عێراق دەکردەوە ئاخر خۆ تەنیا بۆ

ئێمەی خەڵکی کوردستان ئاوها خوێنڕێژو سەرکوتکەرو زۆردار نەبوو، بەدرێژایی ئەوساڵانە من لەزیندانیەکان وردەبومەوە ، (پیر، گەنج، هەرزەکار، منداڵ وئافرەت) ...(کورد، عەرەب، ئاشوری، تورکمان).. (مەسیحی، ئیسلام،، ئێزیدی) ..( شیعە، سونی، فەیلی،..هتد) ئیدی هەمەچەشن وهەمەڕەنگ و هەمەنەتەوەو هەمە ڕەگەزو هەمە ئایین و هەمە مەزهەب لەخەڵکی عێراق لەنێو بەندیخانەکانی عێراقدا دەبینران.

( سیاسی. نا سیاسی، هەژار، دەوڵەمەند، عەشایر، پیشەکار، قوتابی، پۆلیس، خاوەن بڕوانامەی بەرز، سەرباز، ئەفسەر، ڕۆشنبیر، نەخوێندەوار....هتد) هەموو ئەم چین و توێژانە بێبەش نەبوون لەئازارو ئەشکەنجەکانی نێو ژووره تاریک و ساردو نوتەکەکانی بەندیخانەکانی ڕژێمی عێراق، دیمەنەکان دزێو مایەی نیگەرانی بوو، خەمەکان یەکجار قوڵ و یاساکان زۆر بێ بنەمابوون. بەهەر حاڵ ئەوساڵە دۆخی بەندیخانە ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو خراپترو کەش وهەوا سات لەدوای سات ترسناکتر دەبوو، ئەشکەنجەو لێدان دەستی پێ کردەوە، بەشێوەیەک ڕۆژ نەبوو یەکێک لەزیندانیەکان بە بەرچاوی هەموومانەوە فەلاقە نەکرێت، ئیدی هەر جارەی بەبیانوو پاساوی جیاجیا . من بەردەوام بووم لەسەهۆڵ فرۆشتن لەوێش سوکایەتی پێ کردن هەبوو، ڕۆژی وا هەبوو بە ئەنقەست وبەبێ هیچ هۆیەک دوو دانە سەعات لەبەرەم حانووتەکە دا ڕایان دەگرتم،ئیدی کاتێ سەهۆڵەکەم دەهێنایە بۆ زیندانیەکان هەمووی دەتوایەوەو تەنیا توێژەڵێکی تەنکی بە ئەستورایی تەبەقێک شووشەی پەنجەرە دەمایەوە، هەردوو ڕۆژ جارێک ئەمنەکان دەهاتن و ژوورو هۆڵەکانیان دەپشکنین، بێگومان تەنیا بۆ وەڕسکردن وجاڕس کردنی زیندانیەکان بوو نەک گەڕان بۆ شتێکی قەدەغە کراو! چونکە زۆربەی جارەکانی پشکنین لەکاتی نانخواردن و نووستن وحەوانەوەدا ئەنجام دەدرا، ئەوە جیا لەوەی لەکاتی پشکنیندا هەرجارەی پارەی سێ چوارێکمان دەدزراو نەشمان دەتوانی قسە بکەین. هەندێ جار لە حانووت تەماتەی نوێ دەهات، تەماتەش یەکێک بوو لەوخواردەمەنیانەی هەموو زیندانیەکان پێویستیان پێی بوو،کەچی هەتا بەرتیلمان نەدایە بە پاسەوانەکان نەیان دەهێشت بچین تەماتە بکڕین، دانیشتن و کۆڕو کۆبوونەوەو قسەکردن لەگەڵ یەکدی بۆ زیندانیەکان قەدەغە

بوو ،هەر کەسێکیش سەرپێچی لەو بڕیارە بکردایە بە بەرچاوی هەموانەوە فەلاقە دەکرا، جاری وا هەبوو بە دیار فیلمێکی خۆشی شەوانی تەلەفزیۆنی بەغداوە دادەنیشتین، هەموو بەتاسەو حەزەوە چووبووینە قوولایی ڕووداوەکانی فیلمەکەوە ،ئەوەندەمان دەزانی پاسەوانێکی بێ هەست دەهاتە هۆڵەکەوەو بەبێ حسابکردنی بۆ ئەو هەموو بینەرە تەلەفزیۆنەکەی دەکوژاندەوە، ئیدی تازەترین شێوازی ئازارو ئەشکەنجەی دەروونی دەبینرا، هەندێ جار کەسانێکی بەرێزو قورس و سەنگین هەبوون لەنێو زیندانیەکاندا زۆر ڕێزیان لێ دەگیرا، بۆ نموونە سەید محەمەدێک هەبوو پیاوێکی نوورانی و ڕوح شیرین و بێ دەنگ وبەڕێز بوو، بەتایبەتی زیندانیە شیعەکان زۆر ڕێزیان لێ دەگرت، هەمیشە لەو ژوورەی خۆیدا خەریکی نوێژکردن و خەڵوەتی دنیای خۆی بوو ،هەرگیز نەدەهاتە دەرەوە، بەرادەیەک هەتاو لێی نەدەداو پێستی دەموچاوی توێخی سپی هەڵدەدا، سەید محەمەد سەیدی ڕەوزەی حوسەینیەبوو، بێگومان نەهاتنە دەرەوەی بۆ نێو گۆڕەپان و ناو زیندانیەکان لەبەر خاترو بەرژوەندی زیندانیەکان بوو ،چونکە دەیزانی ئەگەر بێتە دەرەوە ،خەڵک سڵاوی لێ دەکات ودەیدوێنێ، بێشک قسەکردنیش لەگەڵ سەید محەمەد سزای گەورەو ئەشکەنجەو لێدان وهەندێ جار بەندکردنی نێو ژووری تاکە کەسی و مەحجەری تێدابوو، سەید محەمەد نزیکەی (١٥)ساڵی ڕێک بوو لەبەندیخانەدا ژیانی دەگوزەراند تەنانەت هەندێ لە پاسەوانەکانیش بەشەرمەوە ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرد، هیچ جارێک لەکاتی دیدەنیدا پیاو نەدەهاتنە سەردانی تەنیا دوو ئافرەتی ڕەشپۆش نەبێ، ئەوانیش نیو سەعات دادەنیشتن وخواردنیان بۆ دەهێناو ئیدی بەجێیان دەهێشت، سەید محەمەد پیاوێکی زۆر عەساب سارد بوو، هەمیشە سیخوڕەکان چاودێرییان دەکرد بزانن کێ زۆر قسەی لەگەڵ دەکات تەنیا ئێمەی مەسیحی لەوبارەیەوە گرفتمان نەبوو ،ئەگینا هیچ موسڵمانێک نەیدەوێرا بەئاشکرا بیدوێنێ، بەهەر حاڵ ڕۆژێکیان پاش ئەوەی نزیکەی دووسەعات لەنێو ڕاڕەوەکەدا ڕایانگرتین، بەڕێوەبەری بەندیخانەی تایبەت هات و لەو هەموو زیندانیەدا سەید محەمەدی بانگ کرد، ئەو ڕۆژە بەڕێوەبەر زۆر سوکایەتی پێ کرد دەیویست لەبەرچاوی زیندانیەکاندا بیشکێنێت بۆیە بەڕێوەبەر بەم

پرسیارە دەستی بەگفتوگۆ کرد:
* ناوت چییە؟
- سەید محەمەد
* سەید کیلۆی بەچەندە؟!
-(......)
* بیستومە قسە زۆر دەکەیت ها!!
- هیچ قسەم نەکردووە.
* باش گـوێ بگرە لای من سـەیدو مـەید ناخـوات، قـسـە بکەیت وەکـو سەگ دەتۆپێنم!
- (......)
دوای ئەو بێ دەنگیەی سەید محەمەد بەڕێوەبەری بەندیخانە کۆمەڵێ جنێوو قسەی ناشرینی پێ گوت و بەچاودێری هۆڵەکەی گوت:( بزانە کێ زۆر قسە لەگەڵ ئەم سەگەدا دەکات پێم بڵێ، خۆم دەزانم چی لێ دەکەم!) ئیـدی لەو ڕۆژەوە زیندانیـەکـان زیاتر لەمـامـەڵەکـردن ودواندنی ئەوسـەید محەمەدە کشانەوە.
ئەو سـاڵە بەردەوام زیندانی تازەیان دەهێنا وای لێ هات قـوربانیـانی بەندیخانە کارمەندانی ناو کۆشکی خودی سەدام حوسێنیشی گرتەوە، بۆ نموونە لە نیـسانی ساڵی ۱۹۹۳ دا (۱۳-۱٤)زیندانیـان هێنا کە پێشتـر لەکـۆشکی سـەدام کـاریان کـردبوو، بەو شـێـوەیە بارودۆخی بەندیخـانە تادەهات شلـۆقترو قـەرەباڵغـتـر دەبوو، زۆربەی زیندانیـەکان سـەرگەرم بوون وهێـمنی خۆیان لەدەست دابوو لەکـاتێکدا لەنێـو بەندیخـانەدا زۆربەباشی باسی بارودۆخی کوردسـتـان وحکومـەتی کـوردسـتـان باری گـوزەرانی باش دەکرا، ئیدی بەو شێوەیە لەگەڵ ئەو ڕووداوە گەرمانەدا هەندێ جار لێرەو لەوێ ڕووداوی ئاسـایی ڕوویدەدا،کە لێرەدا بە پێـویسـتم نەزانی باسـیـان بکەم، ئەگەرچی لەبەرەبەری کۆتایی ئەو ساڵە شوومەدا کەمێک بارودۆخی بەندیخـانە هێـورتر بۆوە، ئەوەش بەڕێ کـردنی هەشـتـەمین سـاڵی زیندانیم بوو.

# ساڵی ١٩٩٤ دۆزەخ یان بەندیخانە؟!

ئەو باروودۆخە کاتیە هێمنەی کەلەبەندیخانە دروست بوو، هەلێکی بۆ ڕەخساندین کە ئاهەنگێکی خنیجلانە بەبۆنەی سەری ساڵی نوێوە بگێڕین، لەچاو بەندیخانەدا شەوێکی خۆشمان بردەسەر بەلایەنی کەمەوە توانیمان کۆمەڵ کۆمەڵ لەگەڵ یەکتریدا دانیشین و بەسەربەستی پێکەوە قسە بکەین وجگەرەبکێشین وکەمێک پێ بکەنین،ئەو شەوە تەلەفزیۆنی ناو هۆڵەکەیان بۆ کردینەوە، بەرنامەکان سەر لەبەر پیرۆزبایی کردن بوو لەسەرۆکی فەرماندە!! لەهەموولایەکەوە بروسکەی پیرۆزبایی مەحکوم کردنی گەمارۆی ئابووری سەر عێراق بۆ سەرۆک دەهات و یەکە یەکە دەخوێندرانەوە، کۆڵان و شەقام و گەڕەکەکانی بەغدای پیشان دەدا تا درەنگی شەو ئاهەنگ وسەماو گۆرانی بوو،ئەگەر کەسێکی نەشارەزا تەماشای تەلەفزیۆنی بکردایە وای دەزانی هەموو عێراق هەژارێکی تێدانییە، پرسەبارێکی لێ نازی، کەسێکی تێدانییە دژی ئەو واقیعە تاڵە هەڵوێستێکی هەبێت!! بەهەر حاڵ هەرئەوشەوە یەکێک لەپاسەوانە ڕێکوپێکەکان هات و ئاگاداری کردینەوەو تکای لێ کردین بێ دەنگ بین، ئێمەش گوتمان بۆچی؟..چی رویداوە؟! پاسەوانەکە گوتی: (براینە دەبێ زۆر ئاگاداری خۆتان بن،چونکە ئەفسەرێکی هەرزەکاری سەرسەری بەد فەساڵ هاتووە ناوی (محمد الجبوری) یەو هەرچی کاری خراپە بێت لەدەستی دێ) لەناو هەموویاندا من هەڵمدایە گوتم: (خەمت نەبێ ئەویش هەر ماوەیەک تاقەتی ئەو توندو تیژییەی دەبێت، دوایی ئەویش وەڕس دەبێ و کۆڵ دەدات ڕەنگە خوێنی گەرم بێت ولەم کەشوهەوایە ڕا نە هاتبێت)، بەلام پاسەوانەکە گوتی: ( پێ ناچێت وابێ، با خۆتان ببینن ئەو کات

بروام پێ دەکەن!) ئیدی هەمووی چەند رۆژێکی کەمی نەبرد، بەدیداری نامۆبارەکی ئاشنابووین. پاسەوانەکە راستی کرد، محەمەد ئەلجبوری وەکو سەگی هار وابوو،پەلاماری هەموو کەسی دەدا، نەیدەزانی پیروگەنج و پلەوپایەو بروانامە چیە شەلم کوێرم ناپارێزم کەوتە گیانی هەمووەمان باشترین قسەی لەگەڵ زیندانیەکاندا ئەوەبوو دەیگوت: (گوم چلب) (هەستە سەگە)!! یەکێک لە زیندانیە عەرەبەکان هەمیشە دەیگوت:( باشترین وەڵام بۆ ئەم کەرە بێ دەنگ بوونە!).

چەندین بڕیاری خۆ بەخۆی دژی زیندانیەکان دەردەکرد، حەزی دەکرد زیندانی هەمیشە لەدوو دڵی و ترس و دڵەڕاوکێدا بژی، ئەو سەعات دەرگاکردنەوەیەشی قەدەغە کرد، پێشتر بە پێی یاساکانی بەندیخانە ڕۆژانە دەبوایە سێ جار سەرژمێری زیندانیەکان بکرێت، کەچی لەسەردەمی محەمەد ئەلجبوریدا ڕۆژی وا هەبوو (٧-٨)جار سەرژمێر دەکراین،ئەو ڕۆژەی ئەو ئێشکگر بوایە،بەندیخانەی دەکردە دۆزەخێکی راستەقینە هەمووەمان ڕقمان لێی بوو ،ئاخر هەرزەکارێکی کورتە بنەی رەزا قورسی وا چیە ژیانی سەدان کەس تێک بدات! زۆرجار بیرمان لەوە دەکردەوە بیکوژین وچی دەبێت بابێت،چونکە سوکایەتی بەهەموو کەسێک دەکردو ڕێزی بۆ هیچ شتێک دانەدەنا،شەوی واهەبوو سەعات (٢)ی شەو لەخەو هەڵی دەساندین وموحازەرەی نیشتمانپەروەری دەداینێ!! خۆی وتاقمێک پاسەوانی لەخۆی بەدڕەفتارتر دەهاتنە هۆڵەکەوە و پڕ بەدەنگی هاواری دەکرد:( ئێوە خائینن، ناپاکن، خۆ فرۆشن، ئاغاکانتان هەموویان بازرگانن و کەری وەکو ئێوەش لەم بەندیخانەیەدا وا بۆگەن دەکات!!) بەڵام ئەو زیندانیە عەرەبە قسەکەی زۆر تەواو بوو کە هەمیشە دەیگوت: (باشترین وەڵام بۆ ئەو کەرە بێ دەنگبوونە) بێگومان هەندێ جار دەمانویست،لێی راپەڕین و تێی هەڵدەین، بەڵام دەمانگوت حەیفە لەسەر ناکەس بەچەیەکی وەها لێدان بخۆین و ئازارو ئەشکەنجەو سوکایەتی بەخۆمان بکەیەنین.

## ڕۆژنامەنووسێک لەبەندیخانەدا

ئەبو عیسام پیاوێکی کامڵ وسەنگین بوو کوڕی یەکێک لەخێزانە هەرە ناودارو ناوبانگ باشەکانی شاری بەغدا بوو، هاوکات ڕۆژنامەنووسێکی

بەتواناو لێهاتووش بوو بوو ،ماوەیەکی زۆر لە زانکۆکانی لەندەنی پایتەختی بەریتانیا بابەتی ڕۆژنامەگەریی خوێندبوو کاتێ لە لەندەن گەڕابۆوە بەتۆمەتی سیخوڕی ماوەیەکی زۆر لەبەندیخانەدا هێشتبوویانەوە ،بەڵام دوای ئەوەی کوڕێکی گەنجی لەجەنگی عێراق-ئێراندا دەکوژرێت ،ڕژێمی عێراق ئازادی دەکات، کەچی کاتێ بەبۆنەی کوژرانی کوڕەکەیەوە لەلایەن هەندێ دۆست و برادەری لەشاری لەندەنەوە بروسکەی ماتەمینی و پرسەنامەی بۆ هاتبوو دووبارە دەسگیریان کردبۆوەو بەهەمووی نزیکەی (١٥)ساڵ بوو لەبەندیخانەی ئەبو غرێب دا زیندانی بوو ،ئەبوعیسام لەنێو هۆڵەکەی ئێمەدا ڕۆژانی حوکمی بەسەردەبرد، بۆیە هەرکاتێ مولازم محەمەد ئەلجبوری بهاتبایە ناوهۆڵەکەوە بەهێواشی لەبەرخۆیەوە دەیگوت: (یاستار!!) بەهەر حاڵ ئەبو عیسام یەکێک بوو لەو زیندانیانەی کە زۆر بەبینیی ئەو ئەفسەرە قەڵس دەبوو هەمیشە ئەگەری ئەوەی هەبوو ڕۆژێ لەڕۆژان ڕووبەڕووبوونەوەو پیا هەڵشاخانێک لەنێوانیاندا ڕوو بدات. ئەوەبوو ڕۆژ هات و چوو تالەمانگی شوباتی ساڵی ١٩٩٤ دا ئەوەی چاوەڕوانمان دەکرد ڕووی دا، ناوەڕاستی ئەو مانگە ڕۆژێکیان مولازم محەمەد ئەلجبوری وپاسەوانەکانی خۆیان کرد بەژووراو لەخۆڕا دەستی کرد بە جنێودان بە ئەبو عیسام، بێگومان ئەو ڕقی لەهەموو زیندانیەکان بوو ،بەڵام لەهەموویان زیاتر زیندانیە ڕۆشنبیرو خاوەن کەسایەتیە بەرزەکانی دەشکاندەوە، بۆیە ئەو ڕۆژە بەم شێوەیە کەوتە سوکایەتی پێ کردنی ئەبو عیسامی ڕۆژنامەنووس و ڕۆشنبیری ناوداری بەغدا:

* بیستومە چەنەبازی زۆر دەکەیت وگلەییت لە ئێمە زۆرە؟

- کوڕی خۆم تکات لێ دەکەم بەرۆکم بەردە، رەفیقی من ئێستا وا بەبێ کێشەو گیروگرفت لەنێو ماڵ و منداڵی خۆیدا دانیشتووە،کەچی ئێمە بەرگەی ئەو هەموو سوکایەتی پێ کردن و ئازارە دەگرین و هاتوینەتە سەر ئەو بڕوایەی کە ئیدی ئەمە نسیب و چارەنووسمانە هێشتا وازمان لێ ناهێنی، ئاخر تۆ بەکوڕی من دەشێیت، وەختێ من کاری ڕۆژنامەگەریم دەکرد هێشتا باوکت ژنی نەهێنابوو ،ئیدی بۆ هێندە وەڕسمان دەکەیت، مەعقول نییە کوڕی خۆم تۆ نیوە شەو لەخەو هەڵمان دەسێنی و دەنەڕێنی

بەسەرماندا.
* دەم درێژی مەکەو ڕێزی خۆت بگرە ئەگینا....
لەو کاتەدا ئەبو عیسام هەموو گیانی دەلەرزی، سوور هەڵگەڕابوو هەستایە سەر پێ و من قۆڵیم گرت بۆ ئەوەی نەکەوێت،لەولاوە لیوا عەبدولکەریم ئەلجبوری کە بەتۆمەتی سیخوڕی حوکم درابوو هەڵی دایەو ڕووی کردە ئەفسەرەکەو ئەم گفتوگۆیەی سازدا:
* کوڕی خۆم ئەبو عیسام ڕاست دەکات، گرفت نیە تۆ خەڵکێک کە هەڵەی کرد سوکایەتی پێ بکە، بەڵام بۆچی سوکایەتی بەهەموومان دەکەیت؟،ئاخر ئێمەش دنیامان دیوەو خزمەتی ئەم وڵاتەمان کردووە.
- ڕاست دەکەیت.. بەڵام دەتوانی پێم بڵێی تۆ ئێستا لێرە چیت؟!
* زیندانیم.
- کەواتە دەمت داخەیت باشترە چونکە تۆ بۆت نییە قسە بکەیت.
بەهەر حاڵ ڕۆژانە لەم گفتۆگۆ بێ تام و قسەو باسانە زۆر بوو، بۆیە سات لەدوای سات ڕقی ئەستوورتر دەکردین و هاوکات نا ئومێدی زیاتریش باڵی بەسەر بیروبۆچوون ودەروونماندا دەکێشاو وئەبوعیسام و لیوا عەبدولکەریمیش ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر ورەیان دادەتەپی، خوای لێخۆشبێ ئەبو عیسام دوای ئازادبوونی بەچەند ڕۆژێک کۆچی دوایی کرد.

## بەهانەی ئەفسەرێکی هەرزەکار

مولازم محەمەد بەهانەی بەهەمووماں دەگرت و دژایەتی یەکەیەکەمانی دەکرد، چەندی پێ بکرایە ولەتواناو تاقەتیدا بوایە سوکایەتی پێ دەکردین، بەڵام هەندێ جار بۆ ماوەیەکی زۆر قەرەوڵی دەخستە سەر یەکێک و هێندە ئازاری دەدا لەڕووی دەروونیەوە دای دەتەپان، گەنجێکی ناسڕی هەبوو بەناوی (حەیدەر)ەوە کاتی خۆی بەتۆمەتی بەشداری کردن لەراپەڕینی ١٩٩١ خەڵکی باشوری عێراقدا حوکم درابوو، کوڕێکی بێ دەنگ و بەڕێز بوو،بەڵام مولازم محەمەد ئەلجبوری زۆر پەڵپ و بیانوی پێ دەگرت، تا گەیشتە ئەوەی ڕۆژێکیان بەبێ هیچ هۆیەک لەبەرچاوی ئێمە سوکایەتی پێ کردو پاشان بردیە ژووری تاکە کەسی و تاوەکو (١٥) ڕۆژ لەو ڕۆژەدا بەندی کرد.

ئێمە هەمـوو خەمتمان بوو تەنانەت مـەزەندەی ئەوەمـان دەکرد کـوشتـبێـتی، تاوەکـو ئەو نیـوەڕۆیەی حـەیدەریان هێنایەوە بۆ هۆڵەکـە، منیش وەک ڕێزلێنانێک هەستام چووم بەپیر حەیدەرەوەو باوەشم پێداکردو ئەملاولایم ماچ کرد، بێگومان بەدرێژایی سالآنی نێو بەندیخانەم جوانترین هەڵوێست ئەوەبوو کە کـاتێ زیندانیەکـیـان دەبرد بۆ لێدان و ژووری تاکـەکـەسی و ئەشکەنجە لەکاتی گەڕانەوەیدا زیندانیەکانی تر دەچوون بە پیربییەوەو زۆر ڕێزیان لێ دەگرت جاری وا هەبوو خواردنیشیـان بۆ ئامـادە کردو ئاویان بۆ گەرم دەکردو جل و بەرگیشیان دەگۆڕی خۆ هەندێ جار ئەگەر زیندانیەکە لێدان وئەشکەنجەی زۆری بووایە ئەوانی تر شان و مل و پەل و پۆیان بۆ دەشێـلا بۆئەوەی ئازاری کـەم بکەنەوە. منیش ئەو ڕۆژە بەو نیـازە چووم بەپیر حەیدەرەوەو ڕێزێکی زۆرم لێ گرت، مولازم محەمەد زۆری پێناخۆش بوو هەسـتی کرد بەو کارە تەحەدای ئەو دەکەم، بۆیە بەرلەوەی لوئەی برای حەیدەرو چەند زیندانیـەکی تریش بێن بە پیر حـەیدەرەوە مـولازم مـحـەمەد بەزمانێکی تانەو تەشەر ئامێزەوە بانگی کردم و پێی گـوتم: (ئەوە بۆچی وا بەگـەرمی پێشـوازی دەکـەیت و مـاچی دەکـەیت دیارە زۆر تێکۆشـەرە؟!) لەراســتـیــدا دەمـویست وەلآمی بدەمــەوەو لەو سـاتەدا لەهیچ شـتـێک نەدەترسام، بەلآم تەنیـا لەبەر ئەوە دانم بەخۆمـا گرت، کە بۆ سبەی کـاتی سەردان و دیدانیمانەو کەس و کارم لە سلێمانییەوە دێنە لام، ڕەنگە چاویان پێم نەکـەوێت! بۆیە ناچار بێ دەنگ بووم هیچ وەلآمم نەدایەوە، کـەچی زیاتر لێم هاتە پێشـەوەو شـەق وزللیـەیەکی تێ هەڵدام،هەرچەندە لەنێـو بەندیخانەو زیندانیە شەریف ود لسۆزو نیشتمانپەروەرەکاندا شانازی بوو بۆ من کـەلەسـەر برادەرێکی خـۆم لێـدان و ئەشکەنجـەم پێ بگات، بەلآم ئەمجارەش نەمتوانی لێی هەلگەرێمەوە تاکە ڕێگریش خـاتری ئەو دایک وباوکە هەژارو بەتەمەن و ماندووەم بوو کە دەبوایە سبەی ببینن، ئەوەی کە پێم کرا تەنیا خێسەیەکی پڕ ڕق و کینەم لەمولازم محەمەد کردو چوومەوە شــوێنی خــۆم دانیــشــتم، پاش ئەوە زۆر بێ تاقــەت بووم خـۆم بەبێ دەسەلآتترین کەس دەهاتە پێش چاو، هەستم کرد هەندێ جار مردن لەژیانی نێو بەندیخانە خۆشترو سەرفـراز ترە، بەلآم زیندانیەکانی تر هاتنەلام و دڵنەواییـان دەدامـەوە دەیانگوت: (گـوێ مـەدەرێ ئەوە هەروا بێ ڕەوشتـە

گـرنگ ئەوەیە پێـڵاوەکـانی تۆ هەزاری وەک ئەو دەهێنێ) بێگومـان
حەیدەریش زۆر بەشەرمەوە هات داوای لێبووردنی لێ کردم و ماچی کردم
دەیگوت: ( ببووره خەتای من بوو لێـدانت خـوارد) ئێـوارەی هەمـان ڕۆژ
لەکاتی سەرژمێر کردندا مولازم محەمەد لەناو دەرگای هۆڵەکەدا وەستا
بوو، هەر زیندانیـەک دەرۆیشـتـە دەرەوە ئەو ئەفسـەرە هەرزەکارە، قـاچی
لەقاچی دەگیراندو بەپاشقولێک سەر سمێکی بەزیندانیەکە دەدا، ئینجا
هەر خـۆی تانەیەکی لێ دەدا.. ( ئەها... کـوێرە.. چاوی نابینێ!) ئیـدی
تەشقەلەو گاڵتە پێ کردن و سوکایەتی دەرهەق بەزیندانیەکان سنوری خۆی
تێپـەڕاندبوو، هەر ئەو ڕۆژە کـەمن گـەیشـتـمـە لای دەرگـاکـە، نەک هەر
پاشقـول بەڵکو زللەیەکیشـی لێدام گوێی کپ و کاس کردم، دەمـزانی ئەو
ماوەیە بەمنیـەوە گرتووەو لەخودای دەوێ کاردانەوەیەکم هەبێت بۆیە منیش
ئەو ماوەیە چەند پێم کرا فشارم لەخۆم کردو هێمنی خۆمم پاراست، ئاوڕم
لێ نەدایەوە چوومە ریزی زیندانیەکانەوە، جار جارە ژێراو ژێر تەماشایەکی
روخسـاریم دەکـرد، کـەچی کـە سـەرنج دەدا چاوم لێ ناتروکـێنی، دەیەوێ
جوڵەیەک .. قسەیەک،، پرتەو بۆڵەیەکم لێوە بێت و ئەوەی لەمێشکیدایە
جێبەجێی بکات، هەرئەو ڕۆژە دوای سەرژمێرکردن فەرمـانی دا بچینەوە
ژوورەوە، دووبارە وەک و سـەگی هار کـەوتەوە گـیـانی دوو سێ زیندانی
شیعە، بیانووی پێ گرتن دەیگوت: ( بۆچی ناوچەوانتان ڕەشە؟!) هەر چی
لەنزیک ئەوەوە برۆیشـتـایە جنێـوێک، قـسـەیەکی ناشـرین، تانەو
تەشەرەیەک، پاشقـولێک، ئیدی بەشێوەیەک لەشێوەکـان سوکـایەتی پێ
دەکـرد، تێکڕای زیندانیـەکـان دادو بێ دادیان بوو بەدەسـتـیـەوە هەمـوو
دەیانگوت ئەشکەنجەی هەموو ئەو ساڵانە لەلایەک و قسەڕەق وناشرین و
رەفتارە دزێوەکانی ئەو ئەفسەرە هەرزەکارە لەلایەک بوەستێ، ئەو ماوەیە
وەک مۆتەکەوابوو بەسەر دڵمانەوە،بەڵام لەهەموویان زیاتر ڕقی لەمن بوو
هەندێ لەسیخوڕەکانی ناو بەندیخانە راپۆرتیان لەسەر نوسیبووم گوتوبیان
شـێـرزاد و زیندانیـە کـۆنەکـان سـەرچاوەی هەمـوو ئاژاوەیەکن، هەروەها
لەدوایشدا لەرێگەی پاسەوانێکەوە بۆم دەرکەوت کە بۆچی مولازم محەمەد
زۆر ڕقی لەمن دەبێتەوە! هۆکاری سەرەکی ئەوەبوو کە محەمەد جبوری زۆر
برادەری حـەمـەی ئەحـەی فـەڕاش بوو، ئەو حـەمـەیە کـورد بوو، بەڵام

کوردێکی بەعسی و خۆفرۆش و دژ بەهەموو کوردێکی ئازادیخواز بوو ،ئەو حەمەیە ئامر مەفرەزە خاسەی حکومەت بوو تەنانەت لە راپەرینەکەی ساڵی ۱۹۹۱یشدا دژی خەڵکی راپەریوی کوردستان تاوانی زۆر گەورەی ئەنجام دابوو، بەڵام دواجار ساڵی ۱۹۹۳ حکومەت دەسگیری کردو هێنایانە ئەو هۆڵەی ئێمەوە، کەچی هێشتا لەوێش دڵسۆزی بۆ حکومەتی بەعس نیشان دەدا، بۆیە بەدرێژایی ئەو ساڵە لەسەر ئەو ئەمەکدارییەی بۆ حزبی بەعس!! چەند جارێک لەنێو بەندیخانەدا لێم داو سوکایەتیم پێ کرد، توومەس ئەم حەمەی ئەحەی فەراشە دوای ئازادبوونی باسی منی بۆ مولازم محەمەد جبوری کردووەو ئەویش لەوێوە رقی لێ هەڵگرتووم، بەهەرحاڵ هەمان رۆژ پاش ئەوەی لەسێ زیندانیە عەرەبە شیعەکەی دا نەیهێشت من برۆمەوە ژوورەوە، بانگی کردم لەبن دیوارەکەدا رایگرتم، ئینجا پاسەوانێکی بانگ کردو پێی گوت: (دارێک، سۆندەیەک،کێبلێک هەرشتێکت دەست دەکەوێت بۆم بهێنە با ئەم سەر سەریە تەربێت بدەم) منیش هەر بێ دەنگ بووم تاوەکو پارچە کێبلێکیان بۆ هێناو سێ چوار کێبلی بەهەموو هێزی خۆی دا بەقوڵما، دەمزانی رقەکەی زۆر لەوە ئەستورترەو دەیەوێ تووشی کێچەڵێکی گەورەم بکات کە پاشان رزگار بوونم لێی کارێکی زەحمەت بێ، لەو کاتانەدا قسەکانی حەزرەتی مەسیح (س.خ) دەهاتەوە یادم (ئەگەر زللەیەکیان لەرووومەتی راستت دا رووومەتی چەپیان تێ بکە) گرنگ ئەوەبوو دڵنیابووم لەوەی کە من لەسەر رێبای پیرۆزی بارزانی و بیرێکی ئازادیخوازی و شۆرشگێری و کوردستانپەروەری ئەم هەموو ئازارە دەچێژم و ئەویش ئەفسەرێکی ناکەسبەچەو هەرزەکارو بەدرەفتارەو هەرچی پێی بڵێن هەستی مرۆڤپەروەری و دڵسۆزی و نیشتمانپەروەری تێیدا نییە ،عەرەبێکی زۆر رەگەز پەرست بوو لەدنیای خوا دا رقی لەکوردو ئاشوری بوو بۆیە هەمیشە خۆم لەو بەگەورەترو مەزنتر دەزانی هەمیشە لەدڵی خۆمدا دەمگوت: (گرنگ ئەوەیە ئێستا کوردستان ئازادەو خەونی من و هەزاران زیندانی تر هاتۆتەدی ئیدی ئەم گەجەرو گوجەرو بوودەڵانەی نێو بەندیخانە چی دەکەن با بیکەن) دەمزانی رۆژێ لەرۆژان من بەسەر بەرزی دەچمەوە نێو شارو کەس و کارو وڵاتی خۆم و نموونەی وەکو مولازم محەمەدیش وەک جرجێکی ترسنۆک لەو رۆژەدا کونێک نابێت خۆیانی تێدا

حەشاردەن ئاخر بارزانی سەرکردەی شۆڕشەکەمان لەمێژبوو گوتبووی: ( لەسەرکەوتندا مەغرور ومەبن ولەکاتی شکستدا بێ ئومێد مەبن) ئەم بیرو باوەڕە تا دەهات زیاتر ورەی بەرز دەکردمەوە، بڕواتان بێت مرۆڤ لەکاتی میحنەت و ڕۆژانی سەخت و دژواری وەهادا بیروباوەڕی شۆڕشگێری و ئازادیخوازی و ورەی پۆلایین و ئیرادەی بەهێز دەبنە خۆراکی گیانی و بەرگەی هەموو ئازارێک دەگرێت. بەهەر حاڵ ئەو نەفسەرە بەو چوار کێبڵە وازی لەمن هێناو پێی گوتم: ( تۆ خوێری وسەرسەری و شەقاوەی نێو بەندیخانەی!) ئینجا بەرۆکی عەباس دیوانی گرت، ئەو عەباسە لەیەکەمین ڕۆژی دەسگیرکردنیەوە نەخۆشی کەمخوێنی هەبوو هەمیشە بێ هێزو لاوازو شل وشەکەت بوو،کەچی مولازم محەمەد سەری کردبووە سەری و دەیگوت: (ئیلا و بیلا تۆ حەب ودەرمانی خەو دەخۆیت ئەگینا بۆچی هەمیشە دەخەویت!)، پاشان سەیری من وعەباسی کردو بە پێکەنینەوە پێی گوتین: ( ئای ئێستا ئەگەر بوارتان هەبێ چۆن دەمکوژن!) هەموو زیندانیەکان سەیریان دەکردین زوو زوو ئاماژەیان بۆ دەکردین، کە خۆ ڕاگرین و وەڵام نەدەینەوە، ئەوانیش خەمی ئێمەیان بوو دەترسان بەفەتارەیەکماندا بدات،عەباس هەر دەپاڕایەوەو سوێندی بۆ دەخوارد کە هیچ حەب و دەرمانێک ناخوات و نەخۆشی کەمخوێنی وا بێ هێزو لاوازو خەواڵوی کردووە،بەهەر حاڵ ئەو ئێوارەیەش وازی لێ هێنایین، ئەوشەوە تەنیا ئاخم هەڵکێشاو جگەرەم بەباکرد، بیرم لە پلانێک دەکردەوە خۆم و هەموو زیندانیەکان لەم ملۆزمە رزگارکەم، بەڵام هەمیشە لەو ئاستەدا مێشک وعەقڵم دەوەستاو هیچ چارم نەدەما. بۆ سبەی دایکم و باوکم هاتنە لام، چەندە زۆرم لەخۆم کرد نەمدەتوانی خۆم ئاسوودە نیشان بدەم،دایکم بەگریانەوە دەیپرسی: (چی بووە بۆچی وا بێ تاقەتی؟) منیش دڵخۆشیم دەدایەوە دەمگوت: ( دایە گیان خەمت نەبێ بەخودا هیچ ڕووی نەداوە، تەنیا ئەوەیە ئەمشەو تابەیانی بەدیار فیلمێکی خۆشی تەلەفزیۆنەوە دانیشتووم وخەوم لێ نەکەوتووە!) ئەو ڕۆژە دایکم هەر بڕوای نەکرد، زۆر گریا ،لەو ڕۆژە زیاتر گریا کە ئەمنەکان هاتنە سەرمان و منیان فڕاند. ئیدی خەم لەدوای خەم دروست دەبوو ئەو ماوەیە گوزەران و بژێوی خەڵکی عێراق هێندە خراپ بوو، زیندانی وا هەبوو بە (٥-٦)مانگ

جارێک کەس نەدەهاتە دیدەنی وهیچیان بۆ نەدەهێنا، بۆیە ئەو ماوەیە لەنێو خۆماندا زۆر هاوکاری زیندانیە هەژارو لێقەوماوەکانمان دەکرد، لەو ڕۆژانەدا خەمۆکی و سەر ئێشە هەراسانی کردبووم، ئەو سێ ڕۆژەی مولازم محەمەد لەوێ نەبووایە کەمێک دەحەوابنەوە، پاشان کە دەهاتەوە دووبارە بەندیخانە بۆنی خوێن و ئازاری دەگرتەوە.

## هونەرمەندێکی گەورە لەبەندیخانەدا

وەک چەند جارێک لەمەوبەر باسم کرد بەندیخانەکانی عێراق ئەنواع وئەشکاڵ خەڵکی لێ بوو پێشتر نموونەی زۆرم هێنایەوە، بەڵام لەساڵی ١٩٩٤ دا نموونەیەکی زیندوی تری ئەو هەمەڕەنگی و هەمەچەشنیەی زیندانیەکان هونەرمەندێکی مۆسیقی بەتواناو ناوداری عێراق بوو بەناوی (پێرچ کەرکۆسیان)ەوە، ئەم هونەرمەندە تەمەنی (٦٠) ساڵ دەبوو، ماوەیەکی زۆر لە وڵاتی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی ئەوکات هونەری مۆسیقای خوێندبوو، پیاوێکی هێمن و هەست ناسک بوو، ژیانی ئەورووپا فێری کۆمەڵێ داب و نەریت و ئەتەکیەتی جوانی کردبوو، هونەرمەندێکی دنیا دیدەو هەتا بڵێی ڕۆشنبیربوو، پێشتر وەک سەرۆکی بەشی مۆسیقای پەیمانگای هونەرەجوانەکانی بەغدا کاری کردبوو، بەڵام دوای گەڕانەوەی لەئەڵمانیا بەتۆمەتی سیخوڕی بۆ ئەو وڵاتە حوکم درابوو، ئەوکات نزیکەی (٨)ساڵ دەبوو لەبەندیخانەدا ژیانی دەگوزەراند، لەو ڕۆژانەدا ناودەم و لێوی تووشی هەوکردن بوو بوو،بۆیە لەکاتی دیدەنیدا بەنهێنی بەکەس و کاری گوتبوو چارەکێک جنم بۆ بهێنن بۆ ئەوەی ناودەم و لێوی پێ پاکژ بکەمەوە (تعقیم)، ئیدی ڕۆژانێک بوو شەوانە بەر لەخەوتن بەنهێنی سێ چوار قوم لەو جنەی دەخواردەوەو دەم و لێوی سڕ دەکرد ئینجا دەخەوت، بێگومان لەنێو بەندیخانەشدا هەمووخواردنەوەیەکی کهولی بۆ زیندانیەکان قەدەغە بوو، ئەم کارەی (پێرچ کەرکۆسیان) بەنهێنی مایەوە،تاوەکو مانگی ١٩٩٤/٣ ڕۆژێکیان مولازم محەمەد وتاقمێک لەپاسەوانەکانی خۆیان کرد بەژووراو ئێمەیان کردە دەرەوە بۆ ئەوەی ژوورەکانمان بپشکنن، ئەوەبوو بوتڵە جنەکەی پێرچیان دۆزییەوەو هەمان کات زیندانیەکانیان کۆکردەوەو لەبەرچاوی ئێمەدا مولازم محەمەد پێرچی دایە بەرشەق و زللەو

جنەکەی کرد بەسەریدا، ئینجا بەکێبڵ کەوتە لێدانی، پیرچی بەستەزمان و ریشسپیش چەندە پاڕایەوەو سوێندی بۆ خوارد کە لەبەر نەخۆشی دەم و لێوی دەیخواتەوە، کەچی هیچ سوودی نەبوو تاوەکو لەژێر ئازاری کێبڵ و شەق و زللەدا لەهۆش خۆی چوو بورایەوە، ئینجا هەربەدەستی خۆی پەلی پیرجی گرت و ڕای کێشایە دەرەوەی هۆڵەکە، ویستی زیاتر سوکایەتی بەهەموو زیندانیەکان بکات، بۆیە کوڕێکی گەنجی سلێمانی بەناوی (سەرکەوت)ەوە بانگ کردو فەرمانی پێدا کە سەتلێک ئاو بکات بە سەر پیرچ کەرکوسیاندا. سەرکەوتیش مەردانە لێی هاتە وەڵام وگوتی: (شتی واناکەم) یەک دووجار داوای لێ کرد سەرکەوت هەر سووربوو لەسەر وەڵامی خۆی هەمووماں وەخت بوو لەداخا شەق بەرین، دڵنیابووم لەهەر زیندانیەکی تری داوابکردایە بەقسەی نەدەکرد چونکە دیمەنی پیرچ زۆر ویژدان هەژێن بوو، مرۆڤ بەئاسانی بەرگەی نەدەگرت،دوای ئەوە فەرمانی دا کە سەرکەوت بەرن بۆ ژووری کۆنترۆڵ و لەوێ بەکێبڵ لێی بدەن، ئەوەبوو سەرکەوتیان برد، پاشان فەرمانی دا کە سەرتاش بهێنن وسەری پیرچ کەرکوسیان بەگوێزان سفرکەن، لەوکاتەدا (موقەدەم نەزهەت)ی بەڕێوەبەری بەندیخانە هات بەسەر ئەو ڕووداوەدا. پێم وابێ بەڕێوەبەریش بەو دیمەنە نیگەران بوو بۆیە دەستبەجێ فەرمانی دا کە مولازم محەمەد برواتە بەشی کۆنترۆڵ ، ئینجادوو زیندانی بانگ کردو گوتی:( پیرچ بەرنەوە ژوورەکەی خۆی) دوای ئەوە هەندێک قسەی بۆ کردین و گوتی: ( بۆچی ڕێزی خۆتان ناگرن؟ ڕاپۆرتی خراپم بۆ دێ لەسەر ئێوە دیارە رەفتاری نابەجێ دەکەن) لەولاوە یەک دوو زیندانی عەرەب بە بەڕێوەبەریان گوت: (ئێمەی دەستبەسەری بێ دەسەڵات چیمان لەدەست دێ، ئەگەر ئەوپیاوە خواردنەوەی کهولی پێ بووەو هەڵەی کردووە،بیبەنە ژووری مەحجەر، ئیدی بۆچی بەوشێوە خراپە سوکایەتی پێ دەکەن و ئازاری دەدەن؟ گوناحە ڕیشی سپییە).

## گوللە باران کردنی تاڵب عۆدە

ئەوبارودۆخەی بەندیخانە بەو شێوەیە بەردەوام بوو ڕۆژبەڕۆژ بەرەو خراپتر و ترسناکتر دەچوو،هەمیشە وام دەزانی یەکەمین ڕۆژانی زیندانیمە

له دائیرەی ئەمنی سلێمانی، خەمەکان قوڵترو قوڵتر دەبوونەوە، زەمەن گەیشتە ناوەڕاستی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٩٤ ڕۆژی ١٧/٤/١٩٩٤ ڕۆژی دیدەنی وسەردانی کەس وکارمان بوو. سەعات (١١)ی پێش نیوەڕۆ لەکاتێکدا کە دیدەنکارانمان لەنێو هۆڵەکەدا لەتەکماندا دانیشتبوون،لەناکاو لەبەشەکەی تر بوو بەغەڵبە غەڵب وهات هاوارێک تێکڕای بەندیخانە شڵەژا، هەستام لەپەنجەرەکەوە تەماشای ڕاڕەوەکەی ئەو دیوم کرد، نزیکەی (١٥-١٦) کەس لەپیاوانی ئەمن وهەواڵگری لەنێو ڕاڕەوەکەدا بوون، پاش چەند ساتێک هەمان ئەو تاقمە ئەمنە هاتنە هۆڵەکەی ئێمەوەو بەپاڵ کەسو کارمانیان کردە دەرەوە،پێیان گوتن بە پەلە لەم ناوە مەمێنن وچۆڵی کەن، دیسان دایکم بەگریانو لەخۆدان چووە دەرەوە. ئاخر گرفتی من ئەوەبوو، هەمیشە دایکم و باوکم دەهاتنە لام بۆ ئەوەی کەمێک هێمن وئارام ببنەوە دڵناواییان بدەمەوە، کەچی بۆ بەدبەختی من وئەوانیش زۆربەی جارەکان ڕووداوێکی ناخۆش دەهاتە ئاراوەو هەتا دیدەنی داهاتوومان هێور نەدەبوونەوە، بەدرێژایی ئەوساڵانە دایکم جورئەتی ئەوەی نەبوو بەرگی ڕەش فڕێ بدات، چاوەکانی هەردەم سوور هەڵگەڕابوون، هەرگیز لەماڵی خۆیدا بەرگەی میوانی ناوەختی نەدەگرت،هەمووکاتێ وای دەزانی هەواڵی ناخۆشی منیان پێیە. بۆیە یەکێک لەخەمە سەرەکیەکانی ئەو ڕۆژانەم دایکم بوو،بەهەر حاڵ ئەو ڕۆژە نەک هەرکەس وکارمان بەڵکو خۆشمان ترسمان لێ نیشت:( خوایە دەبێ ئەمجارەیان چی ڕوویدابێ؟!) هێشتا کەسو کارمان لەنێو ڕاڕەوەکاندا مابوون، وەختێکمان زانی دە دوانزە کەس لەجەلادو ئەمنەکان کوڕێکی گەنجیان بەشەق و زللە لەبەشەکەی ترەوە هێنایە دەرەوە،ئەو گەنجە ئاوباڵای خوێن بوو هێندە بەڕق و کینەوە دەستیان لێ دەوەشاند ناڵە ناڵ وهاوار هاوار و جنێودانی دەگەیشتە ئەو سەری بەندیخانە، ئەو گەنجە وەکو بڵێی هیستریا لێی دابوو چەندی پێی بکرایە ئەویش دەستی لەئەمنەکان نەدەپاراست ئەویش شەق و بۆکسی دەوەشاند دیمەنکە جەرگ بڕبوو، هاوسەری ئەو گەنجەو دایکی لەناو ڕاڕاوەکەدابوون گریانی ئەوانیش لەولاوە بوەستێ، هێندە گریان پاسەوانەکان بەقژ ڕایانکێشانە دەرەوە هاوسەرەکەی پڕ بەو بەندیخانەیە هاواری دەکرد:( دخيل الله) بەڵام هیچ

سوودی نەبوو لێدان لەو گەنجە بەردەوام بوو تائەوکاتەی بەزەبری کێبڵ ودارو شەق و زللە لەپەل و پۆیان خست،ئینجا هەموو دیدەنکارانیان بردە دەرەوەی بەندیخانەو زیندانییەکانیش بۆ گۆڕەپانەکە بۆ سەر ژمێرکردن،هەموو کێچ کەوتبووە کەولمان، مەراقمان بوو بزانین چی ڕوویداوەو ئەو گەنجە کێیەو بۆچی وا لێی دەدەن! پاش ئەوەی کردیانینەوە ژوورەوە، یەکێک لەزیندانیە چاودێرەکان کە تارادەیەک بەهۆی نزیکبوونی لەهەندێ بەرپرسانی بەندیخانەو هەواڵگرییەوە ئازادبوو لەهاتوچۆکردندا، هاتەلامان و لێمان پرسی: ( ئەو گەنجە چییەو بۆچی وای لێ دەکەن؟) ئەوەبوو بەم شێوەیە هاتە وەڵام:( ئەو کوڕە ناوی تاڵیب عـوّدەیە، لەدایکبوویساڵی ١٩٦٨ی شاری بەسرەیە، پێشتر لەگەڵ باوک وبراکەی گیرا بوون، بەڵام جودایان کردونەتەوەو ماوەیەکی زۆرە تاڵیب عوّدە لەو بەشەی ئەو دیو زیندانیە،ئینجا ئەمڕۆ لەکاتی دیدەنیدا دایکی پێی گوت کە باوکی و براکەی تری ئیعدام کراون،ئەویش بەرگەی ئەو هەواڵەی نەگرتوو، نیمچە هستریایەک لێی داو هەمان دەقە هەستایە سەر پێ و وێنەکەی سەدام حوسێن کەبە دیواری هۆڵەکەدا هەڵوسرابوو لێی کردەوەو دای بەزەویداو بەپێ لەقە چووە سەر وێنەکەی سەدام و شکاندی،ئیدی لەسەر ئەو کارەی هاتوون بۆی و دڵنیام ئیعدامی دەکەن چونکە شکاندنی وێنەی سەدام حوسێن تاوانێکی هێندە ئاسان نییە!) دوای ئەو ڕووداوە بەدرێژایی سێ ڕۆژ چەند برادەرێکی زیندانی تاڵیبیان دەبردە لێدان و ئەشکەنجەو دەیانهێنانەوە، ئەوان زۆر بەخراپی باسی تاڵیبیان دەکرد، دەیانگوت هێندەیان لێ داوە شل و کوتیان کردووە والەسەرەمەرگدایە تەنانەت ڕۆژێکیان بردبویانە دائیرەی ئەمنی عامە بۆ لێکۆڵینەوەو لەناوبەتانیەکدا هێنابوویانەوە بۆ ناو هۆڵەکە. ئێوارەی ڕۆژی ٤/٢٠ لەناکاو بەڕێوەبەری بەندیخانە و مولازم محەمەد ئەلجبوری و ژمارەیەک لەپیاوانی ئەمن و پاسەوانان هاتنە ناو هۆڵەکانەوەو لەهەربەشەی (٢٥)کەسیان هەڵبژاردو بردیانینە ناو گۆڕەپانی گەورەی بەندیخانەوە، لەبەشەکەی ئێمە من و عەزیز لازارو ڕێبوارو مەحمود وکۆمەڵێ برادەری دیکەیان دەستەبژێرکرد، بێگومان هەوڵیان دا لەهەموجۆرێکی تێدا بێت (کورد، ئاشوری، عەرەب، تورکمان، پیر، گەنج..هتد) کە چووینە

گۆڕەپانەکەوە تەماشا دەکەین هەرچی بن دیوارو سەربان وبەلە کونەو سەردیوارو ناودەرگای ئەو بەندیخانەیە هەیە ،بەهێزی چەکداری ئەمن گیراوە ئەمان دەزانی مەسەلە چیە تاوەکو سەعات (٧)ی ئێوارە لەو گۆڕەپانەدا ڕایان گرتین، گومانی ئەوەمان هەبوو گوللە بارانمان بکەن،دەورووبەری سەعات (٧٫٤٥)ی هەمان ئێوارە لەناکاو ئەفسەرێکی بەندیخانە هاواری کرد: (هەمووتان لەجێگای خۆتانەوە سەرداخەن،کەس سەر هەڵنەبڕێ) هەموو سەرمان داخست، بەلام ژێراو ژێر سەیری گۆڕەپانەکەمان هەردەکرد، وەختێکم زانی بەسێ چوار پاسەوان تالیب عودەیان هێنا، تالیبی بەستەزمان لەزمان و پەل و پۆ کەوتبوو چووبوونە ژێر باڵیەوە،ئاو باڵای خوێنی لێ دەچۆڕا، ئەژنۆی شکابوو هەردووقاچی شل شل لەزەوی دەخشا، ئینجا هێنایان بەعەمودی بۆردی تۆپی سەبەتەی گۆڕەپانەکەوە لەبنی پێوە تاوەکو سەرسنگی بەگوریس بەستیانەوە چونکە نەیدەتوانی بەپێوە رابوەستێت، لەوسەری گۆڕەپانەکەوە یەک کۆمەڵ پاسەوانی تایبەت بە قەرەباڵغیەکی نا ئاسایی هاتە ئاراوە، وەختێکمان زانی لەناوەڕاستی قەرەباڵغیەکەوە (سەبعاوی) دەرکەوت، سەبعاوی برای سەدام حوسێنی سەرۆکی ڕژێمی عێراق بووە، ئەو کات بەڕێوەبەری گشتی ئەمن بوو ،یەکێک بوو لەو بەرپرسانەی کە بەتوندی و خوێنڕێژی ناووناوبانگی دەرکردبوو، سەبعاوی بەشکڵ و شێوە زۆر لەسەدام حوسێن دەچوو، ڕۆیشتن و ڕەفتارو هەڵسوکەوتیشی هەر بە ئەو دەچوو، هاتەلای دیوارێکەوە وەستاو تەماشایەکی تالیب عوّدەی کردو بە بەڕێوەبەری بەندیخانەی گوت (ئەوە بۆچی بەستوتانەتەوە، بیکەنەوە) ئەوەبووکردیانەوەو دوو لەپاسەوانەکان چوونە ژێر باڵیەوە بۆ ئەوەی نەکەوێت، ئاخر تالیب نەک ئێسقانەکانی لەشی بەڵکو دەم و ددانیشی شکابوو بە ئاستەم قسەی بۆ دەکرا، هەمووگیانی ئاوسابوو، ناوچاوی هەمووی جەراعەت و برین بوو، سەبعاوی لەتالیب چووە پێشێ و لێی پرسی:

* تۆ چیت کردووە؟.

- (.....)

* تۆ کێ فێری کردیت وێنەی سەرۆکی فەرماندە بهێنێتەخوارەوەو بیشکێنێت؟ بەس پێم بڵێ چۆن جورئەتت کرد؟!

- من نهم شكاندووه

* با تۆ شكاندوتەو دڕاندوشـتـەو شـايەديش هەيە لەسـەر ئەو كـارەت وخودی خۆشت دانت بەو تاوانەدا ناوە.

- من بێ ئاگا بووم هيـسـتـريام تووش بـوو، ئاگـادار نەبووم نازانم چيم كردووە.

* سەگی سەگبـاب، خائين، ناپاك، قين لەدڵ، هيـستـريا بە ئێـمـەوە دەگريت؟!

هەرچۆنێ بوو دوای ئەو گفتوگۆيە سەبعاوی فەرمانی دا دووبارە تاڵيب عۆدە ببەستنەوە، لەو كاتەدا سەبعاوی وەک پياوە ڕەزا قورسەكانی فيلمە سينەماييەكان جگەرەيەكی چروتی دەرهێناو كـردی بەدەميـەوە،وەختێكم زانی لەچوار پێنج لاوە چەرخيان بۆ پێكردنی جگەرەكەی ڕاگرت، پياوێكی ئەمنی تێكسمڕاو لەولاوە هات و چپەچپێكی بەگـوێی سـەبعـاويدا كـرد، ئەويش تەماشايەكی تاڵيب عۆدەی كردو بەقينەوە سەری باداو دووبارە لێی پرسيەوە:

* ئەدی ئەو دوو سەخيفەی تر باوک و براكەت لەكوێن؟!

- (تاڵيب سەری باداو نەيتوانی بێتە وەڵام).

* باشە مادام هێندە حەزت لای باوک و براكەتە، ئاسانە دەتنێرينە لای ئەوان ئيتر بۆچی ئەم بەزم و هەرايە دەنێيتەوە؟

لەو ساتانەدا هەمـوومـان دەمـانزانی كـە پاش دەمـێكی تر بەدڵنيـاييـەوە مـەرگی تاڵيب عـۆدە بەچاوی خـۆمـان دەبينين، ئاگـاداربووم هەندێ لەزيندانيـەكـان فرمـێسـک لەچاويانـدا قـەتيس مـابوو، گـريانێكی بەكـوڵ لەسـەرسنگيـان پەنگی خـواردبۆوە،بێگـومـان مـرۆڤ لەو كـاتانەدا خـۆی بەشـتـێكی بێ بەهادەزانێ، ئاخـر سـووردەزانێ ئەو ديمەنە دژ بەمـرۆڤـە، دڵنيـايە لەوەی ويژدان ئەو ڕووداوانەی پێ قـبـوڵ ناكـرێ، بەڵام هيچ دەسـەڵاتيـشی نييـە، هەمـوو بەنديخـانە بەدەست مـولازم مـحـەمـەدێكی هەرزەكـاری كـورتە بنەی بەد فـەسـاڵەوە زەلالەتی بوو ئاخـۆ چۆن بوێرێ لەئاست برای سەدام حوسێنی ديكتاتۆری عێراقدا قسە بكات،بەهەر حاڵ تاڵيب عـۆدە زمانی شكابوو لەولاوە دوو زيندانيـان هێنا كە شايەدی دژی ئەو ڕەفتارەی تاڵيب عۆدە بدەن، ئەو دوو زيندانيە دوو كوڕی گەنج بوون ،

یەکێکیان عەرەبی تکریتی وئەوی تر کورد بوو خەڵکی کەرکوک بوو ئەو دوانەش حاڵیان لەتاڵیب عوّدە باشتر نەبوو هێندە ئەشکەنجە درابوون،سەبعاوی لەتکریتیەکەی پرسی: ( تۆ بەچاوی خۆت دیت کە ئەم سەگبابە وێنەکەی سەرۆکی فەرماندەی شکاند ؟ ).

گەنجە تکریتیەکە: بەڵێ بەچاوی خۆم دیم.

ئینجا ڕووی کردە کوڕە کوردە کەرکوکیەکە و دووبارە پرسی: (ئەدی تۆش بەچاوی خۆت ئەو تاوانەت دی؟ ) کوڕە کوردە کەرکوکیەکە: (نەخێر من بەچاوی خۆم نەمدی، بەڵام وایان بۆ گێڕامەوە) چەند جارێک سەبعاوی چاوی لێ سوورکردەوەو هەمان پرسیاری لێ کرد، بەڵام ئەو کوڕە کوردە سووربوو لەسەر وەڵامی خۆی. دوای ئەوە سەبعاوی بەسەر ئامازەیەکی بۆ یەکێک لە پاسەوانە تایبەتەکانی خۆی کردو پاسەوانەکە هاتە پێشێ ودەمانچەیەکی خستە سەر سەری تاڵیب عوّدە و دەستی بەپەلەپێتکەکەدا نا ،هەموو سەرمان داخست و چاومان نوقاند گوێمان لێ بوو پێنج فیشەکی تەقاند، کەچی کەسەرمان هەڵبری تەماشا دەکەین تاڵیب هێشتا زیندووەو هەمووگیانی وەک شەقشەقە دەلەرزێ. ئاهێک بەناخماندا هات وهەناسەیەکی ئۆخەیمان هەڵکێشا، هەموو لەبەرخۆماندا سوپاسی خوامان کرد، توومەس فیشەکەکان فیشەکی چروک بوو واتە تەنیا دەنگی هەبوو بۆ تر ساندن. هاتینە سەر ئەو قەناعەتەی کە نایکوژن تەنیا چاوترسێنی دەکەن،لەوکاتەدا ئاگری سۆزو بەزەیی هەناومانی هەڵدەقرچاند، ئاخر گەنجێکی وەکو تاڵیب عوّدە ڕەنگە ڕۆژێ لە ڕۆژان بەخەونیش ئەم چارەنووسە ڕەشەی نەدیبێت لەو کاتەدا ئاسمانی بەغدا نم نم بارانی نیسانی دەڕشت، وەکو بڵێی ئاسمانیش بۆ حاڵی ئەو گەنجە بەستەزمانە بگری، ئێمە چاوەڕوان بووین هەموو نیگاوسەرنجەکان لەسەر عەمودی بۆردی تۆپی سەبەتەکەبوو، تۆ بڵێی ئەم تراژیدیایەکەی کۆتایی بێت وچ ئاکامێکی هەبێت؟ سەبعاوی بەئامازەیەک و سەرسوڕانێکی تر پەتی بیرکردنەوەی پساندین و وەڵامی هەموو پرسیارە شاردراوەکانی داینەوە، بەڵێ ئەو پاسەوانە هاتە پێشەوەو بەفەرمانی سەبعاوی کلاشینکۆفێکی خستە سەر ناوقەدی تاڵیب عوّدەو ( ۱۰-۱۵ )فیشەکی لەسەریەک پێوە ناو خوێن لەبن بۆردی باسکتبۆڵەکەوە جۆگەی بەست، فیشەک بڕبڕەی

پشتی تاڵیبی لەت کردو پریشکە خوێن تەنانەت بەدیواری گۆڕەپانەکەشەوە بوو ،تاڵیب چەند جارێک تینی دایە خۆی بۆ ئەوەی بەپێوە بمێنێت،بەڵام دواجار بەگوریسی عەموودەکەوە جەستەی شل وشەکەت وداماوی شۆڕبۆوە، پاش ئەو دیمەنە چەند زیندانیەک لەهۆش خۆیان چوون وبورانەوە، هەموو لەشوێنی خۆیانەوە دەلەرزین تەنانەت ئەو مولازم محەمەد جبورییەی کە هەموو زیندانیەکانی خستبووە ناڵە،لەهەموو کەس زیاتر دەترسا وەک پاسارییەکی لێ هاتبوو کە ملی دەگرن و نیەتی چەقۆڵی لێ دەهێن، ساتەوەختێک دوای ئەوە عەرەبانەیەکیان هێناو لاشەی شەکەت و خوێناوی تاڵیب عۆدەیان تێ کردو بەبەردەماندا بردیان، زۆر لەروخساری ئاو ساوی تاڵیبی بەستەزمان ورد دەبوومەوە ،هێشتا بەتەواوی روحی دەرنەچوو بوو دەم و لێوی دەلەرزی سەبعاوی هاواری دەکرد: ( دەی خێرا بەپەلە لاشەی ئەو سەگە بەرنە دەرەوە) پاشان بەڕێوەبەری بەندیخانەی بانگ کرد و بەزمانێکی فەرمان ئامێزەوە پێی گوت: (هەریەکێک لەم بێ ئەخلاقانە ورتەی لێوە هات، لەجیاتی من وەکو ئەو سەگە ڕەمی بکەو بیتۆپێنە) دوای ئەوەی سەبعاوی بەندیخانەی بەجێ هیشت (٣٠-٤٠)پاسەوان بەسۆندەو کێبڵ کەوتنە گیانمان و ڕاوەدویان ناین بەرەو هۆڵەکان،یەکێک لەو زیندانیانەی داری بەرکەوت من بووم کە تاوەکو یەک مانگیش دوای ئەوە ئازاری قۆڵم نەشکا. ئەو ڕووداوە مەرگەساتێکی دیکەی ناوبەندیخانە بوو ئاخر خەڵکانی دەرەوەی بەندیخانە ئەو دیمەنانەیان تەنیا لەفیلمی سینەماییا دیبوو، بەڵام ئێمە مانگانە تراژیدیایەکی لەو شێوەیە ئەژنۆی دەشکاندین. بەڵێ تاڵبیان بەو شێوە دڕاندنەیە کوشت و تاوەکو دوو هەفتەش دوای ئەوە کە کەس و کاریان دەهات ڕاستیەکەیان پی نەدەگوتن،بەڵکو دەیانگوت: (لەژووری تاکە کەسیدان!)، لەوەبەدواوە ئیدی پاسەوان و بەرپرسانی بەندیخانە هەرکەسێ پێی خوار دابنایە هەڕەشەیان لێ دەکردو دەیانگوت وەکو تاڵیبت لێ دەکەین .

## شەڕی ناوخۆی کوردستان لەبەندیخانەوە

حاڵ بەوشێوەیە لەنێو بەندیخانەی ئەبو غرێبدا بەردەوام بوو، تراژیدیای گوللە باران کردنی تاڵیب عۆدە هەمیشە دەهاتە خەومان، دانیشتن ونان

خواردن هیچ مانایەکی نەمابوو ،نەک هەر ئەوە بەڵکو وەخت بوو ژیان هیچ مانایەکی نەمێنێ لای زیندانیەکان. تەنیا ئێمەی خەڵکی کوردستان تروسکاییەک ئومێدمان لەلا مابوو ،هەمیشە بەخۆشی باسی بارودۆخی کوردستانیان دەکرد تاوەکو سەرەتای مانگی ئاپاری ساڵی ١٩٩٤ ئەوساڵە شوومەی هەواڵی شەڕی ناوخۆی کوردستانمان بیست، ئاخر ئەوشەڕە چەندە بۆ خەڵکی کوردستان، لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی کوردیدا ناخۆش بوو، سەد ئەوەندە بۆ ئێمەی زیندانی لەنێو بەندیخانەدا کاریگەریی خراپی هەبوو، ئێمە هێندە دڵمان بەو حکومەت و پەرلەمانە کوردستانیە خۆشبوو وامان لێ هاتبوو باکمان بەمردنیش نەبێت، هەمیشە لای برا عەرەبەکانمان دەمانگوت: ( ئێمە ئەگەر بشمرین گرنگ نییە ،چونکە بەرهەمی رەنجمان هاتۆتە دیو کوردستانمان ئازادەو کەس وکارمان لەژێر دەست ودەسەڵاتی ڕژێمی بەعسدانەماوە) عەرەبەکان ئیرەییان پێ دەبردین تائەو ڕۆژەی شەڕی ناوخۆ ئەو شیرازەیەی پچڕاند، ئەگەرچی لەنێو بەندیخانەدا هەموو زیندانیەکان وەک برامان لێ هاتبوو، (پارتی،یەکێتی، شیوعی،سۆشیالیست، ئیسلامی، عەرەب و کورد، ئاشوری و تورکمان) هیچ جیاوازیەکمان نەبوو، زیندانیانی کوردستانی بەگشتی ئەوانەی سەربەپارتی دیموکراتی کوردستان ویەکێتی نیشتمانی بوون لەهەموو کەس زیاتر ئازاریان بەدەست ئەو شەڕەوە چەشت، تەنانەت ئەو ڕۆژانەی کە لە کوردستان شەڕی ناوخۆ لە ئارادابوو ڕژێمی عێراق ڕۆژنامەکانی (الجمهوریە، الثورە، بابل)ی دەهێنایە ناو بەندیخانەوە بۆ ئەوەی دوایین هەواڵی شەڕی ناوخۆی کوردستان بزانین، ئاخر ئەوە نزیکەی (٩) ساڵ دەبوو من لەبەندیخانەدا بووم ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕۆژنامەم نەدیبوو ،ئەوەی باسی ڕۆژنامەی بکردایە هەڵیان دەواسی کەچی لەو ڕۆژانەدا بەرپرسانی بەندیخانەو پیاوانی ئەمن خۆیان دەیانهێناو دابەشیان دەکرد، ئەوەش هەر ئەشکەنجەی دەروونی بوو بەتایبەتی هەندێ ڕۆژ ناوی کوژراوانی شەڕی بڵاودەکردەوە، لەبەرچاوی عەرەبەکاندا شەرممان لەخۆمان دەکرد، هەندێ لەعەرەبە ڕۆشنبیرەکان دەم نادەمێ دەهاتنە لامان و دەیانگوت: ( خۆزگە ئەم شەڕە رووی نەدایە، ئاخر ئێوە بۆچی شەڕ دەکەن، لەپای چی؟، ئێوە سەری خۆتان بەو هەڵبژاردن وحکومەتە بەرز کردەوە کەچی وا خەریکن بەشەڕ

ناوی خۆتان دەزڕێنن) ئێمەش هیچ وەڵامان پێ نەبوو، حەزمان دەکرد ئەو پرسیارانە نەکەن و برینمان نەکولێننەوە، دەمانگوت: ( وەڵا ئێمەنین، بیلا ئێمە نین، ئێمە هیچ دەسەڵاتێکمان لەوشەڕەدا نییە)، هەندێ جار لەگەڵ برا زیندانیەکانی سەر بە یەکێتی نیشتمانی دەکەوتینە گفتوگۆو دەمەتەقێ،بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ڕێزی یەکتریمان دەگرت، وەلید حەداد ئەو ئەفسەرەی کە بەتۆمەتی هاوکاریکردنی شۆڕشی بارزانی حوکم درابوو دەم نادەمێ بەبرایانی زیندانی سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانی دەگوت: ( من ئاگام لەوردەکاری ئەم شەڕەنیە، بەڵام دڵنیام خەتای ئێوەی تێدایە چونکە حەزتان لە شەڕو ئینشیقاقە) ئەوانیش دەیانگوت: ( بەخودا ئێمەش لەم بەندیخانەیەوە وەک هەمووکەس ئەو شەڕەمان پێ ناخۆشە پێی شەرمەزارین، بەڵام دەسەڵاتمان چیە؟) ئیدی ئەم حاڵە بەردەوام بوو، هەموو جارێک کە لایەنە شەڕکەرەکانی کوردستان ئاشت دەبوونەوە ئێمەش ورەمان بەرزدەبۆوەو دەنگمان لەنێو زیندانیەکاندا دلێر دەبوو،بەڵام لەگەڵ دەسپێکردنەوەی شەڕ دووبارە دەهاتینەوە ژێر سفر!! ئیدی بارودۆخی نێو بەندیخانەش بەو شێوەیە بەردەوام بوو، پاسەوانانی نێو بەندیخانە لەجاران هارتر بوون یاساکان زیاتر توندوتیژ دەبوون، ڕۆژنەبوو دوو سێ زیندانی فەلاقە نەکرێن و ژوورەکانمان نەپشکنن و ئازاری دەروونیمان نەدەن، بەو شێوەیە بەخەمی گەورەی شەڕی ناوخۆی کوردستانەوە ساڵی ١٩٩٤یشم لەنێو بەندیخانەی ئەبو غرێبدا تەواو کردو وردە وردە پێ دەنێمە دەهەمین ساڵی زیندانیمەوە.

# ساڵی ١٩٩٥ ساڵی ئازادی

ئەگــەرچی لەکــۆتایی ئەو ســاڵەدا دەنگۆی دەرچوونی بڕیارێکی دیکەی لێبوردن هاتە ئاراوە، بەڵام خودی خۆم هیچ دڵم پێی خۆش نەبوو، چونکە لەلایەکــەوە شــەڕی ناوخــۆ بێ هیــوای کــردبووم ولەلایەکی دیکەوە هێندە بڕیاری لێبوردن دەرچوو من و هەڤاڵانمی نەگرتەوە، ئیدی دەستم لەئازادبوون شتبوو، بەدرێژایی ڕۆژانی ساڵی ١٩٩٤ خەڵکێکی زۆریان وەکو زیندانی نوێ هێنایە لامــان ،هەرییەکــەو بەتۆمــەتی جــیاجــیا حــوکم درابوو، بەڵام لەخەڵکی کوردستان تەنیا کوڕێکی گەنجیان هێنا. ساڵی (١٩٩٥) وێڕای بڵاوبوونەوە دەنگۆی لێــبــوردن،یەکــێــک بوو لەســاڵە هەرە ناخــۆشــەکــانی بەندیخــانە برســێــتی وقــات وقڕی و ئەو تەنگژە ئابوورییەی لەعــێــراقــدا بەرقەرار بوو ژیانی خــەڵکی کــردبووە دۆزەخ، لەنێــو بەنــدیخــانەشــدا وێڕای کــاردانەوەی هەمــوو بارودۆخــێکی نــاهەمــواری عــێــراق بەخــراپی، بەپرســان وپاســەوانان وجــەلادەکــان بەردەوام بوون لەســەر فــشــاری خــۆیان، ئیــدی کــە دەڵێم فشــار ئەشکەنجەی زیندانیەکان بوو بەهەمــوو شێوەو شێــوازێک هەر چەند ڕۆژ جارێک سێ چوار بەرپرس دەهاتن تــەماشایەکی پەنجەرەی ژووررو هۆڵەکانی بەندیخانەیان دەکردو پاش کــەمێکی تر لەحیــمچیان دەهێناو سێ چوار شیــشــیــان بۆ کــەتیــبــەی پەنجەرەکــەمــان زیاد دەکــرد، ئیــدی هەمــوو هەڵســوکــەوت و رەفــتــارێکی دەســەڵادارانی بەندیخــانە گــوزارشــتی لەیەک ووشــە دەکــرد ئەویش ووشــەی (ســوکــایەتی پێ کــردن)بوو، بێگومــان بۆ خەڵکی کوردستانیش خەمێکی قوڵــتر هەبوو ئەویش خەمی شەڕی ناوخۆی کوردستان بوو، زیندانیەکان وەکو جاران متمانەیان بەیەکتری نەدەکرد، برا متمانەی بەبرا نەبوو، تەنیا ئێمە وەکو زیندانیە کۆنەکان هەندێ قسەمان لەگــەڵ یەکــتری دەکــرد ئەویش هەمــووی بێ ئومــێدی دەگــەیاند، هەر کــەس

باسی مەسەلەیەکی سیاسی بکردایە، لەولاوە یەکێکی دی دەیگوت: (واز لەو قسانە بهێنن وخۆتان هەڵمەخەڵەتێنن بە ٣٠ دەوڵەت عێراقیان پێ نەڕووخاو هیچیان پێ نەکرا، دەبێ ئێمەی زیندانی بێ دەسەلات چیمان پێ بکرێت؟!) ڕەشبینیەکی ئەژنۆ شکێن باڵی بەسەر بەندیخانەدا کێشابوو، ئەو ساڵە عەزیز لازارو ئۆدیش لەژێر لێدان و ئەشکەنجەدا تووشی نەخۆشی شیزۆفرینیابوو بوون، هەمیشە ئێمە ژوورەکەمان بۆ پاک دەکردنەوە،چونکە خۆیان خزمەتی خۆیان پێ نەدەکرا، ئودیش کوڕێکی مەسیحی موسڵاوی بوو تاوانی ئەوەیان دابووە پاڵ گوایە سیخوڕی بۆ ئیسرائیل کردووە، بەهەر حاڵ پیس و پۆخلی ژوورو هۆڵ و ڕاڕەوو گۆڕەپانی بەندیخانەش گرفتێکی گەورەبوو،لەنێو بەندیخانەدا هیچ خزمەتگوزارییەک نەمابوو، زێراب وئاوەڕۆکانی بەندیخانە هەتا خۆمان پارەمان بۆ کۆ نەکردایەتەوە نەدەهاتن بۆ پاککردنەوەی زێرابەکان. ئەگەر گڵۆپێک بسووتایە دەبوایە خۆمان بیکڕینەوە،دەرگا و پەنجەرەکان یەک پارچە ژەنگ و پیسی بوو، دیوارەکان هەموو ڕزی بوون و شێی هەڵهێنابوو وردە وردە درزی تێ دەکەوت وبەردەبوونەوە هیچ هۆیەکی خۆ گەرم کردنەوە نەبوو تەنیا هالاوی دەمی زیندانیەکان هۆڵەکەی گەرم دەکردەوە، بەسێ چوار لێفەو بەتانی ئینجا گەرمان نەدەبۆوە، هەوایەکی ساردو سڕو وشکە سەرمایەک لەهۆڵەکاندا بوو دەیان نەخۆشی زستانی لەنێو زیندانیاندا بلاوکردبۆوە (ئەنفلۆنزا، هەلامەت، کۆکە بەهەموو شێوەکانیەوە،ئازاری گورچیلە، هەوکردنی گەروو) بێگومان بۆ هەموو ئەم دەردونەخۆشیانە تەنیا دووجۆر حەب هەبوون ئەوانیش حەبی باراستیۆڵ وئەسپرینی (ئێکسپایەر!!) بوون هەر کاتێکیش زیندانیەک بیگوتایە نەخۆشم، ئەوەندە بگرەوبێنەو بەردەیان پێ دەکرد، خودی خۆی پەشیمان دەبۆوەو خۆزگەی دەخواست هەر قسەی نەکردایە، ئەو بەشەی ئێمە کەبە (ق-١) ناوزەد دەکرا، زۆربەی هەرە زۆری زیندانیەکانی پیرو پەککەوتە وبەساڵا چووان بوون، لەو زیندانیە بەتەمەنانەشدا کەسێکی ساغی تێدانەبوو لەڕووی تەندروستیەوە زۆربەیان نەخۆشی ڕەبۆیان هەبوو، گەیشتبووە حاڵێک کە بوتڵی ئۆکسجینیان لەدەرەوە بۆ دەهێناو ئەویش لەپشتی خۆی دەبەست، کەم زیندانی هەبوو بەعەلاگە دەرزی و حەب ودەرمانی لەژێر قەرەوێڵەکەیدا دانەنابێت، بێگومان کەسو کاریان لەکاتی

دیدەنیدا بۆیان دەهێنان، هۆڵ وژوورەکانی بەندیخانە تا دەهات قەرەباڵغتر دەبوو ئەو ساڵەش ڕۆژانە دوو سێ زیندانی تازەیان دەهێنایە لامان، تەنیا بەشەکەی ئێمە (٥٦٠) زیندانی تێدابوو، کارگەیشتە ئەوەی هەندێ زیندانی بەشەو نەدەخەوتن و بۆسبەی کەبرادەرێکیان شوێنەکەی چۆڵ دەکرد ئینجا دەچووە جێی ئەو دەخەوت واتە بەسەرە، ژووری وا هەبوو لەڕووبەری (٣×٤)مەتردا (٢٢)زیندانی تێدا دەژیا، بەو شێوەیە قەرەباڵغی و پیسو پۆخـڵی و بێ خـزمـەتگوزاری دووبارە بووە هۆی دیاردەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و چەندین مێروو دەعبای ناشرین، ئیدی هەر لەکێچ و ئەسپێوە تا دەگەیشتە سیسرکەو قالۆچەی ئەڵمانی، کە ئەمەی دواییان هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشیە جۆراو جۆرەکانی پێست وەک خورووشت وگەڕی...هتد. دووبارە ئەو تەختە کالوسە نەفرەتیە پەیدابۆوە هەموو ڕۆژانی هەینیەک جل وبەرگەکانمان لەناوی گەرمدا دەکوڵاند و ژوورەکانمان پاک دەکردەوە، بەڵام هەر بێ سوود بوو ،کە کەس و کارمان دەهاتنە دیدەنیمان نەمان دەزانی داوای دیتۆڵ و داوودەرمانی پاکژکەریان لێ بکەین یاخود داوای نان و پارە!!

## شەرمەزاری لەئاست کەس و کارماندا!!

ئەو ماوەیە ڕێگەی نێوان بەغداو شارەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی کوردستان یەکجار زەحمەت و پڕ ئەرک و ئەزیەت بوو، کار گەیشتبووە ئەوەی لەچەمچەماڵەوە تا ناو کەرکوک دەبوایە خەڵک بەلۆری و گەڵابە بێت، بۆیە ئەو ماوەیە شەرمان دەکرد داوای کەلوپەل و پێداویستی خۆراک لەکەسو کارمان بکەین، چونکە دەمانزانی تادەگەنە لای ئێمە، چەند ئازار دەچێژن و چۆن سوکایەتیان پێ دەکرێت! ئەوە ماوەیە دیدەنیش دەبوایە لەنێو هۆڵەکاندا بوایە ئەگینا ناو گۆڕەپانی بەندیخانە قەدەغە بوو چونکە بەرپرسانی بەندیخانە بەشێوەیەک ترسیان لێ نیشتبوو حسابیان بۆ هەموو شتێک دەکرد، کەسو کارمان ڕۆژی پێشوو دەهاتن و ئەوشەوە لەبەغدا لە ئوتێلەکان دەمانەوە، ئینجا بۆ سبەی بەیانی زوو دەهاتنە بەندیخانە یەکەمین کەس ئەوانەی کوردستانیان دەکردە ژوورەوە سەعات (١١)ی پێش نیوەڕۆش بەر لەهەموو کەس دەبوایە ئەوان بڕۆنە دەرەوە، بەو شێوەیە

تەواو کۆنترۆڵی بەندیخانەیان کردبوو،جموجۆڵ و ئەملاولای زیندانیەکان بنبڕبوو بوو، تەنانەت پێکەنینیش بەدەنگی بەرز قەدەغە بوو.

## ئەو ڕۆژەی نووسیم بژی P.D.K

مانگی نیسانی ساڵی ١٩٩٥ بوو ئەو ماوەیە چوونە دەرەوە سەر ژمێری کردن بەم شێوەیەبوو: زستانان و پایزان سەعات (٨) بەیانی سەرژمێر دەکراین وتا سەعات (٣)ی عەسر بۆمان هەبوو لەگۆڕەپانەکەدا بین، دوایی سەرژمێر دەکراینەوەو دەچووینەوە ژووری،بەڵام بەهاران و هاوینان هەمان ماوەی بەیانیان وجگە لەوە ئێوارانیش لەسەعات (٥)ی عەسر تاوەکو ٨ی ئێوارە بۆمان هەبوو لەگۆڕەپانەکەدا بمێنینەوە. لەو مانگەدا ڕۆژێکیان من وهەڤاڵێکم کە ئەویش لەسەر ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان حوکم درابوو پێکەوە لەگۆڕەپانی بەندیخانەدا دانیشتبووین، ئیدی پێکەوە قسەمان دەکرد، بەڵام زۆر بەهێواشی، چونکە مەجید قەسرۆکی لە پشتمانەوە دانیشتبوو، ئەو مەجیدە لەنێو زیندانیەکاندا گومانی ئەوەی لێ دەکراکە سیخوڕی بۆ بەرپرسانی بەندیخانە بکات، بۆیە زۆر جێگای متمانە نەبوو،ئەوەبوو من و هەڤاڵەکەم کەوتینە گفتوگۆو دەمەتەقێ وباسی بارودۆخی کوردستان و شەڕی ناوخۆ و ئاکامی ئەو دۆخەمان دەکرد، باسی ئەو ڕۆژە خۆشەمان دەکرد ئەگەر ئازاد بکرێین سەرکردەکانمان زۆر بەگەرمی پێشوازیمان لێ دەکەن وجێگای ڕێز دەبین، منیش لاسکی گەڵا چاو بازەیەکی حەوشەم بەدەم قسەوە قرتاندو پارچە خشتێکی مەیلەو زەردم لەبەر دەستدابوو، هەر بەدەم گفتوگۆوە بەبێ ئەوەی هەست بکەم ئەوە گۆڕەپانی بەندیخانەیەو ڕەنگە کێشەی گەورەم بۆ دروست بێت، لەنەستەوە بەلاسکی چاوبازەکە لەسەر پارچە خشتەکە نووسیم (بژی P.D.K) لەو کاتەدا برادەرێک لەبن دیواری یەکێک لەبیناکاندا هەر لەنزیک ئێمەوە بوتڵەغازێکی دانابوو خواردنی لەسەر ئامادە دەکرد، ئێمە لەو قسەکردن و خەیاڵەخۆشانەدا بووین، وەختێکمان زانی بوتڵە غازی بەردەم کابرا گڕی گرت و هەردووکمان ڕامان کرد بەرەو لای بوتڵە غازەکە بۆ ئەوەی ئاگر کە بکوژێنینەوەو ئەو برادەرە لەو میحنەتە ڕزگار کەین، ئەوەبوو ئاگر کوژایەوەو قەرەباڵغیەکە نەما. منیش بەهیچ شێوەیەک بیری ئەوەم نەمابوو کە لەسەر

خشته بچووکه‌که نووسیومه (بژی P.D.K) نه‌چووینه‌وه بۆ شوێنه‌که‌ی خۆمان تائه‌و کاته‌ی پاسه‌وان هات و چووینه‌وه ناو ژووره‌کانی خۆمان و سه‌رژمێر ده‌ستی پی کرده‌وه، ئیدی ئێواره داهات و ده‌وروبه‌ری سه‌عات (٨)سه‌رقاڵی ئاماده‌کردنی خوانی ئێواره بووین، وه‌ختێکم زانی یه‌کێک له‌پاسه‌وانه باشه‌کان به‌ره‌نگ و ڕوویه‌کی گرژه‌وه هات به‌شوێنمداو گوتی: (شێرزاد ئه‌فسه‌ری خه‌فه‌ر تۆی ده‌وێ) منیش هاتمه ده‌رێ و لێم پرسی:

* ها چی بووه خێره؟
- وه‌ره ئه‌فسه‌ره‌که ئیشی پێته
* نازانی منی بۆ چیه؟
- ماڵت به‌قوڕگیرێ ئه‌وه‌چیت کردووه؟
* هیچ
- وه‌ڵاهی مولازم محه‌مه‌د زۆر توڕه‌یه لێت.

منیش هیچم له‌خۆمدا شک نه‌ده‌برد، بۆیه چیتر پرسیارم له‌پاسه‌وانه‌که نه‌کردو به‌وپه‌ڕی متمانه‌و بڕوا به‌خۆبوونه‌وه ملی ڕێگه‌م گرت به‌ره‌و ژووری ئه‌فسه‌ری ئێشکگر، به‌ر له‌وه‌ی بگه‌مه جێ دیتم مه‌جید قه‌سرۆکی له‌ژووری ئه‌فسه‌ره‌که هاته ده‌ره‌وه، منیش یه‌کسه‌ر گومانم لێی کرد، له‌دڵی خۆمدا گوتم ره‌نگه له‌سه‌ر سه‌هۆڵ فرۆشتن شکاتی لێ کردبم، بیری ئه‌و پارچه خشته‌ی گۆڕه‌پانی به‌ندیخانه‌م هه‌ر نه‌بوو! له‌ڕێگا مه‌جید زۆر به گه‌رمی سڵاوی لێ کردم منیش به‌ساردی وه‌ڵامم دایه‌وه، گه‌یشتمه ژووری ئه‌فسه‌ری خه‌فه‌ر ته‌ماشاده‌که‌م ئه‌فسه‌رێکی تازه‌ی ڕووح سووک له‌سه‌ر کورسیه‌ک دانیشتبوو و مولازم محه‌مه‌د جبورییش به‌پێوه راوه‌ستاوه‌و چاوه‌ڕوانی من ده‌کات، هه‌رکه سه‌رم کرد به ژوورا هێشتا ئێواره باشم نه‌کردبوو، مولازم محه‌مه‌د وه‌کو سه‌گی هار تێم به‌ربوو به‌شه‌ق و زلله‌و بۆکس ئینجا گوتی: (ئاده‌ی ده‌ستتم پیشان بده با سه‌یری بکه‌م) منیش هه‌ردوو له‌پی ده‌ستی خۆمم خسته به‌رده‌می پاک و خاوێن بوو، ته‌ماشای ئه‌فسه‌ره‌که‌ی ئه‌و لاوه‌م ده‌کرد پێکه‌نینی به‌وحاڵه ده‌هات دیاربوو هێشتا به‌ته‌واوی شاره‌زای بارودۆخی به‌ندیخانه نه‌بوو بوو، من تا ئه‌و کاته‌ش نه‌م ده‌زانی بۆچی به‌م شه‌وه ئه‌م ئه‌فسه‌ره که‌وتۆته گیانم و چی لێم ده‌وێ، به‌ڵام دڵنیابووم که ئه‌م لێدانه‌م له‌ژێر سه‌ری مه‌جید قه‌سرۆکیدایه ،وه‌ختێکم زانی

مولازم محەمەد پارچە خشتەکەی دەرهێنا کە لەگۆڕەپانەکە لەسەری نووسیبووم (بژی P.D.K) دەستبەجێ هێدمەیەک لێی دام و زانیم دوای ئەوەی من و هەڤاڵەکەم گۆڕەپانمان بەجێ هێشتبوو مەجید قەسرۆکی پارچە خشتەکەی هەڵگرتۆتەوەو هێناویەتی بۆ ئەفسەرەکەو هەموو شتێکی بۆ ڕوون کردۆتەوە، ئینجا مولازم محەمەد جبوری پارچە کاغەزێک و پێنووسێکی دامێ گوتی: (دەی چیت لەسەر ئەو خشتە نووسیوە،لەسەر ئەم کاغەزە بینووسەرەوە)منیش پێنووسەکەم لێ وەرگرت و گوتم: (چی نووسراوە؟) خۆم دا لەگێلی ئەویش بەتوڕەییەوە گوتی: ( چی نووسراوە وەک خۆی بینووسەرەوە) منیش لەسەر لاپەڕەکە وەکو خۆی نووسیمەوە،ئینجا مولازم محەمەد پرسی:

* ئەوە یەعنی چی؟
- (بژی P.D.K)
* سەرسەری بەعەرەبی پێم بڵێ (بەتوڕەییەوە)
- یعیش P.D.K
* یەعنی تۆ نووسیوتە یعیش حزب الدیموقراطی الکوردستانی (کەوتەوە لێدانم)
- بەڵام تۆ ڕێگەم بدە بەرگری لەخۆم بکەم
* نەخێر هیچ بواری تێدانییە هەر ئیعدامت دەکەم... لەراستیدا من هیچ لێی نەدەترسام لەبەر دوو هۆ یەکەمیان چونکە هێندە ئازارم بەدەستەوە چەشتبوو هێندە هەڕەشەی کردبوو هیچی پێ نەدەکرا، دووەمیان لەبەرئەوەی ئەو ماوەیە زۆر بێ هەیبەت بوو لەبەرچاوماندا،ئاخر هەرزەکارێکی کورتەبنەی وەکو ئەم محەمەد جبوریە تۆ بڵێی کاری وای پێ بکرێت؟!، بێگومان هەر چەند سەیری ئەفسەرەکەی تەنیشتیم دەکرد لە پێکەنینی خۆی بەردەوام بوو، بەهەر حاڵ محەمەد جبوری موارسیلەکەی خۆی بانگ کردو فەرمانی دا کە بمباتە ژووری لێکۆڵینەوەو پەنجە مۆرم وەربگرێت، لەرێگا یەکێک لە پاسەوانەکانی پێی گوتم: (مەترسە ئێستا دڵی نەرم دەکەمەوە، هیچ خەمت نەبێت) ئیدی لەژووری تاکە کەسی بەندیان کردم تاوەکو سەعات (١٢)ی شەو .ئەو ژوورە تاکە کەسیە هەر لەتەنیشت ژوورەکەی خۆی بوو، دەم نادەمێ دەیویست بمترسێنێ گوایە بەتەلەفۆن قسە

لەگەڵ سەرووخۆی دەکات،دەنگی بەرزدەکردەوەو دەیگوت: ( ئێستا زیندانیەکتان بۆ دەنێرم تاوانێکی زۆر گەورەی ئەنجام داوە) منیش لە گاڵتەو قەشمەری زیاتر هیچ هەستێکم بەرامبەر بەقسەکانی نەبوو،چونکە زوو زوو پاسەوانەکەی دەهاتە لای دەرگای ژوورەکەوەو پێی دەگوتم: (هیچ نییە بڕوای پێ مەکە فشەیە) تاوەکو نیوەی شەو لەو ژوورەدا مامەوە، ئینجا مفەوەزێکی ئەمن هات حزبیەکی گەورەش بوو لە بەندیخانە ئەفسەرەکان لێی دەترسان، دەرگای ژوورەکەی کردەوەو لێی پرسیم: ( ئەوە چی دەکەیت لێرە بەم شەوە؟) منیش گوتم: ( وەڵاهی نازانم مولازم محەمەد بەندی کردوم) ئەوەبوو دەرگای داخست و هەر لە پشت دەرگاکەوە بانگی مولازم محەمەدی کردو لێی پرسی، ئەویش کۆمەڵێ جنێوو قسەی ناشرینی بەمن گوت و مەسەلەکەی تێ گەیاند، منیش لەم دیو دەرگاکەوە هاوارم کرد: (تەنیا یەک دەقیقە بوارم بدە قسە بکەم وبەرگری لەخۆم بکەم) لەو کاتەدا مفەوەزی ئەمنەکە دەرگاکەی کردەوەو قوڵی گرتم و گوتی: ( ڕێگەی بدە با بەرگری لەخۆی بکات بزانین چی دەڵێت) ئینجا هاتمە دەرەوەو بە هەردووکیانم گوت: (یەک کەس هەیە زۆر ڕقی لەمنە، ئەگەر ئەو شکاتی لێ نەکردبم وئەو تاوانەی بۆ دروست نەکردوم، ئامادەم ئیعدامم بکەن)، مفەوەزی ئەمنەکە: (فەرموو ناوی بڵێ کێیە؟)

گوتم: (مەجید قەسرۆکی نییە؟!).

مفەوەزی ئەمنەکە: (ڕاست دەکەیت ئەو مەجیدە پیاوێکی زۆر سەخیف وهیچ وپووچە)، دەستبەجێ فەرمانی دا مەجید بهێنن بۆ ژوورەکە، ئەوەبوو مەجیدیش هات و بەحاڵی من چوو، هێشتا سڵاوی نەکردبوو، مفەوەزەکە بەشەق و زللە و بۆکس کەوتە گیانی بەسەریا دەیناڕاند: ( سەرسەری بۆچی شکاتت لەو کوڕە کردووە، باش بزانە ئەگەر ئەو یەکجار خائین بێ تۆ دووجار خائینی لەبەرئەوەی خوێڕیەتی دەکەیت و وەتەنیاتمان لەسەر دەفرۆشی)، پاش ئەوەی چینێکی باشی تێ هەڵداو سووک و ڕیسوای کرد لەبەرچاوی من و مولازم محەمەد و پاسەوان و موراسیلەکاندا دواجار دوو زللەی لێداو پێی گوت: ( جارێکی تر لەم ناوەدا بتبینم هەموو گیانت بەشەق دەشکێنم) پاش ئەوە دوو زللەشی لەمن داو گوتی: ( تۆش بڕۆ)، منیش هەر لەبەرچاوی ئەودا هەڕەشەم لەمەجید کرد، کە مەجید ڕۆیشت

مفەوەزی ئەمنەکە منی بانگ کردو پێی گوتم:
* تۆ ساڵانێکی زۆرە لێرەیت و کوڕی باشی حەز ناکەم خۆت تووشی کێشە وگرفت بکەیت، هەر قسەیەک لەگەڵ مەجید بکەیت کێشەکەی خۆت تازە دەبێتەوە.
- بەڵام من وازی لێ ناهێنم حەقی خۆمی لێ دەکەمەوە.
* تۆ بەقسەی من بکەو وازی لێ بهێنە( پاشان هەڕەشەی لێکردم)
منیش سوپاسم کردو رۆیشتم، کە چوومەوە ناو هۆڵەکە هەموو زیندانیەکان هاتن بەپیرمەوەو ماچیان کردم،پاشان هەندێ لەبرادەرە نزیکەکانی مەجید قەسرۆکی هاتنە لام و داوای لێ بوردنیان کردو بەڵێنیان دا کە هەڕەشە لەمەجید بکەن وحەقی منی لێ بسێننەوە، ئەگەرچی هێشتا سووربووم لەسەر ئەوەی لێی بدەم،بەڵام ئەو شەوەی خۆم و فوئاد کوردی ویستمان لەمەجید بدەین پەنجەم بوو بەدەرگا ئاسنەکەی هۆڵەکەوەو تا چەند رۆژێکیش چاک نەبۆوە، بەو شێوەیە دەستبەرداری حەقی خۆم بووم، ئیدی حاڵ بەو شێوەیە رۆیشت تاوەکو مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٥، کەسەر لەنوێ دەنگۆی بڕیاری لێبوردن هاتەوە بەرباس.

## دوایین ڕۆژانی بەندیخانە

هەرلەسەرەتای مانگی حوزەیرانی ئەو ساڵەوە دەنگۆی لێبوردن هەبوو،بەڵام کەس نەیدەزانی وردەکاری ئەو بڕیارە چۆن دەبێ و کێ دەگرێتەوە، کەسانێک هەبوون لەوپەڕی گەشبینیدا بوون و هەندێکی تر بە پێچەوانەوە، من لەگەڵ ئەوەی لە (١٥) ساڵ حوکمەکەی خۆم تەنیا (٥) ساڵم مابوو، بەڵام یەکێک بووم لەو زیندانیانەی کە ڕەشبین بووم بەو لێبوردنە،ئاخر من راهاتبووم لەسەر ئەوەی هەمیشە یەکەیەکە ئەملاولای زیندانیە ئازادکراوەکان ماچ کەم ومالئاواییم لێ بکەن و بە نا ئومێدی بگەڕێمەوە سەرقەرەوێڵەکەی خۆم وخەمۆکی دامرمێنی، تاوەکو یەکەمین رۆژی هەینی مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٩٥. ئەو هەینیە کاتی دیدەنی وسەردانی کەسوکارم بوو باوکم هاتبووە سەردانم لەو دەمەدا کە لەگەڵ دیدەنیکارانمدا پێکەوە لەهۆڵەکەدا دانیشتبووین تەلەفزیۆنی ناو هۆڵی بەندیخانە کرابۆوە، مەلایەکی یەکێک لەمزگەوتە گەورەکانی شاری بەغدا

وتاری نوێژی جومعەی موسڵمانانی دەخوێندەوە، قسەکانی ئەو مەلایە سەرنجی هەموومانی ڕاکێشا، ئاخر ئەوە یەکەمین جار بوو مەلایەک لەنێو شاری بەغدای پایتەختی ڕژێمی عێراقدا ڕێگەی پێ بدرێت قسەی وا عەقڵگر بدرکێنێ، نوێترین شت بوو کە کەسێک لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمی بەعسدا لەمینبەری مزگەوتەوە باسی ئازادی مرۆڤ و کەرامەتی ئادەمیزاد بکات، بێ شک ڕژێم لەو هەنگاوە دا مەبەستی تایبەتی خۆی هەبوو هەموو کەس دڵنیابوو لەوەی ئەم مامۆستا ئاینیە بەرێزە، تیشکی سەوزی لەدامودەزگا ئەمنیەکانی ڕژێمەوە وەرگرتووە ئینجا دەتوانێ ئەو قسانە بکات، بەڵێ ئەو مامۆستا بەرێزە لە وتارەکەیدا ئەم قسانەی کرد( داوا لەسەرۆکی فەرماندە دەکەین «خودا بیپارێزێ!» کە بڕیارێکی لێبوردن بۆ زیندانیەکان دەر بکات) بێ شک ئەگەر مۆڵەتی وەرنەگرتایە کێ حەدی ئەوەی هەبوو داوا لەسەرۆکی فەرماندە بکات!، بەهەر حاڵ لەکۆتایی قسەکانیدا ئەو مامۆستا ئاینیە بەرێزە گوتی: (دایک و باوکی ئەو زیندانیانە گوناحن دەبێ بەزەییمان پێیاندا بێتەوە، ئاخر هەر ئەوانیش دایک وباوکی شەهیدانی قادسیەی سەدامن) ئەو وتارەی مامۆستا زۆر بەختەوەرو دڵشادی کردین، زانیمان لەم ماوەیەدا لێبوردنێک هەردەبێت، پەیتا پەیتا ئادەهات دەنگۆی دەرچوونی بڕیارەکە بەهێزترو بەرفراوانتر دەبوو، ئەوەبوو ڕۆژی ١٩٩٥/٧/١٧ کاتی دیدەنیم بوو،ئەو ڕۆژە بەنیاز نەبووم کەسو کارو خانەوادەم سەردانم بکەن، چونکە هەفتەی پێشوو دایکم و باوکم لام بوون ئاخر هەر لەسەرەتایی ڕۆژانی بەندیخانەی ئەبو غرێبەوە، خشتەی سەردانەکانم بەشێوەی جار ناجارێ بوو واتە بەدوو دیدەنی جارێک دەهاتنە لام چونکە ڕێگەی سلێمانی بۆ بەغدا دوور بوو، خۆم بەدایک و باوکم و خوشک براکانم گوتبوو کە بەو شێوەیە بێنە لام، بۆیە ئەوبەیانیە (٧/١٧) چاوەڕێی کەسم نەدەکرد، کەچی وەختێکم زانی باوکم و نەهلەی خوشکم بە بێ تاقەتی خۆیان کرد بەژووردا هیچ بەخێر هاتنم نەکردن یەکسەر زانیم شتێک ڕوویداوە لێم پرسین:(چیە بۆ وا زوو گەڕانەوە ڕەنگ و ڕووتان بۆچی وا ڕەش داگیرساوە؟) باوکم گوتی: (هەر هەفتەی پێشوو کە لەگەڵ دایکتدا هاتینە دیدەنیت، ئیدی نەرۆیشتینەوە بۆ سلێمانی چونکە دایکت نەشتەرگەری بۆ کراوە ئێستا لەبەغدا لەنەخۆشخانە

کەوتووە) منیش لەخەفەتی دایکم هیچم بیر نەما، خەریک بوو گریانم دەهات دڵم پڕ بوو، بیری لێبوردن و ئازادبوونم نەما، وەختێکم زانی دەنگی تەلەفزیۆنی ناوهۆڵەکەیان بەرز کردەوەو زیندانیەکان کپ و بێ دەنگ بوون،کەس ورتەی لێوە نەهات تەنیا دەنگی گڕی بێژەرەکەی تەلەفزیۆنی بەغدا لەئارادابوو، ئەوەبوو پاش خوێندنەوەی پێشەکیەکی کورت بۆ بڕیارەکە ئینجا بەعەرەبی گوتی: (یعفی عفوا خاصا، من من تبقی من نصف محکومیتە) بە لێبوردنێکی تایبەت لەو کەسانە دەبوورێت کە نیوەی ماوەی حوکمەکەیان ماوە،ئای لەو هەواڵە چەند خۆش بوو، تۆ بڵێی من بگرێتەوە! بەجارێ ژوورو هۆڵ و ڕاڕەوی بەندیخانە بوو بەگۆرانی وچەپڵەو هەلهەلە لێدان، من یەکێک بووم لەو زیندانیانەی کە نەک هەر نیوە بەڵکو ۱/۳ی ماوەی حوکمی خۆم تەواو کردبوو، منیش لەگەڵ زیندانیەکاندا دەستم کرد بەچەپڵە و گۆرانی دەیدەنکاران و زیندانیان هەر کەس لە ئاست خۆیەوە باوەشی دەکرد بەوی تردا باوکم لەخۆشیا دەگریا، هێشتا دوو دڵ بوو هێشتا دڵنیا نەبوو لەوەی ئاخۆ ئەم بڕیارەیان من دەگرێتەوە یان نا، نزیکەی یەک سەعات بوو بە پێی یاساکانی بەندیخانە کاتی رەسمی دیدەنیمان تەواو بوو بوو، کەچی کەس نەدەهات بیانکاتە دەرەوە،تا ئەو کاتەی بەڕێوەبەری بەندیخانە هات وبەڕوویەکی خۆشەوە پیرۆزبایی لەزیندانی و کەس و کارەکانیان کردو پێی گوتن: (تکاتان لێ دەکەین زوو بڕۆنە دەرەوە، بۆ ئەوەی دەست بکەین بەرێکخستنی دۆسیەو مامەڵەکانیان هەمووی چەند ڕۆژێکی ترە ئیدی کوڕەکانتان بەسەلامەتی دێنەوە لاتان) ئەو ڕۆژە بەڕێوەبەری بەندیخانە زۆر نوورانی و روح سووک بوو،جا نازانم خۆی وای لەخۆی کردبوو،یان ئێمە لەخۆشی قسە خۆشەکانی وامان دەبینی،ئاخر خۆ هەر ئەوبەڕێوەبەرە بوو کە ماوەیەک لەمەوبەر دەهات وچەند جارێک وسوکایەتی پێ دەکردین، نازانم ئەو ڕۆژە بۆچی وا رەزای سووک بوو! کەسوکارمان بەوپەڕی رێزەوە کرانە دەرەوە، کەس ئاگای لەهیچ شتێک نەمابوو خۆشیەک ئەو بەندیخانەیەی گرتبۆوە کەس نەیدەزانی مانای ئەو ئازارانە چی بوون کە بەدرێژای سالانی رابردوو لەم بەندیخانەیەدا چەشتمان، هەندێکمان زۆر دوو دڵ بووین دەترساین ئەمجارەش بڕیاری لێبوردن نەمانگرێتەوەو نا ئومێدبین،بەلام شیرازەی

جموجۆڵ و ژیانی ئاسایی نێو بەندیخانە تێک چوو بوو، کەس نەیدەزانی چی بخوات وکەی نان بخوات،خەونەمابوو، شەوانە تا بەرەبەیان پێکەوە قســـەمـــان دەکـــرد، باسی ئەو هەمـــوو ڕۆژانەی رابردوومـــان دەکـــردو هەموولەیەکترمان دەپرسی، تۆ لەکەیەوە گیراوی؟ چەند تەوقیف بوویت؟ بەنیازی ئازاد بکرێیت؟ مادەکەت چیە؟ کێشەکەت چیە؟ ئیدی دەتگوت دۆسیە بۆ یەکتری پڕ دەکەینەوە، هەر پاسەوانێک لەدەرگای هۆڵەکە نزیک بوایەتەوە هەموو رامان دەکرد بەپیریەوە دەچووین و وردەکاری بڕیارەکەمان لێ دەپرسی! هێشتا کەس لەئازادبوونی خۆی دڵنیا نەبوو، بەڵام خۆشی و شادی بەردەوام لەئارادابوو، بۆ سبەی شەو یەکێک لەزیندانیەکان بەنهێنی گوێی لەرادیۆی دەنگی ئەمریکا گرتبوو هات پێی گوتین...(کوڕینە رادیۆی ئەمریکا دەڵێت « حکومەتی عێراقی بڕیارێکی لێبوردنی بۆ زیندانیەکان دەرکردووە،بەڵام زیندانیە سیاسیەکان ناگرێتەوە) دووبارە خەمۆکی و بێ تاقەتی لێی داینەوە تاوەکو شەوی ٢١-١٩٩٥/٧/٢٢ دووبارە سەعات (٨)ی ئێوارە،بڕیارێکی دیکەی لێبووردنی بۆ زیندانیەکان دەرکردەوەو، ئەمجارە گوتی لێبوردنی گشتی بۆ هەموو زیندانیە سیاسیەکان تەنانەت هەندێ کێشەی جینائیشی گرتەوە، ئیدی لەوەیاندا دڵنیابووین کە ئێمە ئازاد دەکرێین، ئەگەرچی یەکێک بوو لەشەوە هەرە گەرمەکانی مانگی تەموزی بەغدا، بەڵام کەس هەستی بەگەرما نەدەکرد، تەنانەت دەرگای هۆڵەکانیشیان لێ دانەخستین چونکە دەیانزانی بەم ئاخرو ئۆخری ڕۆژانەی بەندیخانە کەس وەزع لەخۆی تێک نادا، وەک زانیاریمان پێگەیشت ئەو ڕۆژانە نزیکەی (٣٢) هەزار زیندانی لەنێو بەندیخانەکانی عێراقدا هەبوو، خەڵکی کوردستان زیاتر دڵیان بەو بڕیارە خۆشبوو چونکە ناوچەی ئێمە لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمی عێراقدا نەما بوو، واتە ئازاد بوونی ئێمە دوو ئازادی بوو،لەلایەک لەدیوارە بەرزو ژوورە تاریکەکانی بەندیخانەو لەلایەکی دیکەوە لەژێر دەسەڵاتی ئەو ڕژێمە کە (١٠) ساڵە لەم بەندیخانەیەدا ئازاری دەداین رزگارمان دەبێ.

ئەو شەوە تابەیانی لەبیرکردنەوە دابووم بیرم لە هەڤاڵانی ئیعدام کراوم دەکردەوە، دەمگوت هەر کاتێ بڕۆمەوە بەر لەهەموو شت دەچمە سەر دوا ئارامگەیان و سڵاویان لێ دەکەم، دەمگوت خوشک و براکانم تێرتێر

لەئامێز دەگرم، یەکەیەکەی شەقامەکانی سلێمانی ماچ دەکەم،سەرچنار لەباوەش دەگرم، دەستی کەناسی سەرجادەکان ماچ دەکەم، ناوچەوانی تەڕو نوورانی پیاوە بەتەمەکانی سەر بەردە نوێژەکەی دوکانەکان ماچ دەکەم سەرجادەکان ماچ دەکەم تاوێ لەتەک سەرخۆشە سەرگردانەکانی لای ئاوی باخەکەی سەرچنار دادەنیشم، داروبەرد لەئامێز دەگرم دەچمە ماڵی نزار، سەردانی ماڵی سالار دەکەم هەڤاڵانم دەبینمەوە.. ئای چەند خۆشە ئازادی ئای خەمەکانی ئەبو غرێب چۆن سێ بەسێ تەڵاقتان دەدەم بەم شێوەیە تاوەکو چەند شەوێکیش لەم خەیاڵە خۆشانەدا دەژیام.

## بەرەو ئازادی

شەوی ٢٦ی تەموزی ساڵی ١٩٩٥ دەرگای هۆڵ کرایەوەو بەڕێوەبەری گشتی بەندیخانەو پاسەوانەکانی خۆیان کرد بەژووردا، پێی گوتین (دۆسیەکانی جەماعەتی باکور داواکراوە و ئێمەش ناردوومانە) هێندەتر دڵخۆش بووین،چونکە جەماعەتی باکور مەبەستی ئەوانەبوو کە بە پێی یاسای سزاکانی عێراق بەماددەی (١٥٧ تخریب شمال) گیراون، زیاتر لەبەر ئەوەش بەختەوەربووین کە ئەو قسانە قسەی بەڕێوەبەری گشتی بەندیخانەبوو، هەمان شەو دەوروبەری سەعات (١)ی دوای نیوەشەو پاسەوانێک هاتو گوتی: ( مژدەم بدەنێ ئەوانەی بەماددەی ١٥٧ حوکم دراون دۆسیەکانیان ئیمزا کراوەو ئازاد دەکرێن، تەنیا ئەوانەی بەتۆمەتی کوشتنی سیاسی حوکم دراون ئازاد ناکرێن) ئیدی کۆمەڵێ پارەو جگەرەو دیاریمان وەک مزگێنی دابەپاسەوانەکە، لەو کۆمەڵەدا تەنیا ٥ کەسی نەگرتەوە کە خەڵکی سلێمانی بوون و تاوانی کوشتنی سیاسیان درابووە پاڵ، وێڕای دڵخۆشی خۆم سۆزم بۆ ئەو پێنج کەسە دەجولا چونکە دەمزانی چەند ناخۆشە کە برادەرەکانت ئازاد بکرێن و بەجێت بێڵن، خودی خۆم پتر لەجارێک ئەو خەمەم چەشتبوو!

ئەم خۆشی وچاوەڕوانیەمان بەردەوام بوو، تاوەکو شەوی ٤-١٩٩٥/٨/٥ کۆمەڵێ پاسەوان و ئەفسەرانی بەندیخانەو بەڕێوەبەر هاتنە ژوورەوە لیستێکیان پێ بوو گوتیان: (ناوی هەرکەسێکمان خوێندەوە خۆی ئامادە بکات بەیانی ئازاد دەکرێت) ئیدی دەستیان کرد بە خوێندنەوەی

ناوەکان، دڵم بە بەریەوە نەمابوو ئەوە ئەو ساتە بوو، کە پتر لە ١٠ ساڵە چاوەڕوانی دەکەم... یەکەم ناو عەزیز لازاری خوێندەوە، ئەو پتر لە (١٣) ساڵ بوو لەبەندیخانەدا بوو،دووەم ناو یەکێکی ترو سێیەمین ناو گوتی:( شێرزاد فەرمان یاقۆ) نەم دەزانی چی بکەم چۆن گوزارشت لە و خۆشیە بکەم، ئازادی ئەی هاوار ئازادی هیچم پێ نەکرا تەنیا ئەوە نەبێت لەجێی خۆمەوە پڕ بە هۆڵەکە هاوارم کرد: (یەهوو) بەڕێوەبەر گوێی لەدەنگم بوو بە پێکەنینەوە تەماشایەکی کردم وبانگی کردمە بەردەم خۆی لێی پرسیم:

* خەڵکی کوێی؟
- سلێمانی
* چەند ساڵ حوکم بوویت؟
- ١٥ ساڵ
* ئەدی چەند ساڵت تەواو کردووە؟
- ئەمشەو (١٠) ساڵ و (٧) ڕۆژە من لەبەندیخانە دام
* لەسەرچی گیراوی جەماعەتی کێی؟!
- پارتی
* یەعنی جەماعەتی کاک مسعود بارزانی؟
- بەڵێ
* زۆرباشە پیرۆزە، بەڵام جارێکی تر خۆت لەکاری وا هەڵنە قورتێنێ!

ئەو شەوە ناوەکان تەواو خۆشیەکی وەهاکەوتە زیندانیەکانەوە هیچ دوودڵی وترس ودڵە ڕاوکێی تێدانەما، ئەوشەوە یادی هەرلەبەرەبەیانی ڕۆژی ٢٨/٧/١٩٨٥م کردەوە تاوەکو ڕۆژی ٤/٨/١٩٩٥ هەموو ڕۆژەکانم وەک فیلمێکی سینەمایی دەهاتە بەرچاو تەواری چوارباخ،دائیرەی ئەمنی سلێمانی، ئوتۆمبیلە بۆکسەکانی گرتوخانەی فزەیلیە، بوشرا کچە جوانەکە، ئەبو غریب.. بادوش ، ئەبو غریب، گوللەبارانی کردنی تالیب عۆدە!، ئیدی هەر هەموو ڕووداوەکان لەبەرچاوم بوون. بۆ سبەی ڕۆژی ٥/٨/١٩٩٥ بەیانی زوو لەبری سەرژمێری کردن ودەسپێکی ڕۆژێکی نوێی بەندیخانە، ئەمجارەیان ناویان خوێندینەوە بۆ گۆڕەپان وبەجانتاو کەل وپەلەوە ئامادەباش بووین بۆ ئازاد بوون،تاوەکو سەعات (١١)ی پێش نیوەڕۆ دۆسیەو مامەڵەیان بۆ ڕێکخستین، کامێرای

تەلەفزیۆن لەبەر دەرگای سەرەکی ئامادەکرابوو، ناوی هەر زیندانیەکیان بۆ ئازادبوون بخوێندایەتەوە،دەبوایە بەڕاکردن بەرەو دەرگای دەرەوە رابکات و هاوار بکات (بالروح بالدم.. نفدیک یا صدام) بەگیان و بەخوێن قوربانیت بۆ دەدەین سەدام.. ئای لەو رستە سواوە، ئای لەم دەستەواژە بێ کەڵکە، لەدڵی خۆمدا دەمگوت ئینجا ئەگەر من ئەم دروشمەم بگوتایە بۆچی (١٠)ساڵ لەزیندانیدا دەمامەوە؟! سەیرە بەنیازن پاش ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیە، پاش تەمەنێک ژیانی بەندیخانە تازە بەتازە هاوار بکەم قوربانی بۆ سەدام دەدەم! من و عەزیز لازار لەسەر ئەوە رێکەوتین کە ئەو قسەیە نەکەین،ئەگەر دووبارە بشمانبەنەوە ناو بەندیخانە، بەڵام یەک ترسم لەعەزیز هەبوو ئەگەر نەیڵێین وپاسەوانەکان ئازاری بدەن، عەزیز دەستیان لێ بوەشێنێ چونکە ئەوە ١٣ ساڵ بوو زیندانی بوو زۆر سەرگەرم بوو بەرگەی ئازاری تری نەدەگرت: بۆیە پێم گوت: ( عەزیز گیان ئاگاداری خۆت بە کە ناوی خوێندیتەوە کەمێک خۆت دوابخە تا ناوی منیش دێت ئینجا پێکەوە دەردەچین و هیچیش نالێین) عەزیز وتی( زۆرباشە) ئەوەبوو ناوی هەردووکمان هات و بێ دەنگ بە بەردەم کامێرای تەلەفزیۆنەکەدا بەرەو دەرگای دەرەوە ڕامان کرد،، یەک دوو پاسەوان لەملاولامانەوە چەند جارێک بەهەڕەشەوە دەیانگوت:( اهتف ولک.. اهتف ولک..اهتف ولک)، بەڵام ئێمە سووربووین لەسەر بڕیاری خۆمان وهیچمان نەگوت، کەچووینە دەرەوە ئەو هەوا گەرمەی دەشتی ئەبو غرێبمان لێ بوو بوو بە هەوایەکی پاکی قەراغ تاڤگەیەکی سازگار، ئای کە نەفەسی ئازادی خۆشبوو، لەبەردەرگا هەموو کەسوکارو خانەوادەی زیندانیەکانی تر چاوەڕوانی کوڕەکانیان دەکرد، هەموو پرسیاریان لێ دەکردین ئێمەش دەمانگوت خەمتان نەبێت هەموویان ئازاد دەبن، لەنێو جەرگەی ئەو قەرەباڵغیەدا، ئامۆزایەکم ملی راکێشام و باوەشی پێدا کردم وبەرەو ئۆتۆمبیلێکی تەکسی بردمی، منیش قۆڵی عەزیز لازارم بەدوای خۆمدا راکێشاو پێکەوە هەرسێکمان لەگەڵ ئامۆزاکەمدا سواری تەکسیەکە بووین، لەناو ئوتومبیلەکەدا بەدڵێکی خۆش و ورەیەکی بەرزەوە دام بەشانی شوفێری تەکسیەکەداو گوتم: ( بڕۆ.. پێی لێ نێ بەپەلە، هەتا پەشیمان نەبوونەتوە!).



١٩٧١ سلێـــمـــانی- چوارباخ
شێـــرزاد فـــەرمـــان یاقـــز
لە تەمـــەنی سێ ســـاڵیـــدا



کـــڵێـــســـەی پاکـــیـــزە مـــریەم
سلێـــمـــانی - ســـاڵی ١٩٧٨
شێـــرزاد لەکـاتی عیـماد کـردندا



شێرزاد فەرمان یاقو ١٩٨١/٦/٢ سلێمانی- سەرچنار



شێرزاد فەرمان- نووسەری ئەم کتێبە - هەولێر - بەهاری ٢٠٠١



شـــەهیـــــد نزار نوری
۱۹۸٦/۱۲/۲۹ لەبەندیخـــانەی
ئەبو غـــریب لە ســـێـــدارەدرا



شەهید سالار محەمەد عەبدولکەریم
گـــوندی چنارەی شـــێـخ لەتیف
۱۹۸٥



شەهید سالح محەمەد برای شەهید سالار
١٩٨٥ لەلایەن رژێمی عێراقەوە لە سێدارە درا





شەهید حەسەن نەجار



زستانی ١٩٩٠
بەندیخانەی بادوش
شیرزاد فەرمان-
شیروان عەقاری
(شەلەل لێ دابوو)



زستانی ١٩٩٠
بەندیخانەی بادوش
شیرزاد فەرمان- ئەمین
ئیسماعیل



شێرزاد فەرمان
بەندیخانەی بادوش -
موسڵ
١٩٩٠/١٢/١٣



زستانی ١٩٩٠
بەندیخانەی بادوش
ڕاوەستاوان لە
ڕاستەوە:
شێرزاد فەرمان-
بوترس نینو
دانیشتوان:
عیماد گلیانە - فوئاد
هورمز- ئەمیر



١٢/١٢/ ١٩٩٠ بەندیخانەی بادوش
لە ڕاستەوە: عەدنان- شێرزاد فەرمان- مامۆستا نەسروڵلا



٢٠/١٢/ ١٩٩٠ بەندیخانەی بادوش
قانع چۆمانی- شێرزاد فەرمان



١٨/١٢/١٩٩٠
پەندیخانەی بادوش
شێرزاد فەرمان-
فرهاد هورمز



١٨/١٢/١٩٩٠
پەندیخانەی بادوش
راوەستاوان لە
راستەوە:
والی مەحمود - ئەمین
ئیسماعیل- شێرزاد
فەرمان
دانیشتوان:
عزەت - خالید



۱۹۹۰/۱۲/۱۸
بەندیخانەی بادوش
راوەستاوان لە
راستەوە:
هاوڕێ عوسمان-
تاریق غەفوور
دانیشتوان: هۆشیار
سەعید- شێرزاد
فەرمان



۱۹۹۰/۱۲/۱۸
بەندیخانەی بادوش
تاریق غەفوور-
شێرزاد فەرمان



۱۹۹۰/۱۲/۲۹
بەندیخانەی بادوش
راوەستاوان لە
راستەوە:
جەزا نوری- سالاری
حاجی عوسمان
دانیشتوان:
تاریق غەفوور-
شێرزاد فەرمان




۱۹۹۰/۱۲/۲۰
بەندیخانەی بادوش
شێرزاد فەرمان



ئاداری ١٩٩١ بەندیخانەی بادوش
لە راستەوە:
شێرزاد فەرمان- بایز- تاریق غەفور.





١٩٩١/٦/٥ بەندیخانەی بادوش
شێرزاد فەرمان



٨/٦/١٩٩١ بەندیخانەی بادوش
لە راستەوە: تاریق غەفوور- بایز- شێرزاد فەرمان - هاوڕێ عوسمان



شێرزاد و قەیسی برای - چوار مانگ دوای ئازاد بوونی
سلێمانی- باخی گشتی



زاخـــــز
ســـــالی ١٩٩٦
لە راســـتــەوە:
شەهید عەزیز لازار-
عــەبدولــلــەحــەد
فەرەنسیس- شێرزاد
فـــــەرمـــــان
دوای ئــازاد بــوون



هاوینی ١٩٩٦دهۆک
شێرزاد زادە- شێرزاد
فـــــەرمـــــان
دوای ئــازاد بــوون




# 3660
# The Memory of a Kurdistanian Youth In Iraqi Prisons

Barham Ali

Kurdistan 2001